# کاروان

گۆڤارێکی رۆشنبیری‌ی مانگانه‌یه
ئه‌مینداریتی‌ی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوان
به‌زمانی کوردی‌و عه‌ره‌بی ده‌ری ده‌کا

ژماره 7 نیسانی 1983



لەم ژمارەیەدا



ئه‌درەس : هه‌ولێر ـ ئه‌مینداریتی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوان ـ گوڤاری (کاروان) ـ ت : 20882

لەژێر ڕۆشنایی وتەکەی سەرۆکی فەرماندەدا دەربارەی ڕۆشنبیری کوردی :

# باسکردن لەکوردێتیمان لەچوارچێوەی

هەر کات سەرۆکی فەرماندە لە هەر کۆنگرەو کۆڕو بۆنەیێکدا لە تەك کەرتە جیا جیاکانی ناو کۆمەڵگەی عیراقیدا بدوێ ، بە دڵ گوێی لێ دەگرین و لە دەروونـدا تێی دەگەین و هەمیشە ڕێنماییێکی روون و ئاشکرامان لێ چنگ دەکەوێ لە مەڕ ئەو کێشە ئالۆزانەی لای هێندێك بە ئاسانی لێك نادرێتەوە یا بە ئاسانی نابیزێت . چونکە زۆربەمان لە ژێر هێزی کاریگەریەتی رابووردوودا لە گەڵ هەڵوێست و چارەسەرکردنی کێشەکاندا لە بەر ڕۆشنایی شـۆڕشی 17ی تەمـموزی پیرۆز وەك پێـویست ڕانەهاتووین .

وتەکەی سەرۆك لەو گفتوگۆیەی دەزگـای ڕۆشنبیری و بـڵاوکردنـەوەی کوردیـدا نموونـەیێکی باڵا نمـاو وێنـەیێکی زیندووی سەرچاوە دەوڵەمەندو بە پێزەکانی ئەو پەندانەیە کە پێـویستە تێیـان بگەین لەوانـە دەست نیشان کـردنی جۆری پەیوەندی «عضوي» تایبەت و گشتی یان پەیوەستداری بەشێك لە گەڵ گشت لە بواری بـەخشندەی بیـری و ئەدەبی چـونکە ئەدیبی عەرەب و ئەدیبی کورد بـەر لە دەست نیشان کـردنی نەتەوەییتیـان هەر دوو لایـان سەر بـە نیشتمانی عیـراقن . بەرزیەتی عیراق ، مێژوی عیـراق ، داهاتی عیـراق و هەمـوو خواستەکانی عیراق لە چـەسپانـدنی خۆی و دەست نیشـان کـردنی شەخسیـەتی و دیاری کـردنی شوێن خـۆی لە نێوان گـەلانی جیهـانـدا کـە تێـدەکۆشن لە پێنـاوی پێشکـەوتنی شارستانی و فیکری و هەوڵدان بۆ ئامادە کردنی بارو دۆخێکی گونجاو بە مەبەستی بەدی هێنـانی ئەو مـەبەستـانە ، بـۆیە پێویستە هیوای سەرەکیی هەموو عیراقیەك بێت بە مەبەستی داهێنانی نوێ و لە بوا ری فیکری و ئەدەبی و هونەری و تەنانەت لە ژیانی ڕۆژانەشیاندا . گەر ئاووڕێـك لەم کاروانـە فراوانـە بدەینەوە کە مەبەستیەتی عیـراق لە رووی شارستنیـەتەوە بەرێتـە ریزی پێشەوەی ژیانی هـاوچەرخ ، ئـا بەمـە ئاستی بەرزی هۆشیارییان دەردەخەن و جیا دەکرێنەوە لەو هەڵوێستە هەڕەمەکیانەی لە خۆوە دێنە کایەوەو لێرە یا لەوێ هەڵچوون و دا چـووندان . سـەرۆکی فەرمـاندە نـەخشەی سێ بـازنەی سـەرەکی دەست نیشان کـرد لەمەڕ بـەخشندەیی و هـەوڵ و تەقەللاو کاری داهێنەرانەدا ، بازنگەی یەکەمی ناونا ڕەشماڵی عیراقی .. ئای کە چ ووشەیێکی جوان و دەربڕینێکی پیرۆزە بە جۆرێك هەموو هێڵە سەرەکیەکان بەیەك دەگەیێنێ و عیراقیەکان لە وێنەی خیزانێکدا کۆ دەکاتەوەو پەیوەندی نێوانیان توندو تۆڵ دەکا . هەر لەبن ئەو ڕەشماڵەوەیە تێکڕا داهێنانە تازەکان لە

# عیراقێتیماندا لاوازمان ناکا

بواری فیکرا هونەرو تەقەلای بەجیٚدا دێتە بەرهەم ، بە هەموو جۆرو شێوەییٚکی جیاوازیانەوە . بە مەبەستی بەرزکردنەوەی پلەی نیشتمان لە رووی روشنبیری و ئابووری و کۆمەلایەتی و رامیارییەوە بە شێوەییٚکی چڕو پڕ . هەر ئا ئەم بازنگە سەرەکیەیە بوونی عیراقی بە شێوەییٚکی هەمیشەیی و هۆشیاریەوە تیا بەدی دەکری و کێشانەی بنیاتنان و هەلوێستی عیراق و گیانە پیرۆزەکەی بە شێوەییٚکی ئاشکرا دەکرێت و هێزی بیرو ویژدانی تیا سەقانگیر دەکرێت . هەروەها زەلیل بوون و فەوتاندن و لاوازی بە کێشانەی دوورکەوتنەوەی
گیانیان لە یەك دەکێشرێت . سەبارەت بەم بازنگەیە سەرۆکی فەرماندە بە بیرتیژیەوە نەخشەی دوو بازنگەکەی تری کێشا کە بریتیە لە بازنگەی تایبەتیەتی عیراقی و مرۆڤایەتیەکی فراوان . سەرۆکی فەرماندە ئەوەی نیشاندا :

**[ .. ئەگەر وامان بینی چارەسەری کاروو باری دەکات و مامەلە لە گەل ژیاندا بەبێ هەست کردن بە هیلاکی دەکا .. بە بێ هەست کردن بە خاوو خلیچکی .. بە بێ ئەوەی ئەم خاسیەتانە لە هەلس و کەوتی دەوری نیشتمانی و نەتەوەیی و مرۆڤلیەتی دووربخاتەوە .. چۆن دەبێ عیراقی لەم خاسیەتانە وا بکەن نەیەلێ مامەلەی لە گەل ژیان و لە گەل یەکێتی گەل لە چوار چێوەی راستەقینەیدا بکات .]**

بازنگە تایبەتیەکان جێی بایەخ پێدانی سەرۆك صدام بوو . چونکە زیاتر لە پەیوەندی بە «نامەی کارکردنەوەکەوە = ورقة العمل» بوو کە بە رێزی ئامادەی کۆبوونەوەی گفتوگۆکە بو کە رێبازی بازنگەکەی روون کردەوەو جۆری مامەلە کردن و سنووری دەست نیشان کردو گرێی باسەکەی کردەوەو بنچینەی چالاکیی عیراقیەکانی لەمەڕ بوارەکانی ژیاندا دەست نیشان کردو مەرجی هاوکێشەیەکی رێکی لە نێوان بازنگەکانا دەست نیشان کردو لەمەڕ هاوولاتیانی کوردو عەرەبدا هەموو تەم و مژێکی رەواندەوە سەبارەت بە کاربەدەستان و جۆری مامەلەکردن لەگەلیاندا . یەکەم : هەموو کۆسپ و تەگەرەییٚکی لەبەر دەم تایبەتیەتی کوردیدا نەهێشت بەو مەبەستەی سەربەستیەکی فراوان و بەمەرجێ هەستی کوردانەی لەتەك هاوولاتیەتی عیراقیدا شەتەك بدات و لە رووی دەربڕینی مێژوو ئەدەب و هونەرەوە بە جۆرێك کەلتوور بژێنێتەوەو لەو چوار چێوەیەدا بەرەو پێشی بەرێت . بەوەش ئاسۆییٚکی بەربلاوی لەبەر دەم ووشەی کوردیدا کردەوە کە لە باشترین کاتی رابووردوودا ئەدیبی کورد ئەم دەرفەتەی بۆ نەرەخساوە . سەرۆکی فەرماندە ئەدیبی کوردی لەبەر دەم سەربەستیەکی فراوان و بەرپرسیاریەکی گەورە لە دەربڕینی بیرورای لە بواری

فیکری‌و ئەدەبی‌و هونەری داناوە چونکە مرۆڤی خەملّ‌و هاوسانی لە نیوان بەرپرسیاری‌و سەربەستیدا دادەنێ . لەبەر ئەوە کاتێ ئەدیبی کورد بەر بۆ قەلەمەکەی لە جیهانی ئەدەب‌و شیعرو زمانەوانی‌و مێژوودا بەرەللا دەکات بەو نیازەی مشتێکی تازە بخاتە سەر کەلتووری کوردی بەجۆرێك زیان بە عیراقیەتیەکەی نەگەیێنێ‌و لەو ئەرکانە دووری نەخاتەوە کە بەرامبەر نیشتمان‌و هاولاتیان لە ئەستۆیەتی . یان بە شێوەیێکی‌تر چالاکیەکەی نابێتە هۆی دروست کردنی کەلێنێکی بیری‌و شارستانیەنی لە عیراقدا .

دووەمم : سەبارەت بەو رێبازەی پەیوەندی بە رێبازی یەکەمەوە هەیە سەرۆکی فەرماندەو تێکۆشەر بەم وتەیە باسەکەی کردەوە :

**[جا دەبێ ئەم حاڵەتە وا لێ بکەین باوبێت هەتا لە راگەیاندنی ئاراستەکراو بۆ گەلی کوردمان تێردەبێ ، باوی بکەوین‌و وابکەین رۆژنامەکە لە سەرەتاوە تا دوایی پڕبێت لە باس کردن دەربارەی کوردو مێژووی کوردو ئەدەبی کوردو رۆشنبیری کوردو هەرگیز ، هەر چیمان بۆیەت بلاوی دەکەینەوە دوای ئەوە گەلی کوردمان تێر دەبی‌و رۆشنبیری کوردی‌و هونەری کوردی .. هێند دەبینی .. هەمووی باسی دەکرێ حاڵەتێکی بریقەدا نامێنێ بۆ مەبەستی بەرهەلست کاران بەڵکو حاڵەتەکە وای لێ دێت ئەو وەختە کوردێك لە سلیمانیەوە پێت دەڵێ «بەس»باسی ئەدەبمان بۆبکە لە کوبا ، ئەدەب لە جزائیر ، ئەدەب لە ئەندەلوس لە قوناغی ئەندەلوسیا با سەرنجی حاڵەتەکانی ژیان بدەین بە هەموو وێنە گشتی‌یەکانیەوە تەنیا لە گۆشەیەکدا گیرمان مەکە ، بەلام ئەگەر وا مامەلە لە گەل ئەدەبی کوردی‌و رۆشنبیری کوردیا بکەن ، بە ئەدەب‌و هونەرەوە ، هونەر ، رەسم ، نەحت ، مۆسیقاو گۆرانی لە ئێستەوە مامەلەی وا لە گەلا بکەن لە چوارچیوەیەکی هاوسەنگدا حاڵەتەکە هەروا ئەمینێتەوە وەك ئەوەی خەلکی تر هەبن باسی زۆرتریان بوێت ، چاکە ، باس کردنەکە باوبکەن گۆڤارو رۆژنامەکان زیاتر پڕ بکەنەوە بە نوسین لەسەر ئەدەبی کوردی رۆشنبیری کوردی هونەرو شیعری کوردی هەتا گەلی کوردمان تێر دەبێ ، دوای ئەوەی تێر دەبێ بڕۆن بەرەو هاوسەنگی وە باسی عیراقیەتتان بکەن بە هەموو شتەکانیەوە چونکە دەولەمەند ترو لایەق ترە بۆ کوردی عیراقی لەوەی تەنیا لە گۆشەیەکدا گیری بکەن چونکە ئەگەر پێمان ووت مێژوەکەت تەنیا کوردی‌یە وەك ئەوە وایە جنێو بە کوردی عیراقی بدەی چونکە مێژووەکەی بۆ هەزاران ساڵی شارستانیەت دەگەرێتەوە کە شارستانیەتی عیراقەوە بۆ تەقەللایەکی نمونەیی لە بیناکردنی شارستانیەتی ئیسلامی عەرەبی‌دا ئەگەر تەنیا لە گۆشەیەکدا گیرمان کرد ئەوا لە دەوری مێژوویی مەزنی لە دروست کردنی ئەو شارستانیەتە بێبەش دەکەین] .**

سەرۆك صدام تێبینی کرد لە گەڵ ئەوەی کە شۆڕشی 17ی تەمموز مەودایێکی فراوانی لەبەر دەم چاپەمەنی‌و بلاوکردنەوەی کوردیدا کردوتەوە وەك کۆڕی زانیاری کوردی‌و دوزگای رۆشنبیری‌و بلاوکرانەوەی کوردی‌و ئەمینداریەتی گشتی رۆشنبیری‌و لاوان لە کوردستان لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی ، وە هەر یەك لەم دەزگایانە لە سالێکدا پالپشتی مادی دەیان کتێبی کوردی دەکەن وە لە گەڵ ئەوەی ئەدەبی کوردی گەشەی کردووەو ئەدیبانی کورد کۆڕو کۆنگرە سەبارەت بە ئەدەبی کوردی‌و لێکۆلینەوی شیعری کوردی‌و شی کردنەوەی بەرهەمەکانیان‌و لە بواری چیرۆکی کوردی‌و هەلسەنگاندنیان ئەمەو جگە لەوەی لە تەلەفزیون چاوپێکەوتن‌و شانوگەری کوردی پێشکەش دەکرێت . سەرەڕای ئەوە سەرۆك صدام هەستی کرد لە پەناوە هێندێ دیاردە هەن جۆری مامەلەکردنیان ئەدەبی کوردی پێ تەنگەتاوە لە ئەنجامی بەجێ هێنانی بنچینەکانی بلاوکردنەوە . ئەدیبی کوردی بە باشی هەست بە بەرفراوانی‌و گەشی هیوای ناکات گەلێ جار ناتوانێ باس لە تایبەتیەتی خۆی بکات بەو جۆرەی کە پێویستە ئەمە دەبێتە هۆی دابڕین لە رێبازی گشتی کاروانی ئەدەب‌و گەشە کردنی لە سایەی شۆڕشەوە لە عیراقدا بەو مەبەستەی ئەو هەستە نەتەنێتەوە ، سەرۆك صدام چارێکی نموونەیی‌و کاریگەری بۆ

داناو بەوەی سەربەستیەکی بەر بـڵاوی لەبەر دەم ئـەدیبو پێنـوسی کورد دانا .. ئـەدەبی کوردیو ووشـەی کوردی لەو کۆتو زنجیرە باوانە رزگار کرد بـەو نیازەی ووشـەی کوردی هـەنگـاو بـەرەوو پێش بنێتو لە خلتـەو پـوخڵەواتی رەش قوتاربێتو لە دنیای رۆشندا بژیو تیشکی خۆری لێ بـدات .

ئەدیبی کورد خۆی تەرخان بکات بۆ دەربڕینی هەستو بیری لە ناخی ویژدانیەوە سەبارەت بە تـایبەتیـەتی خۆی . وە پـاش ئەوەی هەستو بیری ناخی پـەنگ خـواردووی دەر دەبڕێت ئەوسا تێـڕوانینی لە دڵێکی فراوان دەبێتو ئـاسۆی بیـریشی فراوان دەبێتو ئا لەویوە بایـەخدانی خـۆی روو لە دنیاییکی گـەورە دەکاتو هـەنگاو بـەرەو چارەسـەرکـردنی کێشـەو ئازارەکانی نیشتمانی «عیراقی» ئەنێتو بە گیـانو هیمەتێکی تازەو هۆشێکی کـراوە هاوبـەشی پەرە پێـدانو گەشـە پێدان دەکاتو ویژدانی لە ریبازی کارکردن لە پێناوی بڵندی نیشتماندا دەتوێتەوە . کەواتە نەهێشتنی کەندو کۆسپ لەبەر دەم ئەدیبی کوردیدا بۆ ئەوەی سەبارەت تایبەتی خۆی لەمەودای ئەدەبو هونەردا دەربڕێ سەرەتایەکە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی لەریێ «خۆراکەوە نەك دەرمان» . پێویستە لە سەر ئەدیبی کورد قوناغەکانی بـەردەمی بە زوویی کـورت بکاتـەوەو بکاتـە ئەو حاڵەتی سروشتی هاوولاتیەکی بێ گەیوی تواوە لە کۆمەڵگادا لەسـەر بنچینەییکی راستو هـاوکێشەییکی بـەجێ لە نێوان تایبەتیەتی لە عیراقداو لە گەڵ تەواوی عیراقدا . بە جۆرێکی یەکگرتو وتـواوە بۆ بـەجێ هێنانی ئـەو ئەرکـە گرانـانەی لەم چەرخەدا لە ئەستۆیەتی ، بۆ بەرنگار بوونەوەی هەموو تەنگو چەڵەمەییـك کە رێ لە سـروشتی ژیانی هـاوچەرخیـەتیو پێشکەوتنو گۆران دەگرێت . ئەم توانەوەیە ئەوە ناگەیەنێ کە هێندێك بە بیریـانا دێت هـەر کات لەم رووەوە بـاس بکرێت .

لێرەدا توانەوەی نەتـەوەیی رەت ئەکـرێتەوەو مـەودای باس کردن نیە . چونکە دوان لەو جۆرە توانەوەیە دروست نیە . وە مەبەست لەم توانەوەیە یەکێتی ئیرادەو هۆشو بیرە بەرامبەر کێشەکانی نیشتمـانو یەك جـۆر هەڵوێستـەو پەیـوەندی بـە توانەوەی سیما تایبەتیەکانەوە نییە . سەرۆکی فەرماندە هەر کێشەو هەڵوێستێك لە تەنیا یەك ووشەدا دەر دەبڕێ ئەو جۆرە دەربڕینانە بۆ چارەسەرکردنی گەلێ کێشەو هەڵوێستی جۆراو جۆرە و یەکێ لەو ووشە فراوان و قوڵانە ووشەی «التعویم»ە ئەو هەستی بەموعاناتی نووسەری کوردی کردووە لە گەلێ تەنگو چەڵەمەدا بـەرامبەر هێنـدی فەرمـانو پەیـرەوی کردنیا . دووریش نیـە ئەم کـۆسپو تەگـەرانە کـردەوەی هێنـدێ لە کاربەدەستان بێت لە کاتی راپەڕاندنی ئەم فەرمانانەدا ، ئەو فەرمانانەی کەوا لە نووسەر دەکات کە بیروڕای خـۆی وەکو پێویستە دەرنەبڕێت . بۆیە ئەم بیروڕایانە لە مێشكو دەروونیدا بەند دەکرێتو لە ناخیدا دەمێنێتەوە سەرۆکی فەرماندە داوای کرد ئەم هەستو بیروڕایانە دەربڕێت و بدرکێنرێ و بە ئاشکرا بووترێت تا دەگاتە پلەی تێر بوون . ئا بەم جۆرەو لە ئەنجامدا ، بـازنگەی کـارکردن لەبـەرز فراوان دەبێو تێکـەڵ بـە بـازنـە سەرەکیەکە دەبێت کە «عیراقیەتە» .

سێیەم : کاتێ سەرۆکی فەرماندە ووتی :

**[لە هەموو بارێکدا داوا لە براکانم دەکەم لەم کۆڕەدا کە پێـوەندی‌یـان بە سـەرپەرشتیکـردنی رۆشنبیـری کوردی‌یەوە هەیە حەساسیەتیان نەبێ بەرامبەر بە رۆشنبیری‌ی کوردیو داوا لە وانی تـریش دەکەم زۆر نـوقمی تـایبـەتی‌یـەکـانی کـوردی نـەبن بـە جۆرێکی‌وا ئالای بـەرزترو گەورەتریان لە بیر بچێ کـە ئالای عیـراقی‌یەتـەو دەوریانـە لە بنیاتنـانی شارستانی مەزندا]** .

بەڵێ ، گەلێ جار وا رووی‌داوە هێندێ لە کاربەدەستان حەساسیەتیان بەرامبەر بە رۆشنبیری کوردی دەنواندو هێندێ لە لقەکانی ئەم رۆشنبیری‌یـەیان دەشـاردەوەو قەدەغـەیان دەکرد .

ریژێمە گۆڕ بە گۆڕەکانی پێشوو نەك هەر ریگایان بەکەس نەدەدا کە لە تایبەتیەکانی کوردەوە بدوێو بەس بگرە هەوڵو ئەقەلاشیان دەدا بۆ لە ناوبردنی ئەم تایبـەتیەتـە . هێندی جـاریش قـەدەغـە کـردنی رۆشنبیـری کـوردی لە لایـەن کاربەدەستاندا لە ئەنجامی بە هەڵە تێگەیشتنی ووشەیێك ئەبوو کە ماناکانیسـان بە شێوەیەکی خراپ لێك دەدایەوە یا دەست

نیشانی کردنی ووتەییکی ئەدەبی راست ، کـە نووســەرێکی «زیندوو یا مردوو» گوتوویەتی و ئـەو نووســەرە ناســراوە بە هەڵوێستێکی سیاسی ی دیاری کراو لە قۆناغێك لە قـۆناغـەکانی ژیانیدا ، بێ ئەوەی جیاوازیی نێوان هەڵوێستێکی سیـاسی ی دیاری کراو و ئەدەب رەچاو بکرێت . بەپێچەوانەی فەرمایشتی پێغەمبەر (د.خ) کە فەرموویەتی :

«حیکمەت ئامانجی موسـولمانـە ، لە کوێ بیـدۆزێتەوە وەری دەگرێت»

یا فەرموودەی گەورەی ئیماندارەکان :

«بڕوانە ئەو شتەی کە گۆتراوەو نەڕوانە ئەو کەسەی کە گوتوویەتی»

سەرۆکی فەرماندە لە ووتارەکەیـدا ، بۆ لابـردنی ئەم جۆرە مامەلەیە لە گەڵ ووشەی کوردیدا مەبەستی ئامۆژگاری کـردنی لێپرسـراوەکانـە کورد بێ یـا عەرەب بـەرامبەر بـە رۆشنبیریی کوردی کە نابێ ئەم جۆرە هـەڵوێستانـە پەیـرەو بکرێت ، چونکە هێندێ لە لێپرسراوان دوور نییـە زیان بـە ووشەی کوردی بگەیەنن .

لێرەدا پێویستـە بە ووردی سـەرنج بـدەینە تـایبەتیـە کوردیەکان کە سەرۆکی فەرماندە داوای رێ خۆشکردنی بـۆ کردووە بە مەبەستی لابردنی هەمـوو کۆسپ و تـەگەرییـەك لە پێشیدا ، ئەمەش بە پلەی یەکەم وا رادەگەیێنێ کە نووسەری کورد روو بە رووی هەست بە لێپـرسینەوەکـراوە بە هـەموو مانایەکیەوە . نـووسەریش دەمـاری ناسکی گـەلەکەیێتی لە خواست و ئاوات و ئارەزووەکانیدا . جا پێویستە لەسەر نووسەر کە بەم فەرمانە بەرزە هەڵستێ و بچێتە قولایی گیروگرفتەکان و بـە ووشەکـانی رێگای راستـو دروست بۆ گـەلەکەی رۆشن بکاتەوەو گەل هان بدات بۆ کارکردن و هێنانەدی دووا رۆژێکی خۆشترو هەر وەها خزمەتی نیشتمـانەکـەی بکات و کـۆسپ و تەگەرە لە رێگای لاببات . ئەمەش لە رێگای نووسین و پێشکەش کردنی بەرهـەمی رەسەن و پۆختەو بە سوود کە لە ئەنجـامدا ژیانی گەل خۆش ببێت و پلەی شارستانیەتی بەرزتر بکـرێت و رەوشتی باش لە نێو رۆڵەکانماندا بلاوبکرێتەوەو بچەسپێ . نـەك بە بـلاوکردنـەوەی بەرهـەمی پـووچ و لاواز ودووبـارە کردنەوەی شتی ووتراوو بەرهەمی دوور لە ئارەزووی جەماوەر .

ئەدەبی راستو پێشکەوتوو ، ئەو ئەدەبەیە کە هـەوڵ دەدات بۆ بە هێزکردنی نیشتمـان و هێنانـەدی ی کامـەرانی و بەختەوەری بۆگەل و پتەو کردنی برایەتی و هاوکاری لە نێوان خەڵکدا لە سەرانسەری وولاتەکەماندا ئا بەم جۆرەو تەنها بەم رێگایە ، نووسەر ئەبێتە پێشرەوی گەلەکەی و رێگای راست و دروستی نیشان دەدات و سەرکردایەتی کاروانەکـەی دەکات بەرەو دووا رۆژێکی خۆشتر .

لە بازنگەی سێیەمیشدا سەرۆکی فەرماندە بۆ جیهانێکی فراوانتر هانمان دەدات و سەرنجمان رادەکێشێ و رێگامان بـۆ ئـاسۆیێکی پـڕ لە ئومێـدو ئاواتێکی مـەزندا خـۆش دەکات . سەرۆکی خۆشەویست لە ووتارە بەنرخەکەیدا چەنـد جارێـك دەست نیشانی ئاواتی مرۆڤانەی کردووەو جێبەجێ کردنی بە ئەرکێکی گشت لایەك زانیوەو کاتێ جم وجـولێك لە نـاو بازنگـە تایبەتیەکەمـان ئەو بـازنگەی بـەبازنگـە عیراقیـەتیەکـەمان بـەستراوەتـەوە دەنـوێنیـن ، ئـەو کـاتـە ئـەرکێکی مـەزنی سەرشانمان جێبەجێ دەکەین و هەست بە تەکامولێك دەکەین لە روی زانست و بیرو هونەرەوە . لە دوایشیدا دەتوانین شتێ لە بەرهەمەکەمان بە جیهانی دەورووپشتمان ببـەخشین ، لە ئـاست جیهاندا دەکـرێینەوەو کـاری تێ دەکەین و کـارمـان تێ دەکات ، پێشکەشی دەکەین و لێی وەردەگرین ، کار دەکەین و بەشدار دەبین لە دروست کردنی شارستانیەتی جیهانی و بیری جیهانی و هونەری جیهانی ئەوەش شتێکی دوور نییەو کارێکی زەحمەت نییە ، چونکە سەرۆکی فەرمـاندە ئـەم راستییەی روون کردەوە کە گەلێ جار لەسـەر رووی ئەم خـاکەداو لەم نیشتمـانـەدا روویـداوەو بـە دەستی رۆڵەکـانی ئـەم گـەلە هـاتووەتـەدی کە گـەلی عیراقـە پێش لە دایك بـوونی عیسـا پێغەمبەرو پێش ئیسلام و پاشی ئیسلامیش.دەبا ئـەو نموونـە چاك و زیندووانە ببێتە هۆیەك بۆ جێبەجێ کردنی گشت ئارەزوو ئاواتەکانمان و هەموو هەوڵ و تەقەلامان رەوا بکـات و سەر لە نوێ شوێنی خۆمان لە مێژوودا بگرینـەوە . ئەمـەش شتێکی سەیر نییە ئەمە چەند تیشکێکی بریقەداری ووشە پیرۆزەکانی سەرۆکی فەرماندەیە دەبا ئێمەی عیراقی ، بە تایبەتی خاوەن پێنووسەکان ، بیکەین بـە کارنـامەو دەستـووری ئەدەب بـۆ روونـاك کردنـەوەی رێگا لەپێش ئـاواتە مـەزنـەکـانی گـەلە یەککرتووەکەماندا .

**« دەستەی نووسەران »**

**بابەکر پشدەری**

# کاروان و .. « کاروان »

بێگومان گەلان کاروانیان هەیە .. گە لی کوردیش بەر لە باری خۆی وەك هەموو گەلێکی تری ئەم جیهانە کاروانی تایبەتی خۆی هەیە ، واتە جوولانەوەی ئازادیخوازانەی کوردیش وەك جوولانەوەی ئازادیخوازانەی گەلانی تر کاروانەکەی بەردەوام هەر لە وچان دایە ..

جا سەبارەت بەم کاروانە مەزنەی نەتەوەکەمان دەبینین لە ناوچەی کودستانی عیراقدا زیاتر لە ناوچەکانی تر بەرەو پێشەوە هەنگاو دەنێ بەهۆی ئەو دۆخ و بارە لە بارەی لەم ناوچەیەدا بۆی هەلکەوتووە .. دلنیاین کە رۆلەکانی ئەم نەتەوەیە لە بەشەکانی تریشدا هەولێکی ئەوتۆ دەدەن کە کاروانی گەلەکەمان بە شێوەیەکی تێکڕاو بە پێی خواست رێگای پیرۆزی خۆی بەرێتە سەر .

بۆ ئەوەی بشتوانین ئەم کاروانە مەزنە وەك پێویست پێشخەین دەبێ هەولی ئەوە بدەین کە ئەو بنەمایانەی ئەم کاروانەیان راگرتووە (کە بێگومان هەریەکە کاروانێکی سەربەخۆ پێك دێنن) زیاتر بیانچەسپێنین‌و پتەویان بکەین .. یەکێ لەم بنەمایانەش مەسەلەی رۆشنبیریی‌یە .

رۆشنبیریی وەك کارو ئەرکێکی پیرۆزەو مەبەستە ئەوەندەش کارێکی بەزەحمەت‌و قورسە .. لە ئەستۆگرتن ئەم کارە دڵ‌و دەروونێکی فراوان‌و بە بیرو باوەڕو عەزمێکی زۆری پێ دەوێ .. جا رۆشنبیرکردنی خەلکی چ بە شێوە ئاسایی‌یەکەی ، یاخود بە هۆی ئێزگەو رۆژنامەو گۆڤارەوە تابلۆی کارێکە ئەوپەڕی ماندووبوون‌و لەخۆبووردنی پێ دەوێ .

**کاتێ دەمەویست ئەم چەند دێڕە بۆ گۆڤاری کاروانی خۆشەویست بنووسم ، کە بەڕێوەبەران‌و نووسەرانی ، ئەم ئەرکە قورس‌و پیرۆزەیان بە ئەستۆی خۆوە گرتووە .. قسەیەکی نەستەقی گۆڤاری (گەلاوێژ)م بیر کەوتەوە کە دەلێ «فێری رۆیین بە بەرلەوەی رابکەی[1]» .**

گۆڤاری کاروانی ئۆتۆنۆمی کوردستانیش ، بێگومان کە دەستە خوشکێکی دلسۆزی گۆڤاری گەلاوێژە ، دەبێ چاك رێ بکاو باش دەست پێ بکاو هیچ کون‌و قوژبنێ لە پرشنگی رووناکی خۆی بێ بەش نەکا . چونکە هەروەك دەستە خوشکەکەی دەلێ : «چاك دەست پێکردن نیوەی کردنە[2]» .

بەڕای من ئەوەندەی کە لە سێ ژمارەی پێشووی گۆڤاری کارواندا بەدیم کردووە بەوپەڕی دلنیایی‌یەوە دەلێم ، بناغەکەی کارامانە هەلبەستراوە ، خۆ گەیاندنیش بە هەموو خوێندەوارو دەزگایەکی رۆشنبیریی هەلبەتا ، کارامانەتر ، رەنگی بۆ رێژراوە .

سالانی زو وەرچەندە کەمێ رۆژنامەو گۆڤار هەبوون ، بەلام ئەم رۆژنامەو گۆڤارانە نەدەگەیشتنە هەموو شوێنێك نەك هەرئە وە بەلکوو ئەوەندە خوێندەواریش نەبوون بیانخوێننەوە و لەهەموو باس‌و خواسێك بگەن .. جا زۆر جار وا دەگونجا کە هەوال‌و باسی ناوچەیەك بە ناوچەیەکی‌تر بە هۆی چەرچی‌و کاروانچی‌یەکانەوە رادەگەیەنرا .. هەندێ لەم کاروانچی‌یانە بەهۆی ناسکی‌ی ئەو کەل‌و پەلەی لە ولاخەکانیان دەنا ئەوەندە کارەکەیان قورس‌و بەزەحمەت‌بوو کە حەوسەلەیەکجار زۆری پێ دەویست .. لە مانە کاروانچی‌یە گۆزەو دیزە فرۆشەکان بوون . لێتان ناشارمەوە کە بلێم ئەو گوندەی کە من چاوم تێیدا هەلینا یەکێکە لەو شوێنانەی کە شانازیی بە دروست‌کردنی گۆزەو دیزەوە دەکا کە ئەمیش گوندی (هێرۆ)یە .

کاروانچی‌یەکان هەموو جۆرە کەلەو پەلێکیان لە ولاخەکانیان دەنا ، بەلام بە زۆری شتەکان خۆ ولاتی بوون وادەبوو ترێ ، هەرمێ ، دۆشاو ، گۆزەو دیزە ، لەبەر دەم مزگەوتی ئاوایی یا بەردەم مالی کوێخا بلاودەکرانەوەو خاوەن مال بەقایم هاواری شتەکانی خۆی دەکرد .

بە پارە بوایە ، یا بە ئال‌و گۆڕ ، پالی بەشتەکانیەوە دەنا . هەر دەتگوت بازاڕەکەی (عکاظ)ە ، هەی‌وەرە دۆشاو ، هەی وەرە گۆزە ، هەی وەرە دیزە ، یەك‌بەدوو ، یەك بەسێ ،

بەگەنم ، بەجۆ ، بە چەڵتوك ، ئەو دەنگانە بوون کە دەهاتنەبەر گوێ ..

دەمـەوئێـوارەش ، خـاوەن مـاڵ دوای ئـەوەی کـەلە فرۆشتنی شتەکانی دەبۆوە ، یـا ئەوانـەی ماونی لە جێیەك تاقەتی دەکردن . رووەو سەربانی مزگەوت ملی دەناو دەکەوتە هەڵرشتنی باس و خواسی ئەو هەندەرانەی پێیاندا تێپەریوە . ئەوە ئەگەر وەرز خۆش بوایە ، خۆ ئەگەر وەرزیش سارد بوایە وا بەرزۆپای مزگەوت ، یا بەر ئاگردانی ماڵی کوێخا ، جێی ئەم جۆرە کۆڕانە بوون .

گۆزەو دیزە فرۆشەکان کە کاروانەکانیان ، رێچکەیەکی بچووکی کاروانی ئابووری ئەو سەردەمەبوو ، لە هەمان کاتدا بە بڵاوکردنەوەو هێنان و بردنی باس و خواسەوە ، رێچکەیەکی رۆشنبیریی ئەوساش بوو .. کارەکەیان ، کارێکی زۆر قورس و بە دژواربوو . چونکە ساتمەیەکی بچووکی وڵاخـەکەیـان کە گۆزەو دیزەی لێبارابوو ، یاخۆلێدانی وڵاخەکە لە تەنگەبەرێك ، بەس بوو بۆ شکانی گۆزەو دیزەکانیان . لەبەر ئەمە دەبوایـە کاروانچی هەمیشە بەوپەڕی وریایی و لەسەرخۆیی وە ئاگای لە هـەموو نـەترەیـەکی وڵاخەکـانی بوایـە دەنا مـایـەچـووچ دەردەچوو .

هەر ئەوەش بوو کە وای لە کاروانچی کردبوو ، ئەو پەڕی ئارام بەکار بێنێ و گوێی خۆی لە ئاستی زۆر گاڵتەو توانج و قسە تێکرتنی ئاوەڵەکانی تری (کە بـارەکانیـان قابیـلی شکان نەبوون) بئاخنیایە .

**جا ئەگـەر کاروانچیـیـە گۆزەو دیـزە فرۆشـەکانی ئەوسا بەم هەموو مەینەتی و دەردەسەرییەوە کاروانە بچووکەکانیان توانیبەتی دەورێکی ساکاری ئـابووریی و کۆمەلایەتی و رۆشنبیریی لەو سـەردەمەدا بگێـڕێ ، خۆ کاروانەکەی ئێوە (گۆڤاری کاروان) کە بێگومان کـاروانی هەموانە ، تۆ بڵێی لە رۆژگاری ئیمرۆدا کە هەڵو مەرجی لە بارتر هەن بۆ ئـەم جۆرە کـارە ، نەتـوانێ رۆڵی خۆی بگێـڕێ و جێی خۆی لە دڵی هـەمـوو خـوێنـدەوارێکـدا نـەکاتـەوە ! گومـانم نییە لەوەی کـە کا رگـەران و نـووسەرانی کـاروان زیاد لە پێـویست لێوەشـاوەی ئەم مەبەستەن .**

گۆزە فرۆش بۆ ساخ کردنەوەی ماڵەکەی ، سەر بەسەر بوایە یا یەك بە دوو یا یـەك بە سێ ، کـە بیزانیـایە پـارەنیە ، گۆزەکانی پێ دەگۆڕیەوە ، جا ئیتر گەنم بوایە یا جۆ ، یا هەر شتێکی تی .

ئەمە بۆیە دەهێنمەوە دەمەوێ بڵێم ئەگەر کاکی گۆزە فرۆش کارەکەی بۆوەدەستکەوتنی مەسلەحەت بووبێ ، خۆ بێگومان گەلێ لەوەی ئەو مەسلەحەتترە کەبە هەرشێوەیەك بێ گۆڤاری کاروانی خۆشەویست بگاتە دەست هەموو کەسانێك کە بە تەنگ ، رۆشنبیرییەوەن ، ئیتر لەهەر شوێنێك هەن .. بۆ ئەوەی کاروان بەهەموو شوێنێ بناسرێ و لەم پێناساندنەوە بەرهەمی پاراوو بە پیتی دەستگیربێ .

بـەلێ کـەنـدو کـۆسپ و گیـرو گـرفتی سـەر رێی رۆژنامەگەریی گەلێ زۆرترن لەو گیروگرفتانەی دێنە سەر رێی کارەکانی تر ، بەلام هەرگیز چیای بەرزو باوەڕ بە خۆ سلی لە چەند پەلە هەورو کۆمەڵە تەمێ نە کردۆتەوە کە جـار بەجـار بـەسەریـدا دەکشێن .. بـەڵکوو زیـاتر خـۆی لەبەر دژواری سروشت راگرتووەو رۆژ بە رۆژ زیـاتر بـەشانـازییەوە بالای بەرزی خۆی دەلەنگێنێ .

زۆرم لە خـۆم کرد نـووسینـەکـەم شـایستـەی سـەر لاپەڕەکانی گۆڤاری کاروانی بەنـازبێ بەلام دەستی شکـاوم منێك وەك کەسانێکی تری زۆری ئەم جیهانی سێیـەمە ، هەر وەك گەلانی پێشکەوتـوو مانگی دەسکـرد بنێرنـە نێومانـگەو ئـەستێران و سـەدەها رۆژ مـرۆڤ وەهێڵن لە ئاسمـانـدا بـۆ تێگەیشتن فرە مەبەسی ، منیش هێشتا قەڵەمـەکەم ئـەوەندە برشتەی نیە کە بڵێم ئۆخەی ...

**بەلام باوەڕم ئەوەندە بە تینە ، وەك باوەڕی هەموو خوێندەوارێکی کوردی دڵسۆز کە دەبێ تادەست گـۆچان دەگرێ کۆڵ نەدەین و رێ بە خـۆمان نەدەین (کـاروان) بەجێمان بێڵێ ..**

**پەراوێز**

1 - گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە (5)
2 - گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە (5)

د . کەمال مەزهەر

# ئەدیب و ئەرکەکانی قۆناغ لەبەر ڕۆشنایی تاقیکردنەوەکانی ئەورووپای ڕۆژگاری «ڕێنیسانس»دا

## بەشی چوارەم

### « سۆشیالیزمی یۆتۆپی » یا « بەهەشتی خەو »

**سەرەتا :**

هەرچەندە ئەو ئاڵوگۆڕانەی ئەورووپای ڕۆژئاوا لە کۆتایی سەدە ناونجی یەکاندا بەخۆیەوە بینینی هەنگاوێکی گەورە بوون بۆ پێشەوە چونکە بوونە هۆی هەرەس هێنانی ڕژێمی دواکەوتووی دەرەبەگی ، بەلام ئەرکی گرانی جێبەجێکردنیان کەوتە ئەستۆی کۆمەلانی خەلکی مەلبەندەکە خۆیەوە . بەداخەوە زۆر جار ڕەورەوەی مێژوو بە خوێن و فرمێسک و ئارەقی ناوچەوانی چەوساوان بەرەوپێش دەچێت . ئەو دیاردەیە لە ئینگیلتەرەی ڕۆژگاری ڕێنیسانسدا زۆر زەق خۆی نواند .

لەبەر گەلێك هۆ ئەوساکە پیشەسازیی کوتاڵی ئینگلیزی هەنگاوی گەورەی بۆ پێشەوە نا [1] . بازاڕی زۆر وڵات دەرگەیان بۆ ئەو کوتاڵە نایابە خستە سەرگازی پشت . کارگەیشت بەوەی

ئینگیلتەرە لە ناوەندی سەدەی شازدەمیندا ساڵی 122 هەزار تۆپ کوتاڵی دەنارده هەندەران ، واتە بیستوچوار هێندی ناوەندی سەدەی چواردەمین ، ئەو کاتەی هەمووی بەسەریەکەوە ساڵی 5 هەزار تۆپی تیا دەنارده بازاڕی وڵاتانی دەوروبەری خۆی . بەر لە کۆتایی سەدەی شازدەمین ئەو کوتاڵە لە 82./ ی هەموو ئەو کەلوپەلانەی پێكدەهێنا کە ئینگیلتەرە دەینارده دەرێ [2] .



تۆماس مۆر

بەو جۆرە دروستکردن و بازرگانیی کوتاڵ بووە سەرچاوەی قازانجێکی ئەوتۆکە کەس تا ئەوساکە بە خەویش لە وێنەی بەخۆیەوە نەبینیبوو ، بۆیەکا پارەداران بەپەرۆشەوە ڕوویان تێکرد . زۆربەی هەرەزۆری دەرەبەگانی ئینگیلتەرە دەستیان لە کشتوکاڵ هەڵگرت و کێڵگەکانیان کردە لەوەڕگە بۆ پەروەردەکردنی مەڕو زۆرکردنی بەرووبومی خوری کە کارگە نوێکان لە هەموو لاوە بەپەرۆشەوە بە نرخی چاك دەیانقۆستەوە . وەك ئاشکراشە شوانکاریی ، بەپێچەوانەی کشتوکاڵەوە ، پێویستی بە هێزی کاری زۆر نییە . ئەو کێڵگەیەی جاران بە دەیان و صەدان جوتیار دەبرا بەڕێوە کە بووە لەوەڕگە ئەرکی بە چەند شوان و گاوانێك جێبەجێ دەکرا . بەڵگە ئینگلیزییەکانی ئەو ڕۆژگارە باسی ئەوە دەکەن چۆن لە گەلێك ناوچە دوو سێ شوان جێگەی 200 جوتیاریان دەگرتەوە . بەو پێیە بەلایەنی کەمەوە لە ٪90 ی جوتیاران لە زەوی‌وزارو کاری کشتوکاڵ بێبەریی کران . دەرەبەگانی ئینگیلتەرە بێپەروا کەوتنە گیانی پیاوەکانیان و بە دەیان هەزاریان لێ ئاوارەکردن . ئەو ئاغایانەی تا دوێنێ کەللەی ئەو جوتیارەیان دەپەراند بوێرێ بستێك لە زەوی‌وزاری فراوانیان دوور بکەوێتەوە بە دەیان دێ و گوندیان کاول کرد تەنها بۆ ئەوەی پیاوەکانیان ناچار بکەن سەری خۆیان هەڵگرن . بەشی زۆری ئەو قوربەسەرانە بەناچاری دایانە دەشت و کێو پەنایان بردە بەر ئەشکەوت و لێرو دارستان و لە گژو گیاو میوەجات بەولاوە هیچ نەبوو بیخۆن ، بەتایبەتی دوای ئەوەی بە ماوەیەکی کەم قڕیان خستە بەرانەکێویی ناو شاخان و ماسیی ناو ئاوانەوە .

بەشێکی زۆر لەو ئاوارانە بەناچاری ڕوویانکردە شارە گەورەکانی وڵات و ئامادە بوون بەنانەسکی هەر کارێکیان دەستبکەوێ بیکەن . سواڵکەرو دەرۆزەکەران هەموو لایان تەنی . دزی و جەردەیی و پیاوکوژی بوونە پیشەی ڕۆژانەی هەزاران . گرانیش هێندەی‌تر تەنگی بە هەموان هەڵچنی .

هەڵوەستی کاربەدەستانی ئەوسای ئینگیلتەرەو یاساکانیان بوونە سەرباری مەینەتیی ئەو هەژارانە . هێنریی هەشتەم کە لە ساڵی 1509 وە تاوەکو ساڵی 1547 پاشایەتیی کرد ویستی لە ڕێگەی یاساوە دەرۆزەکەری قەدەغە بکات . بەپێی یاسایەکی تایبەتی پیاوانی میری هەرکەسێکیان بە تۆمەی دەرۆزەکەری بگرتایە بۆ جاری یەکەم دارکارییان دەکرد . ئەگەر هەمان کەس جاری دووەم بگیرایەوە ئەوسا وێڕای دارکاری لایەکی گوێشیان دەبڕی . لە جاری سێیەمدا دەبرایە بەر پای قەنارەو سووك و باریك لەسەر بڕسێتی دەکرا بە سێدارەدا ! .

باری قورسی ژیانی هەژارانی ئینگیلتەرەی سەدەی شازدەمین بووە هۆی تەقینەوەی زنجیرەیەك ڕاپەڕینی جوتیاران . لەو ڕاپەڕینەدا کە ساڵی 1549 بە ڕابەریی ڕۆبەرت کێت[3] لە ڕۆژهەڵاتی ئینگیلتەرەدا تەقییەوە ژمارەی تەنها ئەوانەی چەکیان هەڵگرت و گیانیان خستە سەر لەپی دەستیان لە 20 هەزار کەس تێپەڕی [4] .

بێگومان دەبوو ئەو بارە جەرگبڕەی ئاوارانی نیشتمان هەناوی ئەدیب و ڕووناکبیرێکی گەورەی وەك تۆماس مۆر بهەژێنێ . ئەو قسە پڕتەوسەی لەو ڕۆژگارەدا مۆری بەناوبانگ کردی « مەڕ وا خەریکە زەلام بخوا » بووە پەندێکی چەسپاوی زمانی ئینگلیزی .

## تۆماس مۆر :

حەوتەمین ڕۆژی مانگی شوباتی ساڵی 1478 تۆماس مۆر[5] لە لەندەن لەدایك بوو . بنەماڵەی مۆر خوێندەوارو ناسراو بوو ، بەر لە تۆماس ژمارەیەکی زۆر دادکارو پارێزەری بەناوبانگی تێدا هەڵکەوتبوو[6] . هەر لە لەندەنی پایتەخت تۆماس مۆر خوێندنی تەواوکرد ، سەرەتا چووە « فێرگەی ئەنتۆنی پیرۆز » و پاشان زانکۆی ئۆکسفۆردی بەناوبانگی بڕی .

لەوساوە تێکەڵ بە دەستەی رووناکبیری بەرزی ئەو رۆژگارەی ئینگیلتەرە بوو . وەك لە بەشی رابوردووشدا باسمان کرد مۆر بووە هاوەڵی گیانی بەگیانیی ئێرازمـۆسی رۆتەردامی کـە ناوو شۆرەتی سەرانسەری ئەوروپای گرتبۆوە .

هونەرو ئەدەبو سروشتو چەند زانستێـك سەرنجی تۆماس مۆریان راکێشا [7] . مۆر لە لاتینیو گریکیدا زمانزانێکی وەستا بوو . ئەو سەرەتای بزوتنەوەی وەرگێرانی کەلەپووری دێرینی ئەوروپای لەو دوو زمانەوە بۆ سـەر زمانی ئینگلیـزی دامەزراند [8] .

تـۆماس مـۆر لە هەمـوو روویەکـەوە پیـاوێکی راستو مرۆیەکی بێ غەڵو غەش بوو . وەك هاوسەر دڵسۆزو وەك باوك جگەرسۆزو وەك هاورێ وەفادارو وەك کاربەدەست چالاكو ئازا و ویـرای هەمـووشیان دڵنـەرمو بەخشنـدە بوو . بـۆ خۆی ژنەکەیو منداڵەکانی بـە شیری چـاکەو مـۆسیقاپـەروەریو ئەدەبگوزاری گۆش کرد . ماڵی دیوەخانی زانایانو پەناگەی هەژاران بوو . خەڵکی بۆ خۆیان نازناوی « باشترین هـاورێی هەژار » یان بۆ هەڵبژارد [9] .

پاش تەواوکردنی ئۆکسفۆرد تۆماس مۆر بووە پارێزەرو یەکسەر ناوبانگی دەرکرد . یاسازانو قسەرەوانو گوتەبێـژو سەرراست بوو ، ئەوانەش ، وەك ئاشکرایە ، مەرجی سەرەکین بۆ سەرکەوتنی پیاوانی داد . کە ساڵی 1504 خۆی بۆ ئەندامەتی پارلەمان پالاوت کەس نـەما دەنگی بـۆ نەدات ، بـەتایبـەتی بازرگانانی لەندەن کە دەستەی پێشکەوتووی ئەوسای کۆمەڵ بوون . دەنگی زوڵاڵی تۆمـاس مۆر لەوێش بـەرزبۆوە . مـۆر ئازایانە بەرەنگاری سیاسەتی حەوتی هێنریی حەوتەم [10] هاتو بەهیچ جۆر ملی بۆ نەداو کە زانی هیچی بۆ ناکرێ دەستی لە پەرلەمان هەڵگرت . هەر لەبەر ئـەوەش مۆر مـەرگی هێنریی حەوتەمی وەك « رۆژی رزگاری » نرخاند [11] .

هێنریی هەشتەم بەر لەوەی بێتە سەر تەختی پاشـایی خۆی لە رووناکبیرانی رێنیسانس نزیكدەخستەوە کە یەکێکیان تۆماس مۆر بوو . لەوساوە جێگری پەختو مۆر بوونە هاورێ ، زۆر جار ئەویان سەری لەمیان دەدا . کە هێنریی هەشتەم بۆ یەکەم جار ژنی هێنا تۆماس مۆر پێنج پارچە هۆنراوەی تایبەتیی خۆی لە دەفتەرێکی رازاوەدا بە دیاری پێشکەش کرد . ئـەو دەفتەرەی مۆر ئێستە یەکێکـە لە کەلەپـوورە دەگمەنـەکانی « موزەخانەی بەریتانی » [12] .

تۆماس مۆر لەو بڕوایەدا بوو کە فەرمانڕەوایی هێنریی هەشتەم لەگەڵ خۆی سەرفرا زی بۆ گەلو نیشتمـان دێنێ ، بۆیەکا هەر کە ئەو هاتە سەر تەخت بەدڵ پشتگیریی کردو کاتێك داوای لێکرد بگەڕێتەوە سەر کاری میری فەرمانی نەشکاند . سەرەتا بووە یاریدەری شەریفی لەندەنو ئینجا بووە ئەندامی « ئەنجومەنی کۆشك » و لە ساڵی 1529 شەوە بۆ ماوەی سێ ساڵ بووە راوێژکاری یەکەمی پاشـا . بەر لەوەش بـووە سەرۆکی پەرلەمانی بەریتانیو لە یەکەم گوتەیدا بەو بۆنەیەوە داوای کرد نوێنەرانی گـەل لە لێدوانو وتـووێژە کـانیانـدا چاونـەترسو سەربەست بن [13] .

زۆری نەخایاند تۆماس مۆر دڵی لە هێنریی هەشتەمیش کـرمێ بوو . بـاشترین بـەڵگەی ئـەو راستیـیە شـاکـاری « یوتۆپیا » ی پڕ لە تـوانجو رەخنـەیە . وەك دواییش بـاسی دەکەین مۆر کاتێك « یوتۆپیا » ی دانا هێشتـا لە لقەپـۆپەی کاری میریدا بوو . لەگەڵ ئەوەشدا دوا تاڵی پێوەندیی نێـوان هێنریو مۆر لەو کاتەدا پسا کە پاشا بەبیانووی ژنهێنانەوە پێـوەندیی لەگـەڵ رۆماو پـاپادا پچـڕاند . هـەرچەنـدە مـۆر بەدەستووری ئێرازمۆسی هاوەڵی رەخنەی توندوتیژی لە کڵێسەو پیاوانی دەگرت ، بەڵام زۆر بەپەرۆش بوو بۆ پاراستنی یەکێتی جیهـانی عیسـاییو هـەر لەبـەر ئـەوەش دژی بـزوتنـەوەی چاككردنی ئایینو لوتەری رەهبەری ئەو بزوتنەوەیە وەستا [14] .

هەرچەند هێنریی هەشتەم هەوڵی دا بەڵام تۆماس مۆر لە هەڵوەستی خۆی پاشگەز نەبۆوە ، ئەوسا بە فەرمانی پاشا مۆر نەك تەنها لە کار دوورخرایەوە ، بەڵکو گیراش . دوای گرتنیشی هێنریی چەند جارێك بێسوود هەوڵی دا پەشیمانی بکاتـەوەو بیگێڕێتەوە سەر تەختوبەختەکەی جارانی . تەنانەت پارانەوەو فرمێسکی مارگرێتی کچیشی دڵیان نەرم نەکرد . ئەوسا بەپێی فەرمانی پاشا بەرەبەیانی رۆژی حەوتی تەمموزی ساڵی 1535 سەری پەڕێنراو بۆ « عیبرەت » لەبەردەمی یەکێك لە پردەکانی

لەندەندا هەڵواسراو دوایی بەپێی نەریتی ئەوسا توڕدرایە ناو ڕۆباری تایمسەوە . ئەوەنده هەیە هێنری « ڕەحمی تلیسایەوە » و ڕێگەی نەدا بەپێی دەستووری باوی ئەوسا بەر لە ناشتنی جەرگو هەناوی لە لەشی جیابکەنەوە ، ڕێگەشی دایە کەسوکاری لە ناشتنیدا بەشدار بن و پرسەی بۆبکرێن[15] .

کەم کەس لە مێژوودا بەڕادەی تۆماس مۆر ئازایانە بەرەنگاری مەرگ هاتوون . وەك دەگێڕنەوە تا دواهەناسەی ژیانی زەردەخەنە لە لێوی نەپەڕیوە . کە هێناویانە سەری بقرتێنن بە یەکێك لە ئەفسەرەکانی گوتووە :

« تکایە هەر بۆ سەرکەوتن یاریدەم
بدە ، لە هاتنە خوارەوەدا خۆم
کاری خۆم مەیسەر دەکەم ! » .

دوای ئەوەی لەسەر تەختەی سەرقرتانەکە درێژیان کردووە بەدەم زەردەخەنەوە ڕووی کردۆتە کابرای تەوربەدەست و پێی گوتووە :

« ساتێکم لێ ڕاوەستە تا ڕیشم
لا ئەدەم ، ئەو بێ تاوانە ... ملیشم
کورتە ، دەست باش داگرە نەبا
تەورەکەت تەتەڵە بکات »[16] .

* * *

تۆماس مۆر ژمارەیەك نووسینی بایەخداری دوای خۆی بەجێهێشت . نووسینەکانی کاری زۆریان کردە سەر ژیانی ڕووناکبیریی ئەورووپای ڕۆژگاری ڕێنیسانس و دوای ڕێنیسانس . کەم کەس بەڕادەی ئەو لە ئەرکەکانی قۆناغ گە یشتبوون و کەسیش وەك ئەو بۆ چارەسەرکردنیان نەچوو ، چونکە ، خۆی وتەنی ، « نەیدەتوانی وەك کەسانیتر بیربکاتەوە »[17] . هۆیەکی گرنگی تریش لە ئارادا بوو بۆ ئەوەی تۆماس مۆر بتوانێ باشتر لە دەردەکانی کۆمەڵ بگات ، ئەو ، وەك گوتمان ، وەك پارێزەرێکی ناسراو و فەرمانبەرێکی گەورە ئاگاداری ڕووداوی ژیان و بەسەرهاتی جەرگبڕی نەدار و لێقەوماوان بوو . پیاوێکی دڵڕەق و خۆپەرست و چەوسێنەریش نەبوو تا دەردو ئازاری خەڵکی نەبیزوێنێ .

« مێژووی ڕیتشاردی سێیەم » یەکێکە لە بەرهەمە نایابەکانی تۆماس مۆر کە تاوەکو ئێستەش بە سەرچاوەیەکی ڕەسەنی لێکدانەوەی ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی ڕیتشارد دادەنرێ کە دەوروبەری کۆتایی سەدەی پازدەمین بۆ ماوەی دوو ساڵ پاشایەتیی ئینگیلتەرەی کرد[18] . مۆر زانیارییەکانی ئەو بەرهەمەی دەماودەم لەخەڵکەوە کۆکردۆتەوە[19] . لە « مێژووی ڕیتشاردی سێیەم » و ژمارەیەك بەرهەمی تریدا تۆماس مۆر زۆر توند ڕەخنەی لە زۆرداری و زوڵم و زۆری میرو پاشایان گرتووە ، ئەو کارەی ئەوسا زمانی لەبندا لەسەر دەبڕڕا . ژمارەیەك لە بەرهەمەکانی مۆر ناویان بەخۆیانەوەیە ، وەك « لێدوانی خۆشی دژی ئەندیشە »[20] . تەنانەت کەڵەنووسەرێکی وەك شکسپیریش لە بەرهەمەکانیدا کەڵکی لە نووسینەکانی تۆماس مۆر وەردەگرت کە « یۆتۆپیا » گوڵی سەردەستەیانە .

## « یۆتۆپیا » :

لە نێوانی ساڵی 1515 و 1516 دا تۆماس مۆر بۆ کاری میری لە لەندەنەوە چووە شاری ئەنتروێپی هۆڵەندەو بروجی بەلجیك و ئەو ماوەیەی بەهەل زانی بۆ داڕشتنی ئەو بیروڕایانەی وا دیارە لە دەمێکەوە لە قوڵایی دەرونیدا پەنگیان خواردبۆوە . لەوێ کتێبی بەناوبانگی « یۆتۆپیا » ی نووسی کە بۆ خۆی لەژێر ناوەکەیدا بەم جۆرە بە خوێنەری دەناسێنێ :

« کتێبی زێڕینی بەکەڵك و خۆش
دەربارەی باشترین ڕژێمی
فەرمانڕەوایی و دوورگەی یۆتۆپیای نوێ » .

« یۆتۆپیا » لە دوو بەش پێکهاتووە . مۆر بەشی دووەمیانی لە دەرەوەی وڵات و بەشی یەکەمیانی دوای گەڕانەوەی بۆ لەندەن دانا . لە بەشی یەکەمی کتێبەکەیدا تۆماس مۆر باسی ناردنی بۆ ئەنتروێپ دەکات و چۆن لەوێ گوایە تووشی گەڕیدەیەکی پورتوگالیی شارەزا بووە بە ناوی هیتلۆدایەوە . لە ڕێگەی ئەو گفتوگۆیەوە کە گوایە لەگەڵ هیتلۆدایدا کردوویە مۆر کەلێك پلارو توانجی بەجێی گرتۆتە ڕژێمی سیاسی و ئابووریی باوی ئەوسای ڕۆژئاوای ئەورووپا . بە زمانی هیتلۆدایەوە تۆماس مۆر لەو بەشەی کتێبەکەیدا دەڵێ :



کامپانێلا

« کەس نی‌یە بتوانێ سیاسەتی پاشایان بگۆڕێ ... ئەوان بایەخ بە شەڕ زیاتر دەدەن وەك لە ئاشتی ... هەوڵ دەدەن خاکی نوێ زەوت بکەن لەبریتی ئەوەی بایەخ بدەنە وڵاتی خۆیان ... سەیرو سەمەرە لەوەدایە کە دزە گەورەکان دەبنە دادکارو سزای دزە پچوکەکان لەسەر ئەو پارچە نانە دەدەن کە لەتاو قوڕەی سکیان زات دەکەن دەستی بۆ ببەن ... بیستومە دەڵێن بەرخەکانتان کە جاران دەستەمۆو بێ‌وەی‌و کەمخۆر بوون ئێستە چاوبرسی‌و دڕندەن ، پیاو دەخۆن ، کێڵگەو خانوبەرەو شاران ویران دەکەن‌و دانیشتوانیان هەڵدەلووشن !! » .

کەس ، تەنانەت مارلۆو شکسپیری گەورەش بەو جۆرە باسی پاشاو میرو گەداو هەژارانی ئەو ڕۆژگارەی ئینگلتەرەیان نەکردووە .

دوای ئەوەی هیتلۆدای بەسەرهۆتەلاکی پاشایان‌و ڕژێمی پڕ لە زۆرداری‌یاندا دێتە خوارێ دەڵێ تەنها یەکسانیی تەواوو هاوبەشیی گشتیی بۆیان هەیە مرۆ لە کێشەو چەرمەسەری‌و چەوساندنەوە ڕزگار بکەن ، بەڵگەشی دوورگەی « یۆتۆپیا » یە . لەوێدا گوایە تۆماس مۆر تکا لە هیتلۆدای دەکات باسی « یۆتۆپیا » ی بۆ بگێڕێتەوە . بەو جۆرە بەشی دووەمی کتێبەکەی دەست پێ دەکات .

« یۆتۆپیا » دوورگەیەکی ڕازاوەیە کەوتۆتە ئەوبەری دونیاوە . دانیشتوانی گیرۆدەی هیچ کێشەیەك نین ، کەس کەس ناچەوسێنێتەوە ، کەس زۆر لە کەس ناکات ، هەر لەبەر ئەوەش کەس ڕقی لە کەس نی‌یە . زەوی‌وزاری « یۆتۆپیا » هی هەموانە ، کۆگاکانی هەرچی دڵ بیەوێ تیایاندایە ، ساڵ دوازدەی مانگ دەرگەیان ئاواڵەیە ، کێ چیی بوێ بۆخۆی دەیبا . سەرجەمی دانیشتوانی « یۆتۆپیا » نیشتەجێی شارانن ، واتە گوندو لادێ نازانن . هەر خانووەی دوو دەرگەی هەی‌و هەردووکیان هەمیشە ئاواڵەن .

کەس نی‌یە لە « یۆتۆپیا » دا کار نەکات ، ڕۆژی کاریش شەش سەعاتە کە بەرهەمی بەشی ژیانی پڕلەخۆشیی هەموان دەکات . دەستەیەك زانای هەڵکەوتوو نەبێ کە خۆیان بۆ پێشختنی کۆمەڵ تەرخان کردووە ئیتر هەموان وەك خوشك‌و برا دەچنە کارگەو کێڵگەکان‌و شەرم لە هیچ کارو پیشەیەك ناکەن چونکە بەری ڕەنجیان بۆ خۆیانە . کۆمەڵ بەرپرسیاری نەخۆش‌و کەفتەکارانە کە هەموان بۆیان دەبنە کەسوکار . منداڵان دەبێ بخوێنن ، خوێندنیش دەبێ لەسەر بناغەی تیۆری‌و چاوبینی دامەزرێ ، بەوێنە ئەوی لە فێرگە دەربارەی کشتوکاڵ دەیخوێنن پێویستە لە کێڵگەش بە چاو ببینن .

کەمترین جیاوازی لە نێوان ئافرەت‌و پیاوی « یۆتۆپیا » دا نی‌یە . هەردوکیان وەك یەك فێر دەبن‌و وەك یەك کار دەکەن‌و وەك یەك لە ڕۆژی تەنگانەدا چەك هەڵدەگرن . گەر ویستی ئافرەت بۆی هەیە تەنانەت بشبێتە مەلاو پێشنوێژ . باری ژیانی « یۆتۆپیا » کاریکی ئەوتۆی کردووە ئافرەت هیچ جۆرە ئەرکێکی ناوماڵی نەکەوێتە ئەستۆ ، تەنانەت چێشتیش لێنانێ چونکە ئەو خۆراکەی لە چێشتخانە ڕازاوەکاندا بەدەم ساتوسەمتورەوە پێشکەشی هەموان دەکرێ دەستی پێوە دەخورێ . هەموو ژەمێك بەدەم قسەی خۆش‌و پەندو ڕاوێژی پیرانەوە دەبەنە سەر .

خێزانی « یۆتۆپیا » نمونەی تەبایی‌و بەرزی‌یە . بەر لە هەژدە ساڵی کچ نابێ شوو بکات‌و کوڕیش بەر لەوەی تەمەنی دەبێتە بیستوسێ ساڵان نابێ ژن بهێنێ . بەر لە مارەبڕین دەبێ باش یەك بناسن چونکە دوایی جیابوونەوە کارێکی ئاسان نی‌یە . ڕێگەی جیابوونەوە هەر ئەوکاتە دەدرێ کە هەردوو لا دوای بیرکردنەوە هاتبنە سەر ئەو ڕایەی پێکەوە دانویان ناکوڵێ

. داوێن‌پیسیی لایەکیش دەبێتە هۆی جیابوونەوە ، بەلام قوربەسەر داوێن‌پیس ، لەبەر چاوی هەموان ڕیسوا دەبێ !. ئافرەتانی « یۆتۆپیا » سووراو سپیاو نازانن ، لای پیاوانی ئەو جوانە جوانە کە بە ڕەوشتیش جوانە .

کۆڵەکەی ڕژێمی سیاسیی « یۆتۆپیا » یەکسانی‌و یەکمافی‌یە . هەموو شارانی « یۆتۆپیا » لەژێر سایەی یەکێتی‌یەکی فیدرالیی ڕاستەقینەدا حەواونەتەوە . میر نەبێ کاربەدەستان هەموویان لەلایەن دانیشتوانەوە هەڵبژاردنی ساڵانەیان بۆ دەکرێ . هەرچی میرە جارێك هەڵدەبژێردرێ ، دەبێ داناو لێهاتوو بێ . میری « یۆتۆپیا » چاك لەوە گەیشتووە گەر هەڵوەڕ یا خۆهەڵکێش بێ یا کەمێك پێ خوار دانێ‌و بیەوێ بیروڕای خۆی داسەپێنێ ئەوا یەکسەر تەختوتاراجی لەکیس دەچێ . هیچ کارو فەرمانێکی گەورەی دەوڵەت نی‌یە لە کۆبوونەوەی گشتیدا بڕیاری لەسەر نەدرێ . سزای خنکاندن لە سەرانسەری دوورگەی « یۆتۆپیا » دا تەنها بۆ ئەوکەسانەیە کە بەڕاستی دوژمنی ڕەوشت‌و چاکەو کۆمەڵن ، ئەوانەی هیچ دادیان ناداو دەبنە باری گران بەسەر دانیشتوانی نیشتمانی ڕازاوەی گەلی « یۆتۆپیا » وە .

یاسای « یۆتۆپیا » مافی تەواوی سەربەستیی ئایینی بۆ هەموان پاراستووە ، تەنانەت خوانە پەرستانیش ئازادن‌و بۆیان هەیە بکەونە گفتوگۆو لێدوانی تایبەتیی لەگەڵ شارەزاو زانایاندا ، بەلام نابێ لە کۆبوونەوەی گشتیدا چالاکی بنوێنن . خۆ گەر هەموان دان بەوەدا بنێن گیان نەمرو ژیان دەستکردی یەزدانە ئەوا دەتوانن جڵەوی بەڕەڵلایی باشتر دابین بکەن . دانیشتوانی « یۆتۆپیا » ئایینی عیسایی‌یان بۆیەکا لا پەسندە چونکە کاتی خۆی داوای یەکسانیی هەموانی دەکردو بە ڕووی جیاوازکەراندا هەڵسا .

دیارە کۆمەڵێك ئەندامانی بەو شێرە خاوێنە گۆش بکرێن بەختەوەرو سەرفراز دەبێ ، هیچ هۆیەك لە ئارادا نابێ بۆ ئەوەی دەروونی کەسێکی تووشی گرێ بێ ، یا کەسێکی ڕقی لە کەسێکی بێ . هەموان دڵپاك‌و کراوەو چالاکن . بە چرای ڕۆن‌گەرچەکیش چاوچنۆکێك لە سەرانسەری دوورگەی « یۆتۆپیا » دا نادۆزیتەوە . سەرتاپایان گاڵتەیان بە زێڕ دێ ، پڕ بەدڵ بەو بێگانانە پێدەکەنن کە سەروپۆتە لاکیان بە میدال‌و نیشانی زێڕین ڕازاندۆتەوە ، چونکە ئەوان لەوەتەی هەن زێڕ بۆ دروستکردنی کۆت‌و زنجیری بەندان‌و قەعادەی منداڵان بەکار دەهێنن .

کەس وەك دانیشتوانی « یۆتۆپیا » لە جوانی سروشت ناگات . گشتیان عەودالی زانیاری‌و خوێندنەوەو مۆسیقاو وەرزش‌و گەشت‌و گەڕانن . ئاشتی‌پەروەرو دژبەشەڕن ، بەلام قوربەسەر ئەوەی دەستیان بۆ درێژ دەکات ، سەرتاپایان بۆی دێنە مەیدانەوە ، بێ سێ‌و دوو گیان‌و سەرو ماڵیان فیدای نیشتمان دەکەن . ئامادەشن دەستی یاریدەی دڵسۆزانە بۆ ئەو دراوسێیانەیان ڕابکێشن کە دژی زۆرداری‌و لە پێناوی سەرفرازیدا دەجەنگن . ئەوی لەخۆیان زیاد بێ دەیکەنە دیاریی دەستیان‌و پێشکەشی کۆمەڵانی‌تری دەکەن .

بەو جۆرە تۆماس مۆر وێنەی کۆمەڵێکی بەختەوەرو بێ‌کێشەی بۆ کێشاوین‌و لە ڕێگەیەوە کۆمەڵگا پڕکێشەکانی ڕۆژگاری خۆی بۆ ڕیسوا کردووین . بەلام مۆر باش لەوە گەیشتبوو کە دوورگەکەی بەهەشتی خەوەو وا دیارە هەر لەبەر ئەوەش ناوی « یۆتۆپیا » ی بۆ هەڵبژاردووە کە لە دوو وشەی لێکدراوی لاتینی پێکهاتووەو بەسەریەکەوە واتای « ئەو شوێنەی نی‌یە » دەگەیێنن .

لە دێرزەمانەوە ژمارەیەك ڕووناکبیری‌تر بیریان لە یەکسانی‌و نەهێشتنی چەوساندنەوە کردۆتەوە[21] ، بەلام کەسیان نەیانتوانی وەك تۆماس مۆر بەوردی بۆ زۆر لایەنی مەسەلەکە بچن . مۆر یەکەم کەسە دروست خاوەنێتی تایبەتی‌و گشتی‌و شوێنیانی لە ژیانی کۆمەڵدا نرخاندووە . مۆر لەو بارەیەوە نووسیوی‌یە دەڵێ :

**« لەهەر شوێن خاوەنێتی تایبەتی باو بێ‌و**
**پارەوپول سەنگی کێشان بێ ناتوانرێ**
**کاروباری میری بەجۆرێکی ڕاست‌و شێوازێکی**
**سەرکەوتوو ببرێ بەڕێوە »[22] .**

تۆماس مۆر یەکەم کەسە بۆ ئەو ڕاستی‌یە چووە کە یەکسانیی ڕاستەقینە دەبێتە هۆی نەمانی جیاوازیی نێوان لادێ‌و شارو کارکردن دەبێتە ئەرکی سەرشانی هەموان ، ئەو بۆچوونانەی دوایی ڕەنگیان لە بیروباوەڕی سۆشیالیزمی زانستیدا دایەوە .

تۆماس مۆر بە دامەزرێنەری ڕێبازی « سۆشیالیزمی یوتۆپی » دادەنرێ [23] کە یەکەم شێوازی ڕێکوپێکی سۆشیالیزمە لە مێژوودا . ڕاستە تۆماس مۆریش وەك هەموو ڕووناکبیرانی ڕۆژگاری خۆی نەیتوانی گشت نیشانەکان ڕاست بپێکێ‌و لە ژمارەیەك هەڵوەست‌و نرخاندنیدا ئەویش کەوتە هەڵەوە [24] ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەس وەك ئەو قووڵ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی قۆناغ نەچوو ، ئەو یەکەم کەس بوو ویستی بەهەشت بهێنێتە ئەمەدونیاوەو تۆوی چەوساندنەوەو زۆرداری لە کۆمەڵ ببڕێ . هەر لەبەر ئەوەشە تۆماس مۆر بۆتە یەکێك لە نەمرانی مێژوو . ناوی شانۆگەری‌و فلیمی « پیاوی هەموو چەرخێك » ، کە دەربارەی ژینامەی مۆرە وا بەخۆیەوە . واشە ، هەموو چەرخێك پێویستی بە کەڵەپیاوی وەك تۆماس مۆرە ، پێویستی بەوانەیە کە وەك ئەو لە ئەرکەکانی قۆناغ دەگەن‌و وەك ئەو دڵسۆزانە بیرو خامەیانیان بۆ تەرخان دەکەن

زۆری نەبرد لە ئەورووپای ڕۆژگاری ڕێنیسانس‌و دوابەدوای ئەو ڕۆژگارە ژمارەیەك ڕووناکبیری لێهاتووی تر ویستیان بە دەستووری تۆماس مۆر لە ڕێگەی سۆشیالیزمی یوتۆپی‌یەوە سەرفرازی بۆ گەل‌و نیشتمان بهێنن .

*     *     *

## « سۆشیالیزمی یوتۆپی » دوای مۆر

### کامپانیلاو « شاری ڕۆژ » :

ئەو ئاوەی تۆماس مۆر ڕشتی لەوانە نەبوو جارێکی‌تر بگیرێتەوە ، گوڕو تینی لەگەڵ زۆربوون‌و پەرەسەندنی چەوساندنەوەدا توندوتیژتر دەبوو . بەر لەوەی ڕۆژگاری « ڕێنیسانس » کۆتایی بێ ژمارەیەك ڕووناکبیری‌تر هەر یەکەیان بەجۆرێك کەوتنە سۆراخی « بەهەشتی خەو » . یەکێك لەو ڕووناکبیرانە کامپانێللای ئیتالیایی بوو .

تۆمازۆ ، یا تۆماس کامپانێللا [25] ڕۆژی 25 ی ئەیلولی ساڵی 1568 لە ناو خێزانێکی نیمچە هەژاردا لە دایك بوو . باوکی پینەچی‌و دایکی کەیبانووی ماڵ بوو . سەرەتا لە کڵێسە خوێندی‌و هەر لەوێش بووە قەشە ، بەڵام زۆری نەبرد دەستی لە ژیانی ڕەبەنی هەڵگرت‌و ڕووی کردە نووسینی شیعرو فەلسەفە . ساڵی 1591 یەکەم کتێبی فەلسەفیی بڵاوکردەوە . لە بیروباوەڕیدا کامپانێللا زۆر بەتوندی ڕەخنەی لە گەلێك لایەنی ڕێبازی تۆژینەوەی وشکی فەلسەفیی ڕۆژگاری خۆی دەگرت‌و ئازایانە پەنجەی بۆ کەموکورتێکانی کڵێسە ڕادەکێشا . زۆری نەبرد لەسەر بیروباوەڕی گەشبینی خرایە زیندانەوە .

دوای بەربوونی تومازۆ کامپانێللا جارێکی تر سەری نەکردەوە بە کڵیسەدا ، کەوتە گەڕان بە پارچەکانی نیشتماندا . هیچ وەك دەردو ئازاری هەژاران‌و دابەشیی ئیتالیا دەروونی نەدەهەژاند . ئەوسا باشووری ئیتالیای نیشتمانی لەژێر دەستی ئیسپانی‌یەکاندا دەینالاند . کامپانێللای چاونەترس پلانی شۆڕشێکی گەورەی دانا کە مەبەستی نەهێشتنی دەسەڵاتی ئیسپانی‌یەکان‌و دامەزراندنی ڕژێمێکی کۆماریی سەربەخۆ بوو . بەداخەوە دوژمنان پێیان زانی‌و دیسان کامپانێللایان گرتەوە . ئەمجاریان یەکێك لە دادگە دواکەوتووەکانی پشکنین دوو تۆمەیان دایە پاڵی ، یەکەمیان تۆمەی یاخی‌بوون دژی دەسەڵاتی میری‌و دووەمیان تۆمەی دوژمنایەتی پاپاو کڵێسە . نە ئازاردانی بێ ئەندازەو نە تەماعی دونیا سەریان بە ڕۆڵەی دڵسۆزی گەل‌و نیشتمان شۆڕ نەکرد . خۆی بەشانازی‌یەوە نووسیوی‌یە دەڵێ :

**« هیچ شتێك نەبوو بتوانێ**
**ورەم پێ بەربدات ، کەسێك نەیتوانی**
**وشەیەکم لێ دەربهێنێ » [26] .**

ئازایەتی کەمهاوتاو قسەزانینی چەند جارێك ملی تۆمازۆ کامپانێللایان لەپەت قوتار کرد ، بەڵام نەیانتوانی لە بەندیخانەی ڕزگارکەن . کامپانێللا بەسەریەکەوە 33 ساڵی ڕەبەقی لە زیندانەکانی ڕۆماو ناپۆلی بردە سەر . 33 ساڵ بەندی‌و ئەشکەنجە بەرد دەتوێنێتەوە ، بەڵام کاری نەکردە سەر کامپانێللای نەبەز کە لە نووسین‌و بیرکردنەوە . لەو ماوەیەدا بە دەیان کتێبی دەربارەی فەلسەفەو سیاسەت‌و ئەستێرەناسی‌و پزیشکی‌و ئابووری‌و هونەری جەنگ‌و ئەدەب‌و شیعر داناو توانی ژمارەیەکیان بە قاچاغ لە ئەڵەمانیا بکەیێنێتە چاپ .

لە بەندیخانەشـەوە تۆمـازۆ کامپـانێللا عەودالّی هەوالّی نیشتمان و زانایان بوو ، هەولّی دەدا هەرچۆنێك بێ لێـیـان نەپچـڕێ . هەر ئـەوەنـدە بیستی کڵێسـەو دادگـاکانی پشکنـین فشاریـان خستۆتـە سەر زانـای بەناوبانگ گالیلۆ گالیلی[28] لەوێوە بە خامـەی تاریکبـڕی کـەوتە ڕیسـواکردنی دوژمنـانی . ئـەو هـەڵوەستـەی کامپانێللا هێندەی‌تر شایانی ڕێزو قەدر دەبێ گەر بێتو بزانین بۆخۆی لەگـەڵ ژمارەیـەك لە بۆچـوو نـەکانی گالیلۆدا نەبوو ، بەلام بەلایەوە بەربەرەکانێی زانایان و فەرامۆش‌کردنی ئازادیی بیریان نەنگی و پەڵەی شـەرم بوو .

ئەو جۆرە هەڵوەستە پیاوانانەی کامپانێللا ، وێرای نووسینە بەرزەکانی ، بوونە هۆی دەنگدانەوەی ناوی لە سەرانسەری ئیتالیاو ئەورووپای ڕۆژئاوادا . تەنانەت پاپا ئوربانی هەشتەمیش یەکێك بوو لەوانەی کـامپانێللای چوبو بەدڵدا . بە یاریدەی ئەو مانگی مایسی ساڵی 1629 پاش 33 ساڵ ئەشکەنجە دەرگەی زیندان بۆ کامپانێللا کرایەوە . پاش چەند ساڵێکی کەم کامپانێللا لە ئیتالیـا هـەڵهات چـونکـە بـاش دەیـزانی درەنـگ و زوو هـەر دەیگرنەوە . کامپانێللا دوا پێنج ساڵی ژیانی لە فەرنسە بـردە سـەر کـە ئـەوسـاکـە بـەهـۆی ریشلیـوی سەرەك‌وەزیرانەوە[29] باری ژیانی ڕووناکبیرو زانایانی لە زۆربەی ولاتانی ئەورووپا باشتر بوو . ڕۆژی 21 ی مایسی ساڵی 1639 دڵی گەورەی کامپانێللا لە دووروڵات لە لێدان کەوت .

تۆمازۆ کامپانێللا بیروڕای سۆشیالیزمی یۆتۆپیی خۆی لەو کتێبەیدا تۆمار کردووە کـە ساڵی 1602 لەنـاو زنیداندا بەناوی « شاری ڕۆژ » ەوە داینا . « شـاری ڕۆژ » بەرهەمێکی ئەدەبی و فەلسەفی و سیاسی یە . گوایە دەریاوانێکی ئیتالیایی ڕێگەی لێ ون دەبێ و شەپۆلی دەریا دەیبـاتە دوورگـەیەکی نـەناسـراو کە دانیشتـوانی بـە دەستووری دوورگەی « یۆتۆپیا » یەکسـان و یەکمـاف و بەختەوەرن . کەسیان نەکەوتوونەتە بەندو ئەسـارەتی پارەوپوولەوە . سامانی زۆری « شاری ڕۆژ » تەرخانی خزمەتی هەموانە ، واتە کـەس لەوێ نەبـۆتە کـۆیلەی سەرمایە ، بەڵکە ئەمیان بۆتە خزمەتکاری عەڵقەلەگوێی گشت لایەکیان . لە سـەرانسەری « شـاری ڕۆژ » دا چەوسێنەرێك یا بێ‌کارەو نەخوێندەوارێك بەدی ناکرێ . کار لای هەموان ئەرکی پیرۆزی ژیانە ، کاری ڕۆژانەی کەسیش لە چوار سەعات تێناپەڕێ . دوای ئەوە هەموو ژیانیان بـە خوێنـدنەوەو ئـاهەنـگ و سەیـرانی خۆش و وەرزش و کـاری هونـەری دەبەنـە سەر . سـەرتاپـای دانـیشـتـوانی « شـاری ڕۆژ » ئـازاو بـەجـەرگ و لەخـۆبوردوون ، نیشتمـان هێندەی پێ‌داون لە ڕۆژی تەنگانەدا کەمتەرخەمی نەکەن و گیانی بۆ بەخت بکەن .

بـەچەشنی دوورگـەی « یۆتـۆپیا » دانیشتـوانی « شاری ڕۆژ » پێکرا لە چێشتخانە ڕازاوە گشتی‌یەکان نان دەخۆن ، خۆیان فەرمانڕەوایانیـان هەڵدەبـژێرن ، کەس نی‌یە نەخوێنێ و بنـاغەی خـوێندنیش تیـۆری و چاوبینەو بۆ ئەو مەبەستە هەموو دیوارەکانی ناوشار بە وێنەی دڵفرێن ڕازێنراونەوە ، قوتابیان زۆر جار ئەوی لە فێرگە دەیبیستن لەناو شاردا بە چاویش دەیبینن . بەری خوێندن بۆ کچ و بۆ کوڕ وەك یەك بەرەڵلایەو بە زمـانی زگماکی خۆیانێ هەموو قۆناغەکـانی دەبڕن . ئـەمیانـە تێکەیشتنی وردی ئەرکی قۆناغ بوو ، چونکە ئەوسـاکە خوێندن لە سەرانسەری ئەورووپادا بە لاتینی بوو نەك بە زمانی نەتەوەیی .

تۆمازۆ کامپانێللا بڕوای بە توانای بێ‌سنـووری مرۆ بوو بۆیەکا دانیشتوانی « شاری ڕۆژ » ی بەسەر سروشتدا زاڵ کردووە[30] .

کامپانێللا لە ژمارەیەك بەرهەمی تریدا زنجیرەیەك بیـروڕای وەك ئەوانـەی « شاری ڕۆژ » ی بـۆ تۆمـار کردووین . جاری وا هەیە لە نووسینەکانیدا کـامپانێللا داوای دامەزراندنی ڕژێمێکی یەکسانی دوور لە شەڕو کێشە بۆ هەموو جیهان دەکات . پێی وایە داهاتی جیهان هێند زۆرە کەس نەبێتە قوربانیی برسێتی و نەبـوونی و کەس چاونەبڕێتە خاکی کەس و بەو جۆرە ئاشتی و تەبایی باڵ‌دەکێشن بەسەر ژیاندا ، ئەوساکەش « بەپێی یاسای سـروشت » زانست و فـەلسـەفـەو ڕەوشت دەگـەنـە لقەپۆپە[31] .

سـەرنجەکـانی تۆمـازۆ کـامپـانێللا ئـەنجـامی تێگەیشتنی ڕاستی ئەرکەکانی قۆناغ بوون . بۆ خۆی لە « شاری ڕۆژ » دا باس دەکات چۆن لە حەفتا هەزاری دانیشتوانی شاری ناپۆلی تەنها دە پـازدە هەزارێکیـان شـەوو ڕۆژ دەرەوتێنـەوەو ئـەوی نـاشێ دەیکـەن و ئەوانی‌تریش ژیانی پڕ لە تەمەڵی و بەڕەڵلایی و ڕابواردنی بێشوورەیی دەبەنە سەرو بوونەتە میکرۆبی خراپە بۆ گیانی هەموان[32] .

کـامپانێللاش وەك کـەڵە ڕووناکبیـرەکانی تـری ڕۆژگـاری ڕێنیسـانس نـەیـدەتـوانی هـەمـوو یـاسـا بزوێنەکانی ژیان بەوردی ببینێ . بەوێنە لای ئەو دەوری سروشتی مرۆ لە ناتەواویی‌یـەکانی کـۆمەڵدا زۆر لەوە زیـاترە کـە هەیـە . گوایـە خوێنـدەواریش بۆی هـەیە سەرفرازیی ڕاستەقینە لەگەڵ خۆیدا بهێنێ ، هەر لەبەر ئەوەش منداڵان لە کەسوکاریان دەکاو لەناو قوتابخـانە تایبەتی‌یەکاندا بە شیری چاکە گۆشیان دەکات و زانـاو دانایان دەکاتە سەرُدەستەی کاروباری میری . پێی وایە خوێندەوار نابێ بکەوێتە هەڵەوە . خۆی لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێ :

**ئەی دەبەنگی[33] مەرگ بۆ تۆ**
**ئەوا من هاتمە ژیانەوە[34]**

کەوابێ تۆمازۆ کامپانێللا نیشانەکانی دروست دیارکرد ، ـەلام لە هەمـوو ڕوویەکـەوە ڕێگەی پێکـانیانی دروست بـۆ ەکێشاین . هەر لەبەر ئەوەش لەبریتی جەماوەر ڕووی دەمی کردە میرو پاشایان و داوای لێدەکردن ئـەوان گوایـە خەونـە خۆشەکانی « شاری ڕۆژ » بهێننە دی ، واتە بێ ئەوەی بزانێ کلیلی گۆڕی خۆیانی دەدانێ ! .

لەگەڵ ئەوەشدا تۆمازۆ کامپانێللا یەکێکە لە پێشەنگـە ـاودارەکانی ڕێبازی « سۆشیالیزمی یوتۆپی » کە کاری زۆری کردە سەر بیروڕای ئەوانەی دوای خۆی ئەو ڕێگەیەیان گرتە بەر . « شاری ڕۆژ » وەرگێڕدراوەتە سەر گەلێك زمان و دەیان جار تاوەکو ئێستە لەچاپ دراوەتەوە[35] .



## مونزێرو ئەوانی تر :

بیروباوەڕی « سۆشیالیـزمی یوتـۆپی » لە ئینگیلتەرەو ئیتـالیادا نـەگیرسـایەوە ، بێجگـە لەوان سـەری لە چـەنـد مەڵبەندێکی تری ئەوروپای ڕۆژئاوادا هەڵدا . تۆماس مونزێر[36] تاکە پێشەنگی ئەو ڕێبازەیە کە لە ڕۆژگاری ڕێنیسانسدا ویستی بەزەبری شمشێر ئالای یەکسانی داچەسپێنێ .

تـۆماس مـونـزێـر دەوروبـەری سـاڵی 1470 لە شـاری شتۆلبێرگی ئەڵەمانیا لەدایك بوو . زانکۆی لایپزگ و فرانکفۆرتی تەواو کردو یـەکێك بـوو لە خوێنـدەوارە هەرە زیـرەکەکـانی ئەڵەمانیای ڕۆژگاری ڕێنیسانس[37] . هەر زوو دەرکی ناتەواییی‌یە زۆرەکانی کڵێسەی کردو بووە لایەنگری بزوتنەوەکەی مارتن لۆتەری بەناوبانگ[38] ، بەلام ئەو لە سەرنجەکانیدا دەربارەی چاککردنی کڵێسە گەلێك لە لۆتەرو هاوەڵەکانی شۆڕشگێرتر بوو بۆیەکا زۆر زوو لێك دابڕان و مونزێر کەوتە لومەو ڕەخنەگرتنی ورد لە لۆتەر کە بە پیاوێکی مەرایی‌کەری دادەنا[39] .

بەلای مونزێرەوە دەبوو بزوتنەوەی چاکـکردنی ئایـین هەموو ڕووەکانی ژیان ، نەك کڵێسە بەتەنها بگرێتەوە . دەیگوت ئـەوانەی پـاروە نانی هـەتیوو هـەژار زەوت دەکەن دوژمنی

یەکەمی خوان و دەبێ چەکیان لە ڕوودا هەڵگیرێ . مونزێر داوای دامەزراندنی ڕژێمی بێچەوسانەوەی دەکرد .

تۆماس مونزێر باش بۆ ئەوە چووبوو کە چەوساوان تیغی کوشندەی ڕژێمی زۆرداریێن بۆیەکا ڕووی دەمی تێدەکردن و بۆ خۆی تێکەڵیان دەبوو . زۆر جار شان بە شانی جوتیارانی ئەڵەمانیا دەچووە کێڵگەکان و بەدەم کارەوە قسەی بۆ دەکردن و بۆ شۆڕش هانی دەدان . مونزێر بەم جۆرە ئایین و ژیانی تێکهەڵکێش دەکرد :

**« بڕوانن چۆن میران و ئاغایان بوونەتە هۆی بلاوبوونەوەی سوو سەلەم و دزی و جەردەیی . چی نەما ئەوانە بۆ خۆیانی زەوت نەکەن ، دەبێ ماسیی ناو ئاوو مەلی ناو ئاسمان و هەموو ڕووەکی سەرزەمین بۆ خۆیان بێ . ئینجا دوای ئەوەش بەناوی یەزدانەوە داوا دەکەن کەس دزی نەکات ... ئەو دڵڕەقانە پێستی جوتیاری بەسزمان و پیشەگەرو هەموانیان کەوڵ کردووە ... »[40] .**

مونزێر لە کاتی شەڕی گەورەی جوتیاراندا دوورەپەرێز نەوەستاو ئازایانە لەتەك شۆڕشگێڕاندا چووە جەنگەی خەباتەوەو تا بە برینداری نەکەوتە دەست دوژمن دەستی لەچەك بەرنەدا . پاش ئەوەی دەرەبەگان چەند ڕۆژێك لەسەر یەك بەبەرچاوی خۆیانەوە خستیانە ژێر فەلەقەوە بێ ئەوەی ورتە بکات ئینجا بە ئەوپەڕی ڕقەوە داخی دڵی خۆیان پێ ڕشت و ڕۆژی 27 ی مایسی ساڵی 1525 لەتوکوتیان کرد . بەلام ئەوان ناویان ون و تۆماس مونزێر ناوی زیندووە .

لە فەرەنسەش ژمارەیەك ڕووناکبیری ئەو ڕۆژگارە کەوتنە سۆراخی یەکسانی بۆ ئەندامانی کۆمەڵ . نووسەری بەناوبانگ فرانسوا ڕابلێ ( 1494 — 1533 ) لە نووسینە کانیدا [41] بەگەرمی دژی چەوساندنەوە وەستاو وێنەی دەرەبەگانی ئەوسای وەك پیاوی دڵڕەق و ورگن و چاوچنۆك و مەیخۆر بۆ کێشاوین[42] .

هەرچی نووسەری فەرەنسی سیرانۆ[43] بوو ( 1619 — 1655 ) تەواو کەوتبووە ژێر کاری سەرنجەکانی کامپانێلاوە ، تەنانەت ناوی بەرهەمەکانیشی وەك ئەو هەڵدەبژارد . ئەویش خوێنەر لەگەڵ خۆی دەباتە ئەو بەهەشتانەی دانیشتوانیان لە خۆشی و دڵسۆزی و برایی بەولاوە هیچیتر نازانن . سیرانۆ یەکێك لەو بەرهەمانەی ناو ناوە « جیهانێکی تر یا مێژووی کۆمیدیی دەوڵەتانی مانگ » و یەکێکیانی تری ناو ناوە « مێژووی کۆمیدیی دەوڵەتانی ڕۆژ » . لەو بەرهەمانەیدا مرۆ دەگاتە مانگ و ئەستێرەی ترو لەوێ بەچاوی خۆی دەبینێ چۆن هەموان لە سایەی یەکسانیدا حەواونەتەوە . پلەی زانست و ئاشتیپەروەری لای سیرانۆ یەکجار بەرزە .

جیرارد وینستێنلیش[44] کە یەکێك بوو لە نووسەرانی ئینگلیتەرەی نیوەی یەکەمی سەدەی حەقدەمین ( 1609 — 1652 ) لە بەرهەمەکانیدا بەگەرمی داوای نەهێشتنی چەوساندنەوەو بلاوکردنەوەی یەکسانی و ڕوخاندنی ڕژێمی پاشایەتیی دەکرد .

« یاسای سەربەستی »[45] شاکاری وینستێنلی یە کە ویستی لە ڕێگەیەوە فەرمانڕەوایانی نوێی ئینگلیتەرە بۆ لەناوبردنی خاوەنێتی تایبەتی هان بدات[46] .

هەرچەندە جێبەجێکردنی ئاواتە بەرزەکانی دەستەی یەکەمی ڕێبازی « سۆشیالیزمی یۆتۆپی » لەبەر گەلێك هۆی تێکهەڵکێش کارێکی ئاسان نەبوو ، بەلام گرنگ ئەوەیە کەس بە ڕادەی هەڵگرانی ئالای ئەو ڕێبازە لە ئەرکەکانی قۆناغ نەگەیشت و وەك ئەوان بۆ چارەسەر کردنیان نەچوو . شەقڵی گەلێك لە سەرنجە وردەکانی ئەو ڕووناکبیرانە ڕەنگی لە بیروباوەڕی ڕێبازی داهاتووی سۆشیالیدا دایەوە . بێگومان نەمری ئەوان و هاوەڵەکانیان لەوەوە هاتووە کە کاتی خۆی بە وردی لە ئەرکەکانی قۆناغ گەیشتن .

**دوا وشە :**

---

مەبەستی بەرودوای ئەم زنجیرە وتارەم ئەوەیە بڵێم تاقیکردنەوەکانی ڕۆژگاری زیندووی ڕێنیسانس بۆیان هەیە ببنە پەندو دەرسی پڕمانا بۆ هەموو ئەدیبێکی لێهاتووی جیهانی پان و بەرینی ئیمڕۆو دوارۆژ . ئەگەر بێکەس و جاف و هەلەت و مزوری و پەشێو مستەفا و میسری و ڕەوف و مەم و مەنمی و بەدری و بێگەردو حسەین و کاوس و ئیحسان و عاقرەیی و خورشیدەو ئەختەرو هێرۆو سیامەنسوری و قەرەداغی و

عەبدوڵلاو سندی و فندی‌و عیزی‌و حەمە فەریق‌و بۆتانی‌و کاکە حەمەو برا خامە زێڕینەکانی ترمان وەك ئـەدیبانی ڕۆژگـاری ڕێنیسانس لە ئەرکەکانی قۆناغ نەگەن‌و وەك ئەوان چاونەترس‌و لەخۆبوردوو نەبن ئەوا بێ گومان نە دەچنە ناخی دڵی کەسەوەو نە دەچنە خانەی نەمرییەوە کە دانتێ‌وتـەنی هەزار سـاڵی ژیان لە ئاستیدا تروکەیەکە !!

## پەراوێزەکان :

(1) خوریی ئینگیلتەرە لە جیهاندا کەم هاوتایە . تەڕوتووشیی ئاووهەواشی مەرجێکی باشی پیشەسازیی کوتالە .

(2) بڕوانە :
یو .م . ساپریکین ، سەرەتای پێشکەوتنی سەرمایەداریی لە ئینگیلتـەرەدا ، ـ «مێژووی جیهان» ، بە زمانی ڕووسی ، بەرگی چوارەم ، مۆسکۆ ، 1958 ، ل 314 .

(3) Robert Ket

(4) «مێژووی سەدە ناونجی‌یەکان» ، بە زمانی ڕووسی ، بەرگی دووەم ، مـۆسکۆ ، 1966 ، ل 222 — 224 .

(5) Thomas More .

(6) باوکی تۆماس مۆر دادکارێکی بەناوبانگ بوو .

(7) س . ب . کان ، مێژووی بیری سۆشیـالیزمی ، بـە زمانی ڕووسی ، مـۆسکۆ ، 1967 ، ل 14 . (لەمەودوا : S.B.Kan) .

(8) H.H.Hudson, The Epigram in the English Renaissance, New York, 1966, pp. 30 — 31, 43.

(9) لە نووسینەکانیدا ئێـرازمۆسی ڕۆتـەردامی گەلێـك لایەنی پـرشنگداری ژیـان‌و ڕەفتاری تۆماس مۆری بۆ تۆمار کردووین . وەك هاوڕێیەکی نزیك ، ئێرازمۆس لە نزیکەوە تێکەڵ بە خێزانی مۆر بوو .

(10) هێنری حەوتەم لە ساڵی 1413وە تاوەکو ساڵی 1509 باشای ئینگیلتەرە بوو .

(11) ي .ن . اوسینۆفسکی ، ڕێبازی سیاسی کتێبی «ڕیتشاردی سێیەم»ی تۆمـاس مـۆر ، «ئەوروپـاس سـەدە نـاوبخی‌یـەکـان . ژیـانی ئـابـووری‌و سیـاسی‌و ڕووناکبیریی» ، بە زمانی ڕووسی ، مۆسکۆ ، 1972 ، ل 418 .

(12) H.H.Hudson, Op. Cit. P.41

(13) ساڵی 1523 تۆماس مۆر ئەو وتارەی خوێندەوە کـە تا ئیستـەش لەگەڵ بـەڵگە دێرینەکانی پەرلەمانی بەریتانیدا هەڵگیراوە .

(14) H.J. Grimm, The Reformation Era 1500 — 1650, P.70, ((Renaissance and Reformation 1300 — 1640)), PP. 66 — 67.

(15) ئەوساکە هەر کەسێك بە دوژمنایەتی پاشا تاوانبار بکرایە سەری دەقـرتێنراو توڕدەدرایە ناو ئاوی تایمسەوەو ئینجا زۆر بێ‌شەرمـانە جـەرگ‌و ڕیخۆڵەیـان دەردەهێناو بێ ئاگاداریی کەسوکاری بەجیا لاشەکەیان دەناشت ... ئای مێژوو کە بەکەڵکی چونکە هەموو ڕاستی‌یەك تۆمار دەکەیت ! .

(16) S.B.Kan, Op. cit., P.16, تۆماس‌مور ، یوتوبیا ، ترجمة وتقـدیم الدکتور انجیـل بطرس سمعان ، القاهرة ، 1974، ص 36 .

(17) ((Renaissance and Reformation 1300 — 1648)), P. 74. ئەوە قسەی تۆماس مۆر خۆیەتی کە لە بەندیخانەوە بۆ مارگرێتی کچی نووسیوە .

(18) ڕیتشاردی سێیەم (1452 — 1485) ساڵی 1483 بووە پاشا . پیاوێکی دڵ‌ڕەق بوو ، دەستی چووە گیانی یەکێك لە براکانی‌و ژنێکی خۆی دەرمان‌خوارد کرد . یەکێك لە درا ماکانی شکسپیر باسی ژیان‌و ڕەفتاری ڕیتشاردی سێیەم دەکات .

(19) E.N. Osinovsky, Op. cit. , P. 407

(20) ((وا پێ دەچێ دەوروبەری ساڵی 152ە تەواوی کردبێ .

(21) ئیفلاتۆن لە سەدەی چوارەمی پێش عیسادا عەودالی دامەزراندنی کۆمەڵێکی یەکسان بوو . نووسەری گریکی ئیمبۆل (یا یامبول) دوای ئەو بە نزیکەی دوو سەدە باسی دوورگەیەکی بەختەوەری کردووە کە دانیشتوانی چەوساندوەیـان نەزانیوە .

(22) ي .ي . فێرتسمان ، ژیانی ڕووناکبیریی ڕێنیسانس لە ئینگیلتەرە ، ـ «مێژووی جیهان» (بە زمانی ڕووسی) ، بەرگی چوارەم ، مۆسکۆ ، 1958 ، ل 345 .

(23) بە عەرەبی : الاشتراکیة الطوباویە . «طوبی» بە واتای بەهەشت دێت .

(24) وەك هەڵوەستی بەرامبەر بزوتنەوەی چاك کردنی ئایین کە بەچەشنی ئێرازمۆسی هاوەڵی نزیکی دژی وەستا . هەروەها چەند دیاردەیەکی دواکەوتـووی سەدە ناونجی‌یەکان کەمێك لە تریفەو پرشنگی کەم‌هاوتای دێرە نازدارەکانی «یوتۆپیا»یان کەم‌کردۆتەوە . وێڕای ئەوانەش تۆماس مۆر «یوتۆپیا»ی بە زمانی لاتینی دانا نەك بە زمانی نەتەوەیی ، واتە ڕووی دەمی کردە دەستەی سەرەوەی کۆمەڵ کە ئۆباڵی کەموکورتێکانی ژیانی گەلیان کەوتبووە ئەستۆوە . «یوتۆبیا» ساڵی 1516 بۆ یەکەم جار بە لاتینی بەم ناوەوە چاپکرا :
((Libellus aureus... de optimo rei publicae statu deque nova insula Utopia))
زۆری نەبرد «یوپیا» وەرگێڕدرایە سەر زۆربەی زمانە ئەوروپایێکان‌و تا ئیمرۆکە بەدەیان جار چاپکراوەتەوە .

(25) Tommaso Campanella بەر لەوەی ببێتە فەرمانبـەری کڵێسە نـاوی جوڤـانی دۆمێنیکۆ بوو .

(26) E. Grain, Italian Humanism . Philosophy and civic life in the Renaissance, translaed by P. Munz, Oxford, 1965, P.50.

(27) S.B. Kan, Op. cit., P. 23

(28) زانای گەورەی ئیتالیایی گالیلۆ گالیلی (Galilei) (1564 — 1642) لە فیزیاو میکانیك‌و ئەستێرەناسی‌و ئەدەب‌و ڕەخنەو شیعردا دەستی باڵا بوو . ڕاکانی کۆپەرنیکۆسی دەربارەی خرپیی زەوی‌و سووڕانەوەی بەدەوری ڕۆژدا سەلماند .

(29) کاردینال ریشلیۆی بەناوبانـگ (1585 — 1642) لە ساڵی 1624وە بـووە سەرەك وەزیرانی فەرەنسە کە لە سەردەمی ئەودا لە هەموو ڕوویەکەوە باش بەرەوپێش چوو .

(30) کامپانێلا ، شاری ڕۆژ ، چاپی ڕووسی ، مۆسکۆ ـ لێنینگراد ، 1947 .

(31) أ . خ . گۆفونکیل ، دەسنووسێکی نەزانراوی تۆمازۆ کامپانێلا ، ـ «ئەوروپای سەدە ناونجی‌یەکان» (سەرچاوەی ناوبراو) ، ل 363 — 364 .

(32) کامپانێلا ، شاری ڕۆژ ، ل 61 .

(33) مەبەستی نەخوێندەواری‌و زۆرداری‌یە .

(34) أ . أ . ئەبرامسۆن‌و س .د . سکازکـین ، ئیتالیـای سەدەی شـانزدەمـین ، ـ «مێژووی جیهان» ، بەرگی چوارەم ، ل 120 .

(35) ساڵی 1623 بۆ یەکەم جار «شاری ڕۆژ» بە زمانی ئیتالیایی لەچاپ درا .

(36) T . Munzer

(37) H. J. Grimm, Op. cit., pp. 172 — 173

(38) دەربارەی سەرنجـەکانی مـونزێـر بڕوانـە : ((Renaissance and Reformation 1300 — 1648)), pp. 166 — 16g .

(39) م .م . سمێرن ، چاككردنی ئایین‌و شەڕی گەورەی جوتیاران لە ئەڵەمانیا ، ـ «مێژووی جیهان» ، بەرگی چوارەم ، ل 161 .

(40) D.S.Skazkin, Op. cit., Vol. II, P.83

(41) F. Rabelais

(42) V.F. Simeonov, Op. cit. , P. 492

(43) Cyrano de Bergerac

(44) Winstanley

(45) ((The Law of Freedom)) ساڵی 1652 بۆ یەکەم جار چاپ کرا .

(46) S. B. Kan, Op. Cit., pp. 26 — 29

كەریم شارەزا

# پەندی پێشینان

## لە روانگەی دوو زانستەوە

هەندێ لە نووسەرانی کورد ، لەم ساڵانەی دواییدا بەخەی ئەو نووسەرانە دەگرن کە پەندی پێشینانی کوردییان کۆکردۆتەوە یان لە سەریان نووسیوە ، لە سەر ئەوەی هەندێ جار پەندی پێشینانیان تێکەڵاو بە [ ئیدیۆم : Idiom : کنایة ] یاخود بڵێین فریزیۆلۆژی ( phraseology ) کردووە .

بۆیە لەم نووسینەمدا دەمەوێ رووناکییەك بخەمە سەر ئەم بابەتە تێکەڵاوەو ، بە پێی تێروانینێکی زانستییانە ئەم مەسەلەیە روون بکەمەوە .

پەندی پێشینان بە شێوەیەکی گشتی ، لە راستییەکی ئاشکراو بەرچاوەوە دەدوێ کە بە شێوەیەکی کورت و ئاسان و رێکوپێك دارژاوە تاکو زۆرترین کەس لە جەماوەری خەڵك تێی بگەن .[1]

بە رای هەندێ لە نووسەرانی دیکەش ، پەندی پێشینان دەنگی میللەت و پوختەی مێژووو فەلسەفەی بەرامبەر بە دیاردە سروشتییەکان و ژان و ئازاری رۆژانەیەتی ، لە پشتێکی کۆنەوە بۆ نەوەیەکی نوێ کۆمەڵ دەگوێزرێتەوەو[2] ، هەر ئەو نووسەرە لە بارەی خاسیەتەکانی پەندی پێشینانەوە ، راو بۆچوونەکانی نووسەری عارەب « ابراهيم النظام »[3] بەرامبەر بە خاسیەت و نیشانەکانی پەندی پێشینانمان بۆ دەخاتە روو و دەڵێ : ـ

لە پەندی پێشینان « الأمثال » دا چوار رەگەزی سەرەکی کۆدەبنەوە کە لە قسەی تردا هەستیان پێ ناکرێ و ئەم چوار رەگەزەش ئەمانەی خوارەن .

(1) . کورت بڕی (2) . مانا پێکاندن (3) . جوانیی لێکچواندن . (4) . درکە ( کنایە ) پێکەوەنانێکی سەرکەوتووانە

بە پێی خاسیەتی چوارەم ، دەتوانین بڵێین هەموو پەندێکی پێشینان رەگێکی ئیدیۆمی یاخود بڵێین رەگی فریزیۆلۆژیی تێدایە ، ئەم خاسیەتەش وا لە هەندێ نووسەران دەکات بڵێن : « هەر قسەو پەندێکی پێشینان خۆی لە ئیدیۆم بدات جارێکی تر نابێ بخرێتەوە ناو پەندی پێشینان ؛ چونکە ( کنایە ) لە خانەی [ زانستی رەوانبێژی ] یەو پەندی پێشینانیش لە خانەی [ زانستی فۆلکلۆر ] ە .

هەرچەندە هەندێ لە نووسەرە پسپۆرەکانی زمانی کوردیمان و یەك لەوانە « دوکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف » ، دەڵێت : ـ

« هەندێ لە زانایانی زمان [ پەندی پێشینان و قسەی نەستەق ] یش هەر بە فریزیۆلۆژی دەدەنە قەڵەم .[4] » ئینجا لە دوای ئەمەدا دەڵێ : « بێگومان پێویستە پەنجە بۆ ئەوە رابکێشین ، کە دەتوانرێ هەندێ لە پەندی پێشینان و قسەی نەستەق لە ریزی فریزیۆلۆژی دابنرێن، ئەویش بەتایبەتی ئەوانەی لە سنووری پێکهاتنی فریز دەرنەچوون.[5] »

بەلام لە دوای وەرگرتنی هەندێ لە راو بۆچوونەکانی « دکتور ممدوح حقي » و « ابراهيم النظام » کە لە کتێبەکەی « المثل المقارن » دا هاتوون و

لەمەوبەر دەرمان برین ؛ دەتوانین بلێین زۆربەی هەرە زۆری پەندی پێشینان رەگێکی فریزیۆلۆژی [ الكنايه ] ی تێدایە بەلام مەرج نی یە نی یە هەموو فریزیۆلۆژی یەك پەندی پێشینان بێ .

بۆ نموونە : پەندی پێشینانی [ دەستی ماندوو لە سەر زگی تێرە .[6] ] دوو مانا هەڵدەگرێ ، یەکەمیان : پەیوەندی بە مانای راستەوخۆی وشەکانی یەوە هەیە ، واتا : « دەستی ماندوو دەخرێتە سەر زگێکی تێر » . مانای دووەمیشی کە مەبەستەکەیەتی ئەوەیە : « هەر کەسێکی رەنج بدات و کار بکات ، بەری ئەو رەنجەی وەردەگرێ » ، یاخود ئەگەر ئەم پەندە شی بکەینەوە کە دەڵێ : « ئەگەر گوڵ نیت درکیش مەبە .[7] » ئەمەیشیان دوو مانا هەڵدەگرێ ، یەکەمیان : مانای وشەکانی یەنی و مەبەستی ئەوەیە بڵێ : « ئەگەر وەکو گوڵ نەرم و نۆڵ و بۆن خۆش نەبی ، وەکوو درکیش ئازار بەخش مەبە . » مانای دووەمیشی ئەوەیە بڵێ : « ئەگەر چاکە و قازانجت نی یە ، با خراپە و زیانیشت نەبێ . » کە ئەمە مەبەستی پەندەکەیە .

بەلام هەموو فریزیۆلۆژی یەك [ ئیدیۆم : الكنايه ] پەندی پێشینان نی یە ، وەك ئەم نموونانەی خوارەوە : -

(1) . [ ئاگر بارانە ] واتا : شەڕو تەقەو فەرتەنەیە .

(2) . [ خانە بێزارە ] واتا : ناکەوێتەوە ماڵ و هەمیشە لەم لاو لەو لایە .[8]

(3) . [ پشت ئەستووری [10] ] واتا : بە پشتیوانی و پشت قایمی .

من لێرەدا رایەکی دیکە لە لای خۆمەوە دێنمە گۆڕێ و دەڵێم : - « ئەگەر لە روانگەی زانستی فولکلۆرەوە تەماشای پەندی پێشینان بکەین ، دەبینین دەکەوێتە خانەی زانستی

ئەدەبی فولکلۆری یەوەو ئەگەر لە روانگەی « زانستی رەوانبێژی » یشەوە سەیری بکەین ئەوا سەبارەت بە بوونی رەگی [ ئیدیۆم = کنایة ] و بەخشینی پتر لە مانایەك دەکەوێتە خانەی رەوانبێژی « البیان » کە ئەمەش بەشێکی سەرەکی یە لە زانستی ی رەوانبێژیدا ؛ وەك ئەم پەندانەی خراونەتە ناو کتێبەکەی [ ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا ] ی مامۆستا « جەلال مەحموود عەلی » کە دەڵێن : -

(1) . سەگی کونە ماسی یەو پاسی جرتاوا دەکات .[11]

(2) . دەستی بە کلاوەکەی خۆیەوە گرتووە با نەیبات .[12]

(3) . سیروان لێشت نەدەم هەر دەم بەیت .[13] وە یاخود ئەو پەندەی کە لە کتێبەکەی [ ئیدیەمێت ] ی مامۆستای خوا لێ خۆشبوو [ صادق بەهائەدین ئامێدی ] دا هاتووە دەڵێ: -
[ ئاڤا خورتا سەرنەفراز چۆن [14] ] ئەمەش لە دیالێکتی کرمانجی خوارووودا بەم جۆرە هاتووەو دەڵێ : « ئاوی زۆردار سەر بەرەو ژوور نەڕوا .[15] »

ئەو نووسەرانە حەقی خۆیانە کە وایان کردووەو ، هەندێ جار ، پەندی پێشینانیان خستۆتە پاڵ ئیدیۆم ، چونکە نابێ ئەو حیسابەیان لەگەڵدا بکەین و بلێین مادامکی پەندی پێشینانن نابێ بچن بەلای ئیدیۆم ( کنایة ) وە ، یاخود ئەگەر بە ئیدیۆممان دانان نابێ جارێکی تر بخرێنەوە پاڵ پەندی پێشینان ، چونکە بەپێی ئەو تێڕوانینەی لەمەوبەر روونمان کردەوە ، هیچ گرفتێکمان لە پێشدا نی یە ئەگەر « پەندی پێشینان » کە ئەدەبێکی فولکلۆری یە ، بکەین بە نموونەی جۆرێك لە جۆرەکانی رەوانبێژی کە ئیدیۆم ( کنایة ) یەو لە خانەی زانستی زمانی دابنێین .

لەو کاتەی کە مامۆستا جەلال مەحموود دەڵێ : [ ئیدیۆم ئاوێنەی رووی کۆمەڵ ، بە باری چاك و خراپیەوە ، لە رووی کشتوکاڵ و پیشەسازی و زانست و باوەڕو ئایین و ئەفسانەو مێژووو گەلێك رووی ترەوە .[16] ] .

من دەتوانم ئەم پێناسەو خاسیەتانەی ئیدیۆم بکەم بە پێناسەو خاسیەتەکانی ( پەندی پێشینان ) بەلام کەی ؟ لە وەلامدا دەڵێم دوای ئەو کاتەی کە روانگەی زانستەکە لە رەوانبێژی یەوە دەگۆڕم بۆ فولکلۆر

بەلام کە نووسەر پتر لەسەر خاسیەتەکانی ئیدیۆم دەڕوات و دەڵێ : - « لەگەڵ پەندی پێشینان و خوازەو لێکچواندنە فولکلۆری یەکاندا

خشڵی رازاندنـەوەی زمانی کـوردین ، ئـاوێنــەی پلەی بــەرزیی‌و جــوانی‌و بــەتوانـایی‌و زینـدوویی‌و پێشکـەوتنی زمانەکەن . [17] »

لێـرەدا دەوەستم‌و دەگەڕێمـەوە سەرەتای ڕایەکەی نووسەرو ناو هێنانی « پەندی پێشینان » و جیاکردنەوەیٚ لە ئیدیۆمی ( كناية ) . ڕاستـە ئیدیـۆمی کنایەو خوازەو لێکچواندن ( چ ئاسایی بێ‌و چ فولکلۆری ) هەموویان بـابەتی زانستی ڕەوانبێژین ، کەچی « پـەندی پێشینـان » وەك گوتمـان بـەشێکـە لە زانستی فۆلکلۆرو مەیدانی لێکۆڵینەوەی جودایە . بەلاّم کاتێ وەك نموونەی لقێك لە لقەکانی زانستی ڕەوانبێـژی سەیـر کرا ، دەبینین دەچێتەوە بن باڵی ئیدیۆمی [ کنایە ] .

بۆیە دەڵێم دەبـوایە نـووسەر لە پێناسەکەی ئیدیۆمدا نـاوی ( پەنـدی پێشینان ) ی وەك بابەتێکی سەربەخۆ لە ئیدیۆم نـەهێنـابایـە ، ئـەوا هیـچ ڕەخنـەیەکی لێ نـەدەگیـرا ، چـونکـە نووسەر خۆیشی لە کتیبەکـەیدا ئـەگەر نەڵێم بە سەدان ، بەلاّم دەتوانم بڵێم بە دەیان « پەندی پێشینان » ی خستۆتە ناو دوو تۆی بەرگی کتیبە گەورەکەی‌و بـۆ نمـوونـە چـەنـد پـەنـدێکیـان لێ دەستنیشان دەکەین وەك ئەمانە : ـ

(1) . ئاش لە خەیاڵێك‌و ئاشەوان لە خەیاڵێك ... ل 38:

(2) . ئەسپێ ئەکوژن لە دەوری لەباتی کولێرە چەوری ... ل : 47

(3) . ئەو کانییەی ئاوی لێ دەخـۆیتەوە بەردی تێ مەهاوێ ... ل : 52

(4) . بۆیە پێت دەڵێم کاکە ، چۆلەکەم بۆ بگریت ... ل : 98

(5) . ئینسان گا نییە هەر لە پێستێکـدا بمێنێتەوە .... ل : 56

(6) . خوا غەزەب لە مێرووله بگرێت باڵی لێ پەیدا ئەکات .... ل : 180

بەلاّم لەو کاتـەی کە [ دوکتـۆر نەسرین فەخری ] لە نووسینێکی دا بە ناونیشانی [ هەندێ زاراوەو ئیدیۆمەی ، لێکـۆڵینـەو لێکـدانــەوەی لە ڕووی زمـانەوە [18] ] ، کـۆمەڵێـك ئیـدیـۆمی کــورت‌و درێــژی لە ڕووی زمــانــەوە شی‌کردۆتەوەو لە سەریانی نـووسیوە ،

گـەلێ ( پـەنـدی پێشینــان ) ی وەکـو [ ئـەسپێ لە باخـەڵیا سـەوزەڵێ کیانم دەڵێ ... ل : 75 [19] ] و [ بــە دەسـتی خـەڵك مار ئـەگرێ .... ل : 79 [20] ] و [ بچێتە سەر سیروان وشکی ئەکا ... ل : 79 [21] ] و [ ئەدی‌و بدی کوڕێکیان بوو ناویان لێنا سەلکە کودی ... ل : 95 [22] ] ، لەگـەڵ ئەم پـەندانـە گەلێ ئیـدیۆمی کورتی لە ئەنجامی لێکچوواندن دروست بووی وەك : [ ئەڵێی چاوی قرژاڵە ... ل : 72 ] و [ ئەڵێی هەوری بەهارە ... ل : 75 ] یاخود ئیدیۆمی سیفەتی‌ی وەکوو [ پـووڵەکـی‌یـە ... ل : 80 ] و [ تـەڵەکـەبـازە ... ل : 82 ] ی بـەکـارهێنـاوە ، هیـچ ڕەخنـەییکی لێ ناگیرێ چـونکە بـاسەکـەی هەمـووی لەســەر زاراوەو ئیـدیـۆمــە لە ڕووی زمانەوە ، واتا : لە ڕووی زانستی زمان‌و ڕەوابنێـژی ـ یەوە ، ئـەوانـەی بـەر چـاویشت کـەوتن چ کـورت‌و چ درێـژ هەموویان خۆیـان لەناو چـوار چێوەی ئیدیۆمەوە دەدۆزنەوە بام زۆربەشیان لە فۆلکۆرەوە وەرگیرابن وەك نموونە نەك وەکوو بابەتێکی سەربەخۆ .

هەر بەم پێ‌یە مامـۆستا عـەزیز گـەردی نـووســەری [ ڕەوانبێـژی لە ئـەدەبی کوردیـدا ] ، کە دێتـە ســەر بابەتی [ درکە : الكناية [23] ] هەنـدێ نموونەی فۆلکۆری وەکـوو [ لە گوێی گـادا نووستـوون [24] ] دێنێتـەوە کـە پەندێکی پێشینانمانـەو مانـای دووری [ غەفڵەت‌و بێ ئاگـایی ] دەدات [25] . بەلاّم ئەم بەکار هێنانەی مانای ئەوەنیە پەندەکە کەوتە ناو چوار چێوەی زانستی ڕەوانبێژی‌و جارێکی دیکە نابێ ببرێنەوە بــە لای زانستی فـۆلکـۆرو پــەنـدی پێشینان.

ئـەم دیـاردەیــەی لێـك نــزیـك بـوونەوەو کـەوتنە نـاو یەکی پـەنـدی پێشینان‌و ئیدیۆم ( كناية ) هەر لە زمانی کوردیدا کێشەی لەسەر نە خوڵقـاوە ، بـەلکوو لە نـاو زمـانـانی تـریش ئـەم کێشەیەی پەیدا کردووە . بۆ نمـوونە : ئەگەر لە زمانی عارەبی‌دا بـە کەمێـك ورد بوونەوە سەیرێکی ئـەو دیاردەیـە بکەین بە ئاسانی بۆمان دەر دەکەوێ و دەبینـین زانایـانی زانستی ڕەوانبێژی ( البلاغة ) ی عـارەبی بـە زۆری لە بواری بابەتی [ درکە = ئیـدیۆم =

کنایە ] دا نموونەیان لە پەندی پێشینانو قسەی نەستەق وا ] (الامثالو الحكم ) هێناوەتەوە چونکە لە خۆیانەوە ڕەگی ئیدیۆمیان تێدایە و ، بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم ڕایەمان با یەك دوو نموونە بهێنینەوە تا خوێندەواری بەڕێز باشتر ئاگاداری ئەم ڕاستییە بێ ، کە لە پەندی عارەبیدا دەڵێ : [ لایثمر الشوكُ العنب .[26] ] و لە پەندی کوردیشدا دەڵێ [ درك ترێ ناگرێ .[27] ] ، لە لایەك پەندی پێشینان ( المثل ) ە و سەر بە زانستی فۆلکلۆرەو ، لە لایەکی تریشەوە [ ئیدیۆم = کنایە ] یە ، چونکە دوو مانا دەبەخشێو مانا دوورەکەی ئەوە دەگەیێنێ « خراپە چاکەی لە جێ شین نابێ . » ، وەکە لە ( مثل ) ێکی تری عارەبیدا دەڵێ :

[ إيّاكِ اعني واسمعي يا جارة [28] ] کە لە کوردیدا ئەم پەندەی بەرامبەر دەوەستێو دەڵێ : ـ « بووکێ لەگەڵ تۆمە خەسوو گوێت لێبێ .[29] » ئەمەشیان لەلایێك پەندی پێشینانەو سەر بە زانستی فولکۆرەو لە لایێکی تریشی ئەگەر لە ڕوانگەی زانستی ڕەوانبیژییەوە سەیری بکەین دەبینین ئیدیۆمی کینایەیەو مانا دوورەکەی ئەوەیە : قسەیەك بە یەکێکی نزیك بڵێیو مەبەستیشت تێگەیاندنی یەکێکی تربێ .

خوێندەواری بەڕێز ... ئەمە بوو چەند بیرو ڕایەکمان بەرامبەر بە پەندی پێشینان لە دوو ڕوانگەی زانستی جیاوازەوە ، لە ڕوانگەی زانستی فولکلۆرەوەو لە ڕوانگەی زانستی ڕەوانبیژییەوە ، هیوادارم توانی بێتم چەند ڕاستییەکی ئەدەبی فولکۆریو ڕەوانبێژی ئەدەبی بۆ ئێوەی خۆشەویست ڕوون بکەمەوە .

## پەراوێزو سەرچاوەکان

(1) ـ الكزاندر هكرتيي كراب ـ علم الفولكور ـ ترجمة : رشيدی صالح ، القاهرة 1967 ، ل : 240

(2) ـ د . ممدوح حقي ـ المثل القارن ـ بيروت : 1973 ، ل : 18

(3) ـ هەمان سەرچاوە ، ل : 18

(4) ـ د . ئەورەحمانی حاجی مارف ـ وشەی زمانی کوردی ـ بەغدا 1975 ، ل : 66

(5) ـ هەمان سەرچاوە ، ل : 66

(6) ـ ئیسماعیل حەقی شاوەیس ـ قسەی پێشینان ـ بەغدا 1933 ، ل : 14

(7) ـ خاڵ ـ پەندی پێشینان ـ ج ٢ ، بەغدا 1971 ، ل : 35

(8) ـ جەلال مەحموود عەلی ـ ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا ـ بەغدا 1982 ، ل : 38

(9) ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل : 172

(10) ـ د . ئەورەحمان حاجی مارف ـ وشەی کوردی ـ بەغدا 1975 ، ل : 64

(11) ـ جەلال مەحموود عەلی ـ ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا ـ بەغدا 1982 ، ل : 318

(12) ـ هەمان سەرچاوە ، ل : 207

(13) ـ هەمان سەرچاوە ، ل : 325

(14) ـ صادق بەهائەدین ئامێدی ـ ئیدیەمێت کوردی ـ بەغدا 1973 ، ل : 5

(15) ـ خاڵ ـ پەندی پێشینان ـ ج ٢ ، بەغدا 1971 ، ل : 24

(16) ـ جەلال مەحموود عەلی ـ ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا ـ بەغدا 1982 ، ل 18 هەروەها بڕوانە ـ د . نسرین فەخری ـ گۆڤاری کولێجی ئەدەبیات ، بەغدا ژ 19/1976 ، ل :97

(17) ـ جەلال مەحموود عەلی ـ ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا ـ بەغدا 1982 ، ل : 18

(18) ـ د . نسرین فەخری ـ گۆڤاری کولێجی ئەدەبیات ژ : 19 ساڵی 1976 .

(19) ـ خاڵ ـ پەندی پێشینان ـ ج ٢ ، ل : 29

(20) ـ هەمان سەرچاوە ، ل : 106

(21) ـ هەمان سەرچاوە ، ل : 81

(22) ـ پەندێکی پێشینانە لە ناوچەی هەولێرو دەوروبەری زۆر بڵاوە .

(23) ـ عەزیز گەردی ـ ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا ـ ب ١ ، بەغدا 1972 ، ل : 88

(24) ـ خاڵ ـ پەندی پێشینان ، ج ٢ ، بەغدا 1971 ، ل: 401

(25) ـ عەزیز گەردی ـ ڕەوابنێژی لە ئەدەبی کوردیدا ـ ب ١ ، بەغدا 1972 ، ل : 89

(26) ـ لويس معلوف ـ المنجد في اللغة والادب والعلوم ـ فرائد الأدب ـ ص938 1966

(27) ـ خاڵ ـ پەندی پێشینان ـ ج ٢ بەغدا 1971 ، ل: 212

(28) ـ لويس معلوف ـ المنجد في اللغة والادب والعلوم ـ فرائد الادب 1966 ، ص963

(29) ـ خاڵ ـ پەندی پێشینان ـ ج ٢ ، بەغدا 1971 ل: 95

# حاجی قادری کۆیی

## مامۆستاو رابەری نەتەوەی کوردە

**لە ژمارەی سێیەم گفتم بە خوێنەرانی هێژای « کاروان »دابوو کە رابەریو مامۆستایەتی حاجی قادر بۆ هەموو نەتەوەی کورد روونبکەمەوە، وەبەڵگەی ئەم بۆچوونەشم لەچەند وێنەیەکی هەڵبەستەکانی خۆی لە دیوانەکەی دەستنیشان بکەم .**

ناوبانگی حاجی لەوە دەرچووە کە هەوڵی پێناسینی بدەین، چونکە هەموو کوردێکی خوێندەوارو کوردشوناسێك شتێك دەربارەی حاجی دەزانێ ، ئەوەی لەم ووتارەدا دەمەوێ باسیبکەم ئەوەیە : ئایا حاجی قادر شوێنی راستەقینەی لە ناو چ دەستەی ناودارانی نەتەوەی کوردە ؟ هەر شاعیرە ؟ یان پێشەوایەکی شۆڕشگێری نەتەوایەتییە ؟ یان موسلحێکی کۆڵ نەدەری نەتەوایەتییە بۆ گەلی کورد ؟ یان رابەرو مامۆستای هەموو نەتەوەی کوردە ؟ یان فەیلەسوفێکی ئەندێشە قووڵو بیر تیژ بووە کە کەیینو بەینی ژیانی مرۆڤایەتی لێك دایتەوە لەسەر ئەم زەمینەو گەیشتووتە ئەنجامێکی روونو ئاشکرا دەربارەی باری ژیانی ئادەمیزاد ؟

بێگومان ئەگەر بە چاکی لە بیرو ڕای حاجی قادر وورد بینەوە کە لە ناو ئەوەندە شیعرانەی بە دەستمان گەیشتووە سەر هەڵدەدەن بۆ خوێنەری ووشیار ، ئەوەمان بۆ ساغ دەبێتەوە کە ئاکارێك لە هەریەك لەو شتانەی باسمان کردن لە شەخسیەتی حاجی قادر هاتووتە جێ ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حاجی بە پێشەوا نە ناسراوە ، وخۆشی لافی هەڵگرتنی ئاڵای ئەم ئەرکەی لێ نەداوە ، وە نەبیستراوە کە چ جەماوەرێك لە ژێر فەرمانی ئەودا چ جمو جوولێکیان کردبێ .

وەموسلیحێکی کۆمەڵایەتیش نەبوە ، چونکە لەناو جەرگەی کۆمەڵگای خۆی کە کوردستان خەباتێکی دوورو درێژی نەخستۆتە بەرخۆی کە خەڵکی وولاتەکەی خۆی بێنێتە سەر بیرو رایەکی دیاری کراو بو راستکردنەوەی چەوتیو لابردنی تەگەرەی پێشکەوتنیو چارەسەرکردنی گیرو گرفتی وا کە رێگەی پێشکەوتنی لە کۆمەڵگا گرتووە .

هەروەها حاجی فەیلەسوفێکی خاوەن بیرو رای تایبەتی خۆی نەبووە کە رژێمو سیستەمێکی دیاریکراو بۆ رێکخستنی ژیانی مرۆڤی داهێنابێ . بەڵێ حاجی شاعیر بووە پڕ بە مەعنای ووشەی شاعیر ، لە گەڵ ئەوەشدا ئەگەر بەوەندەی رابوەستین بڵێین حاجی شاعیرەو بەس ئەوا هیچمان دەرحەق حاجی نەگوتەو حاجیمان هەر نەناسیو نە ناساند .

حاجی قادر زەنگی ووشیارکردنەوەی نەتەوەکەی لێداوە بۆ ئەوەی بە ئاگایان بێنێ لەو خەوە دوورو درێژەی کە لە . . کاروانی راپەڕینی گەلانی تری دوواخستوون وەسەرنجیان رابکێشیبۆ دابینکردنیچارەنووسی پاشەرۆژیانو ویستوویەتی دەنگی تیژوبەرزو دڵسۆزی بگەیێنێتە هەموو چینو دانیشتووانی کوردستان بە هەموو پارچەکانیەوە ، کە هەڵو دەرفەت لە کیسی خۆیان نەدەنو چیدی لە نەتەوەو گەلانی جیهان دووا نەکەون .

**کەوابێ حاجی قادر پاشی ئەحمەدی خانی رابەری هەستی نەتەوایەتی بۆ نەتەوەی کورد بووە ، بێگومان**

**هەردووکیان لەو بووارە زۆر پێشی سەردەمی خۆیان کەوتوون، جا یەکی وەکو حاجی ئەگەر لە سەردەمی خۆی بایەخی پێ نەدرابێ لەلایەن هاووڵاتیانی لەبەر ئەو هۆیەی سەرەوە ، ئەوا چ هۆیەکی راستو تەواونیە کە لەم چەرخەش کەمتەر خەمی لێ بکرێتو بخرێتە پشتگوییەوە .**

جار جارە ناوی دێتەو هەندێ نووسەر شتی کرژو کاڵی دەربارە دەنووسن کە ئەو قەوارە فراوانەی لە مێژووی کورد شایانی حاجی قادرە بەمەندە پڕ نابێتەوە ئەگەر بێتەو بەراوردی بکەین لە نێوان حاجی قادرو هێندە شاعیرانی تری هاوچەرخمان کە چ بایەخێك بەوان دراوە بە نووسینو لێکۆڵینەوەو کۆڕ بەستنو دەرکردنی نامەی تایبەتی لەسەر ژیانیانو بەرهەمیان بۆمان دەردەکەوی کە نووسەرو روشەنبیرانی کورد بەوەفادار دانانرێن بەرانبەر حاجی قادر ، چونکە حاجی شایستەی ئەوەیە لە قۆناغی ئێستاو پێشووو داهاتو قەت لەبیر نەکرێ وەبێ بەش نەبێت لە لێکۆڵینەوەو باسو روونکردنەوەی بیرو باوەڕی کە دەری بڕیوون بۆ نەتەوەکەیو باری نیشتمانیان ، جێی سەر سوڕمانە کە هەتا ئێستا بەشێوەیەکی زانستیانە دیوانەکەی چاپ نەکراوە .

■ حوسێن رەشوانی ■



من لێرەدا دەمەوێ سەرنجی نووسەرانو رۆشەنبیرانی کورد رابکێشم بۆ ئەوەی پتر یادی حاجی قادرو ئەوانەی وەکو ئەو رابەرایەتی نەتەوەکەیان کردووە بکەن . بێگومان ئێستاکە گەلەك نوسەرو زانای هەلکەوتوو دەسەلاتدارمان هەیە لە مەیدانی لێکۆلینەوە لەم بابەتانەدا بە تایبەتی ئەم دامو دەزگایەو ریکخراوانەی کە ئێستا بۆ کورد دامەزراوون ، ئێمە هەتاکەی چاومان لە دەستی رۆژهەلات ئاسان بێت ؟.

ئەوەی گەلەك پێویستە روون بکرێتەوە دەربارەی حاجی قادر ، ئەو هۆیانە چین کە کاریان لە هەستو دەروونی کردوە – جگە لە بلیمەتی خۆی – ؟ ئەگەر فەقێیەتیو گەریدەیی بووبێ، ئەوا گەلێکی تر فەقێو گەریدە بونە وەکو ئەو ، ئەگەر چوونە ئەستەنبولو چاوپێکەوتنو بیستنی جمو جولو خەباتی نەتەوەکانی ژێر چەپۆکی عوسمانیان بووبێ بۆ تەکانی خۆ رزگارکردن ، ئەوا گەلێك کوردی تر هەبوونە کە چوونە ئەستەمبوولو ئەو کەشمە کەشانەشیان دیتووەو بیستووە .

لە سەردەمی ئەوو پێش ئەو وەدەشێ ئاستی خوێندەواریشیان لەو بەرزتربێ بۆ چ وەکوو ئەو چ باسو خواسیان نیە لە بوواری هەستی نەتەوایەتیو ووشیار کردنەوەی نەتەوەکەیان ، ئەگەر هۆیەکە ئەوە بێ کە تێکەلاویو ئاشنایيو دوستایەتی لەگەل بنەمالەی بەدرخانیان بووە – هەروەکوو هەندێ نووسەر وای بۆ چوون – ئەوەش بێ سەلماندنێکی بە بەلگەی دەوێ کە هەتا ئێستا کەس ئەو بەلگانەی دەست نیشان نەکردووە . ئەوانەو شتی تر وەکوو سەر چاوەی ئیلهاماتی شیعرەکانیو ئەو بەرهەمانەی کە لە ناوچوون وەکوو هەندێ مێژوونووس باس دەکەن هەمووی

شایانی باسو لێکۆلینەوەنو چاوەڕێی چالاکی نووسەرانی دلسۆز دەکەن .

**بەلێ ! حاجی قادرەکەی مامۆستا مسعود مەلا موحەمەدی بەرێز ئەگەر تەواو بکرابوایە ئەشیا وەلامی گەلێ لەم پرسیارانەی بۆمان روون بکردبایەوە بەلام بەداخەوە زروفی تایبەتی ئەم پرۆژە بەنرخەی کاك مەسعودی راگرت .**

حاجی قادر وەها دێتە بەر چاووم لە چوونە ناو کێشەی نەتەوایەتی کورد کە فراوانترین نەخشەی کێشابێت لەسەر تابلۆیەکی پانو بەرین زۆر بەووردی هەموو لایەنەکی کێشەی نەتەوایەتی لەسەر ئەم تابلۆیە روون کردبێتەوە ، وا بە قوولی بۆ رەگو ریشەی گیرو گرفتەکانی سەرەکی باری نەتەوایەتی کورد رۆیشتووە کە هیچ کەلێنو قوژبنێکی مێژووی رابوردووەکانیو سەردەمی خۆیو دووا رۆژی نەتەوەکەی تێدا فەرامۆش نەکردبێ ، بە تەنها کارێکیوا مەزنی پێك هێناوە ، کە لە سەردەمی ئێستاکە ئەو جۆرە کارانە بە چەندەها لێژنەی پسپۆران دەسپێردرێو کاتێکی زۆر دەخایەنێ چونکە حاجی قادر وانەبێ هەر گیروگرفتی دەست نیشانکردبێ یان وێنەی واقیعی میللەتی کێشابێو بەس بەلکو زۆر ژیرانەو هەلکەوتووانە هۆیە نهێنیەکانیشی دۆزیتەوەو بە شێوەیەکی قوول شی ی کردوونەوەو لە هەموو بارێکی لێی کۆلیونەوە .

ئەو ئەرکە مەزنەی کە حاجی قادر هاویشتیەتی سەر شانی خۆی بە رووالەت بە رۆژنامەو چاپەمەنیتر بلاودەکرێتەوە ، لە رێگای دامو دەزگایەکی فراوان لەسەر شێوەی ووتارو راپۆرو نامێلکەی جۆراوجۆر کە بگاتە دەست خوێنەرانی لە هەموو کوردستان ، بەلام لەبەر ئەوەی حاجی قادر لەسەر دەمی خۆی ئەو توانایەی نەبوە بەو شێوە بەرهەمی خۆی لەم بابەتانە بلاوبکاتەوە ، بە تایبەتی ئەم بەرهەمە سیاسیەی بێگومان بلاوبوونەوەی قەدەغەبووە لە کوردستاندا کە لەژێر دەستی رۆمو عەجەمدا بووە لە سەردەمی حاجی قادر .

لەبەر ئەمە حاجی قادر ئەوپەڕی بلیمەتی بەکار هێناوە کە ئەم جۆرە بەرهەمەی بە هەلبەست بلاوکردوتەوەو شێوە هەلبەستێکی ئەوها سووكو سادەو سوواری هەلبژاردوە کە هەموو کەسێ تێی بگاتو زۆر بە ئاسانی لەبەری کەنو لەو

زار بۆ ئەو زارو لەم شار بۆ ئەو شار دەربازبێت .

لەم رووەوە حاجی قادری بلیمەت گەیشتووتە ئەوپەڕی پلەی بەلاغەتی شیعری کە بە « السهل الممتنع » شـــیعری نەتەوایەتی دارشتووە ، وەدەرگای ئەم بابەتە شـیعرەی بـۆ شاعیرانی پاشە خۆی واڵاکردووەو زۆربەی شاعیرانی نەتەوایەتی پاشی ئەو پەیڕەوی ئەویان کردووەو لەسەر ئەو سەر مەشقەی کە ئەو بۆیانی داداوە رۆیشتوون .

من لێرەدا نامەوێ کارو کردەوەی وانیسبەت بـە حاجی بدەم کە لە باری ئەودا نەبووبێ یا بەو خووو رەوشـــتانەیدا هەڵبلێم کە لێی نە هاتبێتە جێ ، بەڵکو دەمەوێ رانومایی‌و رابەری‌و مامۆستایی حاجی بۆ نەتەوەی کورد دەسـت نیشان بکەم‌و لەناو هەڵبەستەکانی خودی خۆی بەڵگە بدۆزمەوە هـەر وەکوو لە پێشەوە گوترا ئەو هەڵبەستانەی کـە بە دەستمان گەیشتووەو بێ‌گومان زۆریش لە هەڵبەستەکانی فەوتـاوون پێشی بەدەست نەتەوەکەی بکات هەر وەکوو خۆی دەفەرموێ :-

**بەیتی من چونکو کەلکیـان دەگرێ**
**لە غەریبی بەبێ کەسـی دەمرێ**

ئـەوەی نـرخی خەبـاتو خـەمخۆری حـاجی قادر بۆ نەتەوەکـەی زۆر بـەرز دەکاتـەوە وەپایـەی بەسەر هەموو خەبات کارانی کورد باڵاتر دەکات ئەوەیە کە حاجی ئەو رەنجانەی داوە لە دەرەوەی وڵات ئومێدی ئەوەی نەبوە کە چ سودێکی تایبەتی بۆ خۆی لەو هەوڵو تەقەلایەدا دابین بکات نە لە پارەو پوولو پایەوە نە لە ناو دەنگ ، وە نەلەبۆ دابین‌کردنی پاشە رۆژێکی خۆش‌و گەش بۆ ماڵو منداڵانی چونکـە مـاڵو منداڵی نەبووە وەکوو دەفەرموێ :

**هەر منم ئێسـتا وارسـی عیسا**
**بێ ژنو ماڵو بێ کورو مـەءوا**

وەهەر وەك دەفەرموێ :

**حاجی کەسێکە بێ‌کەسی بۆ ئێوە قوڕ دەپێوێ**
**گوێی لێ دەگرن زەریفە نایکەن بەلا لە خۆتان**

وە چاوەڕووانی یارمەتی‌و پاڵ پشتی کەسێ یادەستەیێ لە هاووڵاتیانی نەبوە لە گەڵ ئەوەش لـەم دووره وڵاتـەوە کارەساتێکی وای بەرپا کردووە کە قەت نابڕێتەوە هەتا نەتەوەی کورد مابێ .

حاجی بۆ نەتەوەکەی دەرسی زۆر بە نرخو پڕ مەعنای بە جێ هێشتووە ، بەڵام نەتەوەکەی تا چ رادەیـەك لە دەرسـەکان گەیشتوونو تا چ رادەیەك سوودیان لێ وەرگرتووە ؟ ـ ئایـا گیانی حاجی هەتا ئێستا هەر چاوە چاوەیەتی بۆ ئەوەی بـزانێ سوود لەوانەکانی وەردەگیرێ یان حاجی پاش مردنیشی هـەر رەنجەڕۆ دەبێ وەکو لەژیانی رەنجەڕۆ بوو ؟!

بابەتی دەرسـەکانو رانومایی حاجی بۆ نەتەوەکەی گەلەك زۆرن وەهەندێك لە دەرسەکانیش دوو بارەو سێ بارە کراونە ئەوە بە شێوەی جۆراو جۆر، لێرەدا چەند بابەتێك دێ‌نینە پێش چاو بۆ نموونە ئەوانی تر خوێنەر بە تەماشاکردنی دیوانەکەی بە ئاسانی رێیان بۆ دەبات .

کە بیرم لە نووسینی ئەم باسە کردەوە وام دەزانی بە چەند لاپەڕەیەك کۆتایی پێ دێ بەڵام کە کەوتمە نـــاو لێکدانەوەو نووسینی بۆم بە دەرکەوت کە روونکردنەوەی رابـــەری‌و مامۆستایەتی حاجی قادر بۆ نەتەوەی کورد .گـەلەك لـــەوە فراوانترە کە بە ووتارێك یا بە چەند ووتارێك وازی لێ بهێندرێ لەبەر ئەوە بەدەست نیشان‌کردنی چەند بابەتێکی دیـار لـــە شیعرەکانی بۆ بەڵگەی مامۆستایەتی ئیکتیفام کردووە ، وە بۆ ئەوەی ببێتە سرنج راکێشەری نووسەرانو رۆشەنبیرانی کورد کە دەسەڵاتیان لە لێکۆڵینەوەو روونکردنەوە پتر هەیە لە ئەدەب دۆستێکی وەکوو من بۆ تەواوکردنی ئەم ئەرکە پیرۆزە .

حاجی قادر وا دیارە تەمەنی درێژی بـە هـەموو تواناو بلیمەتی تەرخان‌کردووەبۆ دەست نیشان‌کردنو چارەسەرکردنی ئێش‌و ئـازارو دەردی نەتەوەکەی تا رادەیەك کـە لـە میحرابی پەرستگاهدا کـە ستایش‌و نزامی بەرز دەکـاتەوە بۆ بارەگای پەروەردیگار دەیەوێ لەو کاتەش دەسکەوتێ بۆ نەتەوەکەی پێك بێنێ وەکوو دەفەرموێ :

**مەعلوومـە بۆیـە حاجی مەدحت دەکا بە کوردی**
**تاکەس نەڵێ بە کوردی نەکراوە مەدحی بـــاری**

**بابەتی یەکەم :**

حاجی ئەوەمان پێ دەسەلمێنێ کە مامۆستاو رابـەرێکی خەمخۆری کورد بووە ، ژیـــانی خۆی بـــە تـــەواوی بـــۆ ئاگادارکردنەوەی نەتەوەکەی تەرخان‌کردووە وەکوو دەڵێ :

**لە ئادەم بگـرە تـا دەورانی ئێستـا**
**یەکێ وەك حاجی لەو خاکە هەڵستا ؟**

که غەمخۆری بـکا بۆ میللەتی خۆی
لە بەینی کوردەکانو شێخی بێ پۆی

■ ✽ ■

بەسیە حاجی ، دوو سەد هەزار دەفعە
پێم گوتی ئەم قسانە بێ نەفعــــــە

باوکە هەر چۆنی توو دەڵێی وایــە
تێ دەگەم ئەم قسانە خۆڕایــــــە

قوڕی کام جێگە بکەم بەســـــەرما
ئەمە لێم بوەتە عیللەتی ســــەودا

بە قسەی چاکـە دەستیان دەگـرم
تەرکی ناکەم هەتـــا دەمــرم

ـ وەکوو دەفەرموێ :

وەکوو خەمسەی نیـزامیو گەنجـە
کە لەلای خەلکی کیمیـاو گەنجــە

یا وەکوو بەیتی شیرنو فەرهـــاد
بەیتی حاجی لە بەرکرایـە بەیـــاد

ئێستە میللەت دەبوونـە ساحب جاە
یا نـە هـــاوتـای ئەولیـائو اللە

حاجی لەسەر ئەو بیرو باوەڕە بووە پاشـــی هـــەوڵو
ەنەللایەکی زۆری داوە بۆ ووشیارکردنەوەی نەتەوەکـەی کە
ەحمەتە لە سەردەمی‌دا گەلی کورد تێی بگەن کە حاجی قادر
چ رۆڵێکیان بۆ دەگێڕی لەبەر نزمی پلەی هەستی نەتەوایەتی‌و
گری باری رۆشنبیری‌یان کە دەفەرموێ :

کێ دەڵێ ؟ کوردەکان بـە ئیدراکن
بەسە ئـەم نەقسە گوێ لەمن ناکەن

لە قسەی سافی من خەلەل دەگــرن
واهیمەی شـێخەکان لە دڵ دەگرن

ـان دەفەرموێ :

بەیتی من چونکو کـەلکیان دەگـرێ
لە غـەریبی بەبێ کەسـی دەمـرێ

تا لە ژێـر باری رۆمیـــان نـەمرن
زەحمەتە قـەدری بەیتی من بگرن

وە دفەرموێ :

ئاخـری رۆژێکیش دێ وەعــدی
خەفەتم بۆ بخۆن وەکو ســـەعدی

قازیی ئەسرو موفتی‌می نــــازیم
تێ‌دەگەن تا مودەرریسو عـــالیم

بۆتـە سـیحەی زمـانی کوردانـە
شـیعرەکانم دەلیل‌و بورهانــــــە

یەعنی تـا ماوە شـــاعیری غەررا
عالیم‌و عـامی داخی بـۆ نـــاخوا

لاکین ئەو ساعەتەی بەرەحمەت چوو
قوڕ دەپێون دەڵێن چ حیکمەت‌بوو ؟

پەشـــمە حاجی وەکوو جـــاران
ببـرەوە سەر حیکایەتی کوردان

ئەو ئاگاداریەی کە حاجی هەیبووە لە باری کەین‌و بەینی نەتەوەکان‌و دەولەتەکان وای لێ‌کردووە کە هــــەرگیز بـاری نەتەوایەتی کورد جینگلە بخواتن لە ناو هەسـتو بیرو هۆشـــی وەکوو دەڵێ :

دەفەرموی ئەم عەزابە بۆ چ دەکێشی
چ مەلزومە ئەگەر چاووت نەییشــی

قوڕی کوێ کەم بەسەرخۆما لە غیرەت
خەوم نایێ لە داخی موڵک‌و میللەت

ئەگەر وەك من خەبەردار بن لە دەولەت
لە حەیفا خۆ دەخنکێنن بەبێ پــەت

دووازدە ملیۆنە کورد نفووســــــی
بە قسەی ئەهلی تەخمینی کە نووسی

ئەوەی لێرە سرنج زۆر بە توندی رادەکێشێ ئەو سەر ژمارەیەیە کە حاجی بۆ نەتەوەی کوردی دۆزیبێتەوە کـــــە گەیشـتووەتە دووازدە ملیۆن چونکە ئەوانەی لەبـــــەر کوردان دەنووسن ئەو هەتـتا نەوەد سالانەی دووای حاجی قادر چ لە بێگانانی ئاوروپایی یا بێگانانی رۆژهەلاتی یا لە کوردان بـــــــە زەحمەت ئەم ژمارەیان لە قەلەم داوە بۆ نفووسی کوردان ، کە

چی ئێستا هەموو نەتەوەکانی سەر رووی زەمین لە وکاتی ئێستا سەر ژمارەیان دوو چەندانو سێ چەندان بووە ، بەس ژمارەی کورد نەبێ ئەگەر لەکورتی نەدابێ ئەوا زیادی نەکردووە وەکوو بلێی نەتەوەکە بە تێکرایی لە زاووزێ سست بووبێ ، بەراستی ئەمە جێگەی سەرسوڕمانە یا گومانە ..

**بابەتی دووەم :**

حاجی بە نەتەوەکەیدا هەڵ دەڵێ‌و خووو رەوشتو ئاکاری بەرزو پەسندیان کە وەکوو سروشتێکی چەسپاوە لە ناویان وەبیریان دێنێتەوە بۆ ئەوەی ووڕەیان بەتینو بەرز کاتەوەو باوەڕو متمانیان بە هێزو توانای خۆیان پتەو بکات ، وەکوو دەفەرموێ :

**خۆ دەزانن سولالەی ئەکراد**
**لێرەوە بگرە تا دەگاتە قووباد**

**هەموو زاناو هوونەرومرو میرن**
**زیرەکو ژیرو ئەهلی تەدبیرن**

**دانو بەخشینیان لەلا باوە**
**خوێنی مەیدانیان لەلا ئاوە**

**لە شەجاعەت هەموو وەکوو رۆستەم**
**لەسەخاوەت هەموو وەکوو حاتەم**

یا وەکوو دەفەرموێ :

**لە گاوانو شووانی کوردەکان یەك**
**بەسە بۆ لەشکری سەد کەرە دوولەك**

**بە فیدای شووانتان حاتەمی تەی**
**بە قوربانی سەپانتان ئالی بەرمەك**

**مریشکی ئێوە سەیادی شەهێنە**
**لەکن عەنقا فرووجە حاجی لەك‌لەك**

**شوانی مێگەلی ئێوە لەشەڕدا**
**وەکوو قەسابە دوژمنی مێگەلی شەك**

حاجی وای لێك داتەوە کە گەلی کورد کۆنترین نەتەوەیە لە کوردستانێدا جێ‌نشین بووینەو زۆر نەتەوەیان لێ وەباش کەوتووەو بەوولاو بەولای ئەم جیهانە پرژوو بڵاوبوینەوەو نەتەوەی تایبەتیان لێ دوروست بوە ئەمەش بۆ سەلماندنی ئەوەیە کە کورد خاوەنی کۆنترین مێژووە وەکوو دەفەرموێ :

**ئەو رۆژە بە ئەمری حەیی مەننان**
**ئەو عالەمە پاکی بووە نۆنان**

**تاقێکی نەما لە جینسەینی زی رۆح**
**غەیری ئەوەی هاتە کەشتیی نوح**

**ئەو رۆژە گەیشتە وەختی مەعهوود**
**وەستاوە لەسەر چییایەکەی جوود**

**هەرسێ کوڕی کردیانە مەسکەن**
**ئەو جێی‌و مەکانە میسلی گولشەن**

**ئێستا کە جەزیرە بێ موحابا**
**مەعموورەیی ئەووەلە لە دونیا**

**ئەولادی سەحیحیان بە بورهان**
**کوردن لە شوێنی جەددی خۆیان**

**سوککانی بیلادی روبعی مەسکوون**
**سەر پاکی لەمانە مونشەعیب بوون**

**بێ تەفرەقە بوون موتیعو هەم دەنگ**
**هەم مەشرەبو هاو لیباسو هەم رەنگ**

**ئایینو مەزاهیبو رەسائیلی**
**واکردیە فیرقەو قەبائیلی**

ئەو بۆچوونەی حاجی قادر باوەڕێکی ئایینی سەرەکیە لە ناو یەزیدییان لە نامەپیرۆزەکانیان وا دەزانن یەکەمجار لەسەر ڕووی زەوی کوردستان ئاوەدان بووە وە لە پێش دوازدە هەزار ساڵی بۆ یەکەمجار ( وەحی ) لە لایەن خوای گەورە بۆ مەلەکا تاووس بەزمانی کوردی هاتووتە خوارێ .

**بابەتی سێیەم :**

حاجی قادر بە لێکۆڵینەوە بۆی روون بوتەوە کە بەردی بناغەی قەڵای کەسایەتی نەتەوە ، زمانە ، وە هەموو دەسکەوتو بەرهەمی نەتەوە بەزمان دەپارێزرێ لە مەینەتی لە ناو چوونو شوێنەوار کوربوونەوە ، بۆیە بایەخێکی گرنگو تایبەتی بە زمان زیندوکردنەوەو گەشەپێدانی داوە وەکوو دەفەرموێ :

**هەر کوردە لە بەینی کوللی میللەت**
**بێ بەهرەیە لە خوێندنو کیتابەت**

**بێگانەیە لە تەرجەمەی زمانی**
**ئەسراری کتێبی خەڵکی دەزانی**

**یەکسەر عولەما درشـتو ووردی**
**ئەی‌خوێندووە دوو حەرفی کوردی**

**ئوسـتادی خەتن لە ئەم سێ زمانـە**
**وەك دێ لە زمـانی خۆی بێگانـــە**

**سـاحیب کتێبو پەیامــە هەر کەس**
**ئێمــە نەبێ بوینە قەومی چەرکەس**

**خۆ مۆمنین ئێمــە نـە روســیین**
**بۆ چ کوفرە زمانمـــان بنووسـین**

**میللـەتی بێ‌کتێبو نووســـین**
**غەیری کوردان نییە لە رووی زەمین**

وە دەفەرموێ :

**کتێبو دەفتـــەرو تاریخو کاغـەز**
**گەر بە کوردی بنووسـرایە زەمـانی**

**مەلاو زانـاو پـیرو پادشـامان**
**هەتا مەحشەر دەما ناوو نیشـانی**

وە دەفەرموێ :

**کوردی ئاخـــر چیـە عـەیبی**
**هــەر کەلامی حەقە نیـە عـەیبی**

**لەفزی کوردی ، بلاو نەبوو گردبوو**
**والــە مابەینی ئێمـەدا تێ چوو**

**لە فەسـاحەت بـلا موعـــەڕرابێ**
**چ قییامەت بـە ئەرمنیش نــابێ**

**یا لەگەڵ فارسی چ فەرقیی هەیـە**
**بۆ چی ئـەو راستە ئەم کەمی‌یـــە**

**باوجوودی ئەگـەر بکـەی دیققـەت**
**تێ دەگەی کام لە کامیە سـیرقەت**

**چونکە ئێمـە قەدیم تـرین لەوان**
**بە تەواریخی حوملەیی ئەدیـــان**

یەك لە بڕیارەکانی کۆنگرە فراوانەکەی رۆژهەڵاتناسەکان ئێراندا سالی 1968 ئەوەبوو : کە نژادی کورد لە فارسـی ...نترە .

**بابەتی چوارەم :**

حاجی قادر خەباتو پێش‌کەوتنی میللەتان بە وێنـــە دێنێتەوە بۆ بزواندنی غیرەتو هەستی نەتەوایەتی بۆ ئـــەوەی کورد چاو لەو نەتەوانە بکەن بۆ وەدەست هێنانی چارەنووسی باشـەرۆژی خۆیانو جەڵەوی ئەندێشـەیان رادەکێشێ بۆ ئـەو راپەڕینەو پێش‌کەوتنەی کە لە ئاورووپا رووی داوەو دەڵێ :

**بنوارە سـەعیو غـیرەت ئێستا لەناو ئاورووپا**
**خۆیان خەزینە دارن ، خۆیان تەبیبو سوڵتان**

**بولفارو سێربو یۆنان، هەم ئەرمەنیو قەرەتاخ**
**هەرپێنجیان بە ئەژمار نابن بە قەددی بابان**

...یا دەفەرموێ :

**ئەی خەریکی رەموزو تـازو نییـاز**
**ئاورووپا فەننی گەیوە ئیعجــــاز**

**قوللەیی ئیفلی لــــە نەفلاکـــــە**
**عەکسی ئەو گەرووشی لەژێر خاکە**

**کوورەیی ئەم زەمینـە یان پێــوا**
**خاتـری تۆبێ چوونـە جەووی سەما**

**بابەتی پێنجەم : ـ**

زانـستو پیشەسازی هۆی سـەردکی پێش‌کەوتنە وەکوو دەفەرموێ :

**بۆچی فەرمووبەتی نەبی‌ی ئەمیین**
**« اطلبوا العلم ولوفی الصین »**

**نێرو مـێ لەو حـەدیثە فەرقی نییـە**
**گـەرمەلا نەهی فـەرموو دینی نییـە**

**لازمە خـوول بخۆی وەکوو بـەرداش**
**هەموو فەرنێك دەگۆڕێ ئەمری مەعاش**

**تەمبەلـی کـاری حییزو بـێ خـێرە**
**دەستی ماندوو لەسەر زگی تێـــرە**

**ئەهلی جەنـنـەت نەشوانو گاوانــە**
**سـاحیبی فەنو عیـلمو عیرفانـــــە**

### فائەدەی گەر بووایە زیکرو دووعا
### دەبووە قاروون گەدایی سەر ڕێگا

لێرەو لە هێندە شیعری تری حاجی چەند سەرنجێک سەر هەڵدەدات :

1 ـ حاجی لەم سەردەمە زووەوە کە سەرتاپای دانیشتووانی ڕۆژهەڵات بە چاوێکی نزم تەماشای ئافرەتیان دەکردو لەهەموو باری ژیانی کۆمەڵایەتیدا زۆر لە پیاویان بە کەمتر دەزانی ، ئەوا لەو سەردەمەدا هاتووتە سەر ئەو باوەڕەی کە ئافرەت یەکسانە لەگەڵ پیاو لە مەیدانی زانستو هونەرو هەڵسان بەکارو باری ناو کۆمەڵو دەڵێ ئەوانەی بە ناوی ئایین مەیدانی یەکسانی لە ئافرەت دەگرن ئەوانە بێدینن ، حاجی قادر هەر لە سەرچاوەی ئایین بە لگە دێنێ بۆ یەکسانی لە نێوان ئافرەتو پیاو ئەوەش لایەنێکی پێشکەوتن خووازی حاجی قادرە کە کەم کەس بۆی چووە .

2 ـ ئەم تێبینیانەی حاجی لە دووربینیدا لە بیرو هەستی سەرەك دەوڵەتانی ژیرو بلیمەت دەچێ ، ئەگەر بهاتبایە سەرەك دەوڵەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەسەر بیرو باوەڕی حاجی بڕۆیشتوبوانە لەم پەنجا ساڵەی ڕابوردوودا ئەوا گەلەکانی خۆیان بە پێش دەخست کە ئێستا شان بەشانی گەلەکانی ئاوروپا بڕۆن لە باری تەکنەلۆجیاو هەموو جۆرە پیشەسازیەك .

3 ـ حاجی لەسەر بنچینەیەکی زانستی هۆیەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵ پیشان دەدا کە لە دوا بەدوای ئەو شیعرانە دەفەرموێ :

**هەرچی بێ بەهرەیە لە کەسبو کەماڵ**
**دەبنە دەروێشو مارگرو حەمماڵ**

یاوەکوو دەڵێ :

**پارانەوەو تەوەککول لەم عەسرە پارە ناکا**
**تیرە دوعایی جەوشەن پەیکانە حیرزی مەیدان**

**بۆچی بەشیری ئێمە یەعنی رەسووڵ ئەکرەم**
**هیچ ئەوعیەی نەزانی ڕۆژی کە دەچوومەیدان**

**شیرو قەڵەم شەریکن لەم عەسرەدا دریغا**
**شیرم قەڵەم تراشەو کالاینە قەڵەمدان**

لێرەمو لە گەلی شیعری تری حاجی بەتەواوی هەموو جۆرە پێشکەوتنێك لە مەیدانی ژیاندا بە هۆیەکانی ماددی دەبەشێتەوە لە جەنگو کاسبیو باری کۆمەڵایەتی ، جا لێرەش هەڵوێستێکی زۆر ئاشکرای پێشکەوتن خووازی حاجی قادر بەدەر دەکەوێ .

**بابەتی شەشەم :**

بەرنامەی خوێندنو ڕێبازی هونەری چەوتو بێکەڵك لەناو کوردان دەستنیشان دەکات کە دەفەرموێ :

**شاعیرو شێخو خوواجە دەربەدەرن**
**لە قسەیی بێ نەتیجەدا دەمرن**

**باسی زولفی درێژو چاوی بەخەو**
**نەبڕاوە بووە تری خەسرەو**

**قەیدو تەزبیبو حاشیەو ئیعراب**
**هەموو بابردی بوونە موجی سەراب**

**عولەمامان بە قەولی بێ سەرووپا**
**پاکی خنکان لە بەحری ووشکی هەوا**

**سنعەتێك فێرنەبوون لە پاش تەحسیل**
**سەیری چۆن بۆ مەناهی بوونە دەلیل**

وە دەفەرموێ :

**ئەمانە بێ شوعورو گێژو وێژن**
**موتیبی لووتە خۆرو هەرزە بێژن**

**کوڕێکی وانیە هەستێتە سەرپێ**
**بزانێ خەڵکی چۆن کەوتوونە سەر پێ**

**بکا سەیری جەریدەو حاڵی میللەت**
**کتێبی تازەو تاریخی میللەت**

**بزانێ تا چ قەوماوە لە ئەتراف**
**سەراپا ئاگرە ئەترافو ئەکناف**

**ئەو هەموو مەدحو بادەیی دولبەر**
**نووسراوە لەهەزار دەفتەر**

**حەیفە بۆ پیاوی ساحیب تەمییز**
**هێندە باسی مەکانی پیسو میز**

**هەموو مردووی میانو سمتی خڕن**
**بەیتی مەدداحیان بە گیان دەکڕن**

لێره وا بەدەردەکەوێ کە حاجی قادر داوای ( ادبی ملتزم) دەکات کە دەردو ئێش و ئازاری گەل دەس نیشان و چارەسەر بکات و ڕانومایی جەماوەر بکات بۆ پیشاندانی ڕێگەی پێش کەوتن و لابردنی کۆسپ و تەگەرەکانی .

**بابەتی حەوتەم :**

حاجی لە گەلێك لە شیعرەکانیدا هیماو ئیشارەتی تێدایە بۆ هاندانی نەتەوەکەی کە چالاکی بنوێنن لەباری کاسبی و بازرگانی و پیشەسازی و کشت و کاڵدا بۆ وەدیهێنانی دەرامەت و دارایی وێنەیەك لەمانە ئەو ڕانوومایيەی کە لە باری کشت و کاڵ کردویەتی وەتاقی کردنەوە دەکات بۆ وەدیهێنانی بەرهەمی تازە لەکشت و کاڵدا وەکوو دەفەرموێ :

**لەکن خۆتان فولان ئیبنی فولانن**
**لە دونیا ئایین و ئۆیین دەزانن**

**کەچی ، کەچ مەشرەبێکی بێ دیانەت**
**بەحیلە مل دەنێتە بەر عیبادەت**

**شەریعەت گەر بزانی یا نەزانی**
**وەکوو کەر دەچنە بن باری گرانی**

**لەمیشی تەنها نییە سووچ و خەتاتان**
**لە کەسبیش غافلن میسلی مەلاتان**

**لە بەغدا بۆچی خورما بێت و لەیموون**
**لەبۆ دەرمان لەماڵ ڕۆنی زەیتوون**

**لە دەوری کوللی باغی شاری کۆیە**
**دوسەد مەنداری زەیتوون بە جۆیە**

**لە ئێوە کامتان بوو یەك دوو جارێك**
**بکاتە کیسەیەك یاخود خەرارێك**

**دوو پێی لێدا لە کۆلا میسلی دۆشاو**
**وەکوو ڕۆن ڕونی زەیتوون بێتە سەر ئاو**

**وەیا کەی نێژراوە سەد نەمامێ**
**لە نارنج و ترنج و هەر مەقامێ**

**بزانن شین دەبێ نابێ بەبەردێ**
**لەجێگەی گەرم و ساردی چی بەسەردێ**

**بەراوو ئەرزی ئێوە کیمیایە**
**دوررو گەوهەر ، گەزۆو مازووی چییایە**

**مەعادین خاتری تۆ بێ لەگەڵ کان**
**گەنمتان زێڕە حەتتا زیبوە زیبوان**

**ڕەژووی پاپۆڕو خوێوو نەوت و گووگرد**
**لە کێوی ئێوەدا کۆیە وەکوو گرد**

**لەبەینی میللەتی خۆتان بە یاری**
**بکەن تەجسیمی شاخ و دارو باری**

**دەومن ئاخری دەبێتە داری گەورە**
**مەڕی لەڕ خزمەتی بۆ گۆشتی چەورە**

**بابەتی هەشتەم و نۆیەم :**

لەسەر ڕەخنەی کۆمەڵایەتی و ئایینی کە ئاراستەی شێخانی کردووە ، دەوری ڕووخینەری خانەقاو تەکیەی زۆربەی شێخەکانی کوردوستانی ڕوون کردوتەوە .

ئەوی تریان شیعری سیاسی و نەتەوایەتی یە ئەو دوو بابەتە زۆربەی زۆری شیعرەکانی حاجی قادری ـ جگە لە غەزەلەکان ـ لەم دوو بابەتانە ئەوەندە دیارو ئاشکران پێویستیان بەشی کردنەوەو لێکۆلینەوە نییە هەموو خوێنەرێك دەتوانێ بەئاسانی لەواتەو مەبەسیان بگات .

ئەوەی زۆر باری سرنج ڕادەکێشێ بە وێنەیێکی تایبەتی حاجی قادر ڕوی ئامۆژگاری و هاندانی بە تەووژمی دەکاتە عیراق و داوایان لێدەکا کە زوو بەزوو بەپەلە لەژێر باری داگیرکەری بێگانە خۆیان ڕزگاربکەن وە داوایانی لێدەکات کە هەل و دەرفەت لە کیسە خۆ ئەدەن جارێکی تر ئەم هەلەیان بۆ هەڵناکەوێ وەکوو دەفەرموێ :

**عەجەبا بۆچی ئەهلی مولکی عیراق**
**ئیتیفاقی بەدەل دەکەن بەنیفاق**

**بۆ ئەمیرانی غەیرە دەبنە ئەسیر**
**نە لە خۆیان یەکێ ببێتە ئەمیر**

**ئێستەکەش فورسەتە گەلی یاران**
**کەپەنەك بۆچییە لەپاش باران** ـ

**تێبینی :**

ئەم باسە بە شێوەی کورتە ووتارێك گوتراوە لە میهرەجانی حاجی قادری کۆیی لە 22ـ1971/6/24 کە ئەوسا سکرتیری گشتی ماموستایانی کوردستان بووم ،و نوێنەری یەکیەتی ماموستایان بووم لەم میهرەجانەدا .

وصفی حسن ڕدێنی

# پشتی من «تەچ ڤیاو مننەئانی» خواندی

د ڤان هەیڤێت بوریدا کومەلە هوزانێت هوزانڤانێ هەژی (خلیل محمد دهوکی) کەفتە بەر دەستێ خویندەوارا .

(تەچ ڤیاو من نەئانی) ناڤێ دیوانا هوزانێت دهوکی یەو ژ چاپکەرێت دەزگەها روشنبیری و بەلاڤکرنا کوردی یە ، هوزانێت ڤێ دیوانێ (28)ن و جاخێ ڤەهاندنا وان د کەڤیتە د ناڤبەرا سالێت 1973 — 1978ز .

**پشتی من دیوانا ناڤبری پێنج شەش جارا خواندی و ڤەخاندی و هزرا خو تێدا کری ، ل ئەنجامێ ڤێ خواندێ تشتێ کو گەلەك سەرنجا من راکێشای بیرو هزرێت هوزانڤانی نە .**

بیرو هزرێت هوزانڤانی گەلەك د باشن و رێك و پێکن ، چنکو هوزانڤان هەلوێستا خو بەرامبەری هەمی لایێت ژیانا وەلاتی خو دیار دکەت ب شێوەکێ روون و ئاسان دا هەر خویندەوارەك تێبگەهێت .

بێ گومان هوزانڤانی ژی مروڤەکە وەکی هەمی مروڤا ، خودان هەستە بەلکو ژ مروڤێت دی هەستیار ترە لەوڕا پتر ئازارو کوڤانا دخوت و ئەو ئازارو کوڤان دینە ئیلهام و شیعر ، خەمێت دلێ خو پی دادرێژیت .

دڤێت بزانین کو هوزانا هەڤجەرخ نەیا پێك هاتیە ژ قەفتەکا سوزا ، بەلکو هوزانا هەڤجەرخ هەلوێستە و شوڕشە و هوشیارکرنە و نامەیە و خزمەتە و ئەگەر هوزانا ڤی سەردەمی نەیا هوسا بیت نابێژنێ هوزان بەلکو دبێژنێ مژیلکرن و وەخت بوراندن .

خلیل دهوکی وەك هوزانڤانەکێ هەڤچەرخ و گەل پەریس شیعرا خو دکەتە ئالاڤەکێ هوشیارکرنێ و دبێت :

**هاژ خو هەبە ؟!**
**ئاڤا بێ پیل هێدی هێدی**
**ماسیا دخوت ..**
**ئەو بوهارا گول بو دگەش**
**ئەو بخو دخوت ..**
**هاژ خو هەبە ؟!**
**ڤا دوژمنا ئەڤرو دڤێن**
**سکرا چێکەن .. جوکا بگرن**
**مە نەبیت ئاڤ ..**
**تیرا بەردەن ، مە کورەکەن**
**دا ژ مەڕا نەمینن چاڤ ..**
**گوڕستانا مە خەملاندی**
**بو شەهێدا وێ بسوژن ..**
**خورت و مێرو تەڤ عەگیدا**
**بخافلەتی ئەو بکوژن**  ب 9

هوزانڤانێ ئەڤیندارو شوڕشگێرو خەم گران هەمی دەما د دەریا ئەڤینا چاڤێت ئەڤیندرا خودا وەلاتی دبینیت و ئەڤینا دولبەرێ دگەل وەلاتێ تێکەل دبیت دئەنجامدا ئەڤینا وەلاتی سەردکەڤێت و پتر سەرنجا هوزانڤانی ڕادکێشیت :-

**نازەنینی**

**برینا من هێژ کویرترە**
**ژ برینا مەم و زینێ ..**
**هندی زاروکا هەواربیت**
**ڤێرە ڤێر بیت ، ژ بەرنالینێ**

هندی سور گولا تازی بیت
بەهی‌و شینی‌و هەر گری بیت
ژبەر بوهارو هاڤینێ ..
هندی رێکا خورت‌و مێرا
ژ مژو توزێ داگرتی بیت ..
کەپروکا بی‌کەسی‌و ژارا
هەرافتی بیت ..
ڤەت نکارم
خو بەردەم پێلیت ئەڤینێ ..
ئای شرینێ !! ئەڤینا من
ژ ئەڤینا تە کەڤنترە ..
مەزنترە .. بهێزترە ..
گەرمترترە .. ب 21

دهوکی وەك هوزانڤاکێ خەم گران ، خوشیا ژبیرکری‌ول خوشیا ناگەریت‌و دەمێ خەلك دچنە شاهی‌وسەیرانا ئەودچێتە هندەك جهێت دی‌و کارەکێ دی دکەت .. ئەڤ چەندە خویا دبیت ل هوزانا «کاغەزەکا نە بەلاڤکریا گیڤارای» :ـ

هەی جانا من
دەمی لکوڤەندو داوەتا
خو دخەملینن .. دڤەهەژینن
چەرگەو دلێ تە دحەلینن
لڤێرێ جانێ
ئەز یێ خەندەك‌و چەپەرا
دهەرڤینم
کێت خوین مێژو نوکەرا
بێت درینم .. بێت پەقینم
دا روژەکا پر خوشی‌و نوی
ژتەرا بینم ..
دەمی لسەیران‌و بوهارا
خو دلەڤینن ..
زەری سەرکێشێت سەیرانا
ژباغ‌و بستانا ددەرینن
لسەرێ هەمی کوپێت چیا
ل سەرێت رێ‌یا
دێ من بینی

دەمێ گورزا دڤەوەشینم
ئەنیا خوین مێژیت وەلاتی
دهەرشینم .. دپەرچڤینم .. ب 15

هوزانڤان یاخو هەر مروڤەك دڤێت باوەریەکا موکم ب هێزا میللەتاو جەماوەری هەبیت ، چنکو چ جارا چ میللەت نامرن بەلکو ژ مرنێ مەزنترن‌و باوەری ئینان ب شیانا میللەتا بەرزترین هویە بو نەگوشتنا هیڤیا د سینگادا :ـ

لێ براینو !!
هەر چەند کەلەك دار بەلاڤەو
رویبارەك پر تورو داڤە
لێ مە خەبات‌و بزاڤە
چنکو گەلو !!
کەویت مە هەر یی دڤەبن ..
ماهینێت مە هەمی سحارا دشهن ..
گولێت مە چاندین نامرن
هەر دگەهن ..
باوەر بکەن ..
دێ روژەك ئێت
هەر چار ڤولاچێت دلێ مە
گەش‌بن .. ڤەبن .. ب 20

بێ گومان وەختی ئەم دبێژین د هوزانا هەڤجەرخدا دڤێت زور بویتە بێتەکرنێ ب بیرو هزرا ، لێ مەبەستا مە نە ئەوە بویتە نەهێتە دان ب هوزانێ ژ لایێ هونەری‌و زمانی‌ڤە !! چنکو هوزانڤان خودان ئاشوپەکا بەرفرەهو تیژە لەورا دڤێت ئاوازو ژان‌و کوڤانێت ب زمانەکێ خوشی‌و دروست‌و ب ئاوازەکێ ریك‌و پێك بکەتە کەڤالێت (لوحة) جوان‌و ئارمانجبەر ..

ئەڤجا ل ڤێرە هوزانڤانێ مە ڤێ سەرویەرێ زولمێ‌و خرایکرنێ‌و تەعدایێ دکەتە کەڤالەکێ تەشکیل یێ جوان‌و د دانیتە بەر چاڤێت مە :ـ

ئەری گەلی داخازکەرێت سەربەستی‌یێ
بێت ئاشتی‌یی‌و تەناهی‌یێ
هوین لچ دگەرن ؟!
یا دێ وەرن
خوین یاپەنگی
لکویری‌و کەنگی ؟!

مروڤ بساخی دئێت ڤەشارتن !!
لکویری‌و کەنگی ؟!
بڤی ڕەنگی
زکێ ژنا بحەمله بشەرت
دئێت دڕاندن !!
لکویری‌و کەنگی ؟! هو یێ دەنگی !!
بیستان‌و چەم دئینە سوتن
پزو زاروك دئێنە کوژتن !!
ئەرێ هەی هو !!
گەلی مروڤێت کەڕو کۆر !!
ما نابینن .. لچەرخێ بیستێ
لچەند وەلاتا ..
لسەر ئاخا کو لێ ژ دایك بوین .
پیلێت زولم‌و زورداری‌یێ
بێت ئاگری‌و بێت تاری‌یی
وان دسوژن‌و هەر هو
ژبێ چارەیی دمرن .. ب 36

هوزانڤانێ مە یێ گەهشتیە راستیەکێ کو گوشتن‌و سوتن قوناغا ئێکێ‌یە بو شورشێ‌و هەتا گوشتن‌و تالانکرن‌و خرابکرن نەبیت قەد باوەر نەکە سەربەستی هەبیت‌و دارا سەربەستی‌یێ ب خوینێ تێتە ئاڤدان ...

دناڤ ڤان هەر سێ تشتادا «کوشتن‌و خرابکرن‌و سوتن» دهوکی دگەل سەربەستی‌یێ دئاخڤیت :ـ
ئەڤجا جانێ خوشتڤی یێ
سەربەستی‌یی ..
دناڤ خەندەك‌و چەپەرادا
لتەدگەریێم .. تەنابینم ..
دناڤ کەلەخێت مروڤان‌دا
دناڤ خانیکێت هەڕافتی‌دا
دناڤ دارستانێت سوتی‌دا
لتەدگەریێم .. تەنابینم ..
لێ من لیەرە ، بەری بمرم ..
بەری ڕێکلخو ژ هەژاری
یان ژ ڤەچاری
ئەز بهێلم‌و بزڤرم ..
تەببینم .. ئەی سەربەستی
لێ من لبەرە ..
وهەر یاڤەرە .. هەر یاڤەرە .. ب 37

هوزانڤانی هەڤچەرخ هندەك جارا پێ‌گولێ دکەت ژبو جهـ ئینانا دروشمێ ژیانا کوردەواریێ «کورت‌و کرمانج»و مەبەست ژ ڤێ چەندێ ئەوە مەسەلەکا درێژو بها د چەند پەیڤێت کورت‌و ئارمانجبەردا بێتە خویاکرن‌و هندەك دبێژنە ڤی رەنگێ هوزانێ هوزانا پوستەر ..

د دیوانا هوزانڤان خلیل دهوکی‌دا هندەك هوزانێت ژ ڤی رەنگی هەنە وەك «زالم ـ دەربەگ دایێ ـ فەنەر» هوزانڤان دڤی کەڤالی‌دا دگەل پیرە دایکا خو دئاخفیت‌و دبێژتێ :
پیری دایێ

لخو بزڤرەو کوڤان‌و ژانا ڤەهیرە ..
ما نزانی
یا ئەڤروکە دروستبونا
برین‌و رویدانا پیرە ..
هلو .. ژ ئیرو پێڤە
چیروکا کاروانێ بریڤە
بوتەڤ زاروکا ڤەگێرە ..
هەر ڤەگیرە .. ب 120

پشتی مە هەولدای روناهیێ بەردینە ل سەر چەند لایێت قەنج د هوزان‌و هرزێت سەیدا خلیل محمد دهوکی‌دا ، ئەڤجا هندەك پسیارو کێماسی سەرێ خو هەلددەن .

بێ گومان ژ نیشانێت هوزانا ئازدیخوازو پێشکەفتی ئەوە ، پەیوەندیەو دلوڤانیەك دگەل شورش‌و میللەتێت جیهانێ هەبیت ، ژلایێ ڤی بابەتی‌ڤە کێماسی‌یا لنك دهوکی هەی یانکو مەبەستا مە ئەوە دهوکی هەر یێ مای دڤافکا نافخویێ‌داو دەرنەکەفتیە ! .

ئەڤجا ژبەر هندێ کو هوزانا نوی نامەکا راگەهاندنێ‌یەو هوشیارکرنێ‌یەو ئالاڤەکە (اداة) ژبو زێدەکرنا برایەتیێ‌و ناسینێ دناڤ بەرا میللەتادا ... پێتڤی بو هوزانڤانی باسێ حالێ هندەك میللەتێت تەپەسەر کربا د جیهانێ‌داو هەروەسا دڤیا هوزانڤانی دەستوداریێ هندەك میللەت‌و شورشا لڤێ جیهانێ

خویا کربا بو خوینده‌ڤان ، راسته ئەم دزانین کو ئەدەب‌و هونەریێ ئارمانجبەر ئەوە یێ بێتە تەرخان کرن بو میللەتی‌و کوریێت میللەتی بەلێ نابیت ئەم خەم خەبات‌و بزاڤێت میللەتێت پاش گوهێ خوڤە باڤێن‌و کوریێت میللەتێ خو یێ ئاگەدار نەکەین .. چنکو قەنجی ژ من‌و تە .

ژ راستێت ئەم هەمی باوەریێ پێ دئینین ئەوە ڤەژین‌و تومارکرنا فولکلوری‌یە ، ب راستی ئەز گوهشیم جاخێ من دیتی هوزانێت سەیدا دهوکی دویرن ژ فولکلوری !!!

راستە ئەم هەمی داخازا هەڤچەرخیێ دکەین چنکو ئەڤ سەردەمە سەردەمێ هەڤچەرخیێ‌یە د هەمی شولادا ، لێ تورەڤان‌و هونەرمەندێ کورد نابیت دویر بکەڤیت ژ فولکلوریێ باب‌و باپیرا .. بەلێ دڤێت هەمی دەما پەیوەندیەکێ چیبکەن دناڤبەرا هەڤچەرخیێ‌و فولکلوری‌دا ، ڤێجا فولکلوریێ مە یێ زێرین یێ کو پێك هاتی ژڤان گولا «گوتنێت مەزنا ، داستان ، چیروك ، یاری‌و گالتە ، ستران ، رەوشت ...»

ما نەمخابنە سەیدایێ خەلیل دەستێ خو نە درێژ کریە هندەك ژ ڤان گولاو نەدانایە دناڤ باغێ هوزانێت خو ؟! .

تشتەکێ دێ سەرنجا من راکێشا دەمێ خواندتا دیوانا «تە چ ڤیاو من نەئانی» ئەو ژی ئەوە ، بەهرا پتر ژ هوزانێت ڤێ دیوانێ ئاخفتنە دگەل شرینێ‌و نارینێ‌و جانێ ژبلی جارەکێ دگەل وەلاتی‌و جارەکێ دگەل پیرە دایێ !!

مەبەستا مە ئەوە بوچی بەهرا پتر ژ ئاخفتنێ دگەل شرین‌و نارینێ‌یە ؟ ئەرێ ما دهوکی دناڤ دەڤەرا کوردی‌دا ناژیت ؟ یا بوچی ئەم وێنێت ژیانا کوردەواریێ‌و سروشتێ کوردستانێ ژ (چیاو بەفریێ‌و شەفەروکاو غەزال‌و هەلز دروینێ‌و کەواو شەڤبێریت گونداو زبارا ... هتد) د هوزانا وێدا نابینین ؟ ل دویڤ هزرا من مادەم دهوکی کوردەو د دەڤەرا کوردی دژیت پێتڤیبو ئەوی هندەك وێنە ژ ژیان‌و سروشتێ کوردستانێ تومار کریانا ، چنکو ئەگەر من شیعرەکا زائیری یان ئەندوونووسی یان ئەنزەویلی خواندو شاعیرێ ڤێ وەلاتێ د شیعرا خودا ئاخفبیت ل سەر ژیان‌و سروشتێ‌و رەوشتێت وەلاتێ خوبێ گومان هەر وەچکی وی شاعیری وێنەکێ فوتکرافی یێ وەلاتێ خودایە من .

ل دور شێوازێ (اسلوب) هوزانڤانی د ڤەهاندنا هوزانادا ، چاکەو هەمی خویندەوار د هوزانێ دگەهن چنکو دویرە ژ مژو موران‌و وەرپیچانێ ، بەلێ دووبارەکرن دهزرو وێنادا ل هندە جهێت ڤێ دیوانێ خویا دبن وەك ، د هوزانا (گێژنەکا دی یا بتوزو کادی) دبێژیت :-

**بوهارا من یا دکەت گری ..**
**وەرە .. وەرە .. خوشکە ڤینێ**
**دا نەکەڤین دەردو خەمێت**
**مەم‌و زینێ**
**کیلەشوکا ئەڤێ ژینێ ..**
**ئەڤێ ژینێ ..** ب 26

هەر وەسا دهوزانا (دێ بزڤرەڤە) دبێژیت :

**نارینێ بەسی خو گیروکە**
**زینەکا پر کیلەشوکە**
**ئاخ‌و سەد ئاخ ژڤێ ئەڤینێ ..**
**ژڤێ دویربینێ ..** ب 85

ژبیرا مە نەچیت ئەو فەرهەنگا ل دویماهیا دیوانێ ب راستی تشتەکێ زۆر زۆر جوان‌و هێژایایە ، چنکو هاریکارەکە بو خویندەڤانێ کرمانجیا ژێری دا د هوزانێ بگەهیت‌و بو خویندەڤانێ کرمانجیا ژووری ژووری قازانجە چنکو دێ فێربیتە چەند پەیڤەکا ب شێوێ کرمانجیا ژێری ، لەورا گەلەك پێتڤیەو فەرە هەمی نووسەرێت کورد بڤی کاری راین . ل دویماهیا ڤی پێداچونا سەرپێ ددیوانا (تە چ ڤیاو من نەئانی) مە دڤێت بێژین ، خلیل دهوکی شاعیرەکێ مەزنێ شیعرا هەڤچەرخا کوردی‌یەو خودانێ بزاڤەکا روشنبیریا بەرفرەهە نەمازە د بەلا ڤکرنێ‌داو ئامادەبون ل کورو میهرەجاناو ویژی رێکەکا تایبەتی‌یا هەی بو هاتنە ناڤ جیهانا ئەدەبی‌و هوزانێت وی باغچەکە ژ دارستانا هوزانا کوردی یا رەنگین .

بەری خامەی دانین دێ بێژین ئارمانجبەرترین دوو سێ رستە دڤێ دیوانێ‌دا ئەڤێت خارێنە :

**(سەر بلندی نە هەر هندە**
**مروڤ چ چارا نەکەڤیت ..**
**بەلکو هندە ، دەمێ دکەڤیت**
**جارەکا دی**
**رابیت‌و ژ نویکا ببەزیت) ..** ب 61

* ئەڤ نڤیسینە هاتە پێشکێشکرن ل کورەکێ ناڤخویی یێ ئێکەتیا نڤیسەڤانێت کورد - تایێ دهوکێ

# شەخسییەتەکانی کۆمەڵە چیرۆکی

**سەرەتا**

تیرۆژ ، یەکەمین کۆمەڵە چیرۆکی نووسەری لاو حەمە کەریم عارفە سالی 1979، لە چاپخانەی راپەرینی شاری سلێمانی بە قەبارەی ( نیو بەتاك ) چاپ کراوە .. بریتی‌یە لە (14) پارچەی ئەدەبی‌و چیرۆکی زۆر کورت ( اقصوصە ) ، لە نێوان سالانی 1976 ـ 1978دا ، نووسراون‌و هەندێکیان لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا بلاو کراونەتەوە ..

سەرەتا کە رەخنەگر دەست دەداتە خوێندنەوەو هەلسەنگاندنیان تووشی جۆرە دۆش دامانێک دەبێ‌و نازانێ چلۆن مامەلەیان لە تەکدا بکات ؟.. ئایا بە پارچە پەخشان ، خاطرە ، یاخود بە کورتە چیرۆك ، یان بە چیرۆکی زۆر کورتیان لە قەلەم بدات ؟

کورتترینیان بریتی‌یە لە نزیکەی (200) وشەو درێژینیان لە دەوروپشتی (800) وشەدایە .. جێی باسە ئەو (14) پارچەیە (59) لاپەرەی نیو بەتالیان داگیر کردووە ، کە هەر پارچەی شتێ زیاتر لە (4) لاپەرەی بەر دەکەوێ ..

شارەزایانی ئەمرۆی هونەری چیرۆك ، کورتە چیرۆك‌و چیرۆکی زۆر کورت لێك جودا دەکەنەوە .. بگرە هەندێ جار بە دوو هونەری جیاوازیان لە قەلەم دەدەن ..

« چیرۆکی زۆر کورت قەبارەی لە نێوان پێنج سەد هەتا هەزارو پێنج سەد وشە دایە .. گونجاوترین‌و سوودمەند ترینیان بۆ بلاوکردنەوە ئەوەیانە کە خۆی دەدات لە دەوربەری هەزارو پێنج سەد وشە .. بە پێچەوانەی ئەم کورتی‌یە ، ـ کورتە چیرۆك ـ ی ئاسایی‌یە ، کە بەزۆری لە نێوان پێنج تا شەش هەزاروشەدا سنوری بۆ دیاری کراوە ..»(1) .

بەم پێیە هیچ کام لەم (14) پارچە ئەدەبی‌یەی تیرۆژ ناچنە خانەی کورتە چیرۆکەوە .. نەك هەر ئەوەندە ، بەلکو لەو چواردەیە تەنها چواریان بە چیرۆکی زۆر کورت حساب دەکرێن ئەوانیش بریتین لە (هەستێکی لەبار چوو ، پرشنگ ، دەستار ، ڤێللا ) ، ئەوی مایەوە لە پێنج سەد وشە کەمترن. بۆیە دەچنە خانەی پارچە پەخشان یاخود (خاطرە)وە .. چونکە بە دوو یاخود سێ لاپەرەی قەبارەی نیو بەتال نووسەر ناتوانێ جەمسەرەکانی شەخسییەتی سەرەکی‌شی‌بکاتەوەو رووداوێکی تێ بئالێنێ مل ملانێ دروست بکات .. وەهایش لە خوێنەر بکات بیباتە ناو جیهانە تایبەتی‌یەکەی خۆیەوە کارێ بکات شتێ لە مێشکی خوێنەردا جێ بهێلێ‌و تا ماوەیەك لە دەفتەری یادەکانیدا بن بنێتەوە ..

ئەم هونەرەیش ، ئێمەی رۆژهەلاتی داهێنەری نەبووین .. بەلکو هونەرێکە زادەی بیری رۆشنبیرانی ئەوروپایە .. ئەوانیش ئەمە رایانە لەسەر کورتی‌و درێژی چیرۆك ..

ئەگەر ئاورێك لە سەرەتاکانی چیرۆکی خۆمالی بدەینەوە، دەبینین کە نووسەرە بەرایی‌یەکانمان لەسەر پێ‌و دانگی ئەوان رۆیشتوون . ( لەخەوما )ی جەمیل سائیب (46) لاپەرەی قەوارەی بەتالەو نزیکەی‌نۆ هەزارو دووسەد وشەیە ..

هەروەها ( فی القطار )ی محمد تیمور ، کە بە یەکەم کورتە چیرۆکی هونەری‌ی عەرەبی دادەنرێ‌و سالی ( 1917 ) بلاوکراوەتەوە ، بریتی‌یە لە (6) لاپەرەی قەبارەی جەریدەو لە هەزار وشە پترە(2) .

بەهەر حال ، نووسەری هێژا ، حەمە کەریم عارف ، لە پێشەکی‌ی بەر هەمەکەیدا ـ چپەیەك ـ خوێنەری کردۆتە سەر پشك بۆ دەربرینی راو سەرنجەکانیان .. لێرەوە بەدیار دەکەوێ کە دەیەوێ گوێ لەرای خەلکی دەوروبەری بگرێ تاکو بتوانی بەرەو پێشەوە هەنگاوی سەرکەوتووتر هەلگرێ ..

**بۆچی خەلکی چیرۆك دەخوێننەوە ؟**

خەلکی ، بۆیە چیرۆك دەخوێننەوە ، تاکو چێژی لێ وەربگرن .. تاکو ئەو چەند ساتەی دەرفەتیان هەیەو بێ ئیشن بەفیرۆ نەچێ . بۆیە خۆیانی پێوە خەریك دەکەن .. بەلام (چێژ لێ وەرگرتن ) دەستەواژەیەکی بێ‌گیان‌و مردوو نی‌یە .. مانای زۆر هەلدەگرێ‌و لق‌و پۆپی لێ‌دەبێتەوە ..

مرۆڤ گیاندارێکە سەر بە زۆر کولانی تەنگە بەرو دەرنەچوودا دەکات .. حەز دەکات لە هەموو شتێك ئاگادار بێ، لە هەموو بوارێ بدات .. حەز دەکات بزانێ خەلکی لەو دیو دیواری مالەکانیانەوە چۆن چۆنی دەژین ؟

داخۆ ئەوانیش وەك خۆی دەخۆن‌و دەخۆنەوەو گورانی دەلێن یان جیاوازن ؟.. داخۆ خەلکی بیرو راو روانینیان بۆ ژیان کوت‌و مت وەك هی ئەم وەهایە یان جیاوازن ؟..

مرۆڤ هەمیشە بەرەو پێگەیشتن ، بە پلیکانەی ژیان‌و تەمەندا هەلدەکشێ‌و دەیەوێ لە خەلکی دیکەوە فێر ببێت‌و دەرس وەربگرێت .. دەرس لە ئەزموونەکانیان ، ئەقل لە خەسارەکانیان فێر ببێت .. مرۆڤی خوێندەوار بۆیە سەری بەسەر چیرۆکدا دادەژەنێ تاکو لەژیانی هەندەران شارەزا بێ ..

دیارە ئەو بۆی نالوێ لە نزیکەوە خەبەرداری ژیانی خەلکی هەندەران بێ ، بەم هەموو شارو دێ‌و کیشوەرە جیاوازانەوە، بەم هەموو نەتەوە جۆراو جۆرانەوە .. ناشتوانێ لە دەرگای هەموو کولان‌و باخچەو کەوالیس‌و مالە لۆردو کۆنتێك بدات‌و بۆی نالوێ .. بەلام بەهۆی چیرۆکەوە .. لە رێگای

# - تیرۆژ - و هەڵس وکەوتیان

رزگار عبدالواحد

شەخسییەتی ناو چیرۆکەکانەوە دەتوانێ لە نزیکەوە بیانناسیت‌و شەرە کەوچکێشیان لەگەڵدا بکات .. تەنانەت لە بیرکردنەوەو نهێنی‌و ناخی دەروونیشیان شارەزا بیێ ..

کەوابوو خوێنەر زۆر شت لە چیرۆکەوە فێر دەبێ .. بەم پێیە ئاستی رۆشنبیری‌ی شتێك پێی بەرز دەبێتەوە .. رەنگە مرۆڤی وەهایش هەبێ لاسایی شەخسییەتەکانی ئەو چیرۆکانە

بکاتەوە کە دەبنە مایەی هەژاندنی .. شوێن پێیان هەڵبگرێ‌و وەکو ئەوان بجوولێتەوە .. لێرەدا ئەرکی سەرشانی چیرۆك نووس دەردەکەوێ بۆ هەڵبژاردنی کارەکتەری نموونەیی‌و جوولاندنی لەکات‌و شوێنی نموونەییدا ؛ تاکو ببنە پێشەنگ‌و رابەر بۆ خوێنەران‌و خەڵکی لێوەی فێر ببن .

**هەڵس‌و کەوتی شەخسییەتەکانی تیرۆژ :**

لە ( هەستێکی ورووژاو )دا ، گزنگ‌خان لەدڵەوە ( ئازاد)ی فەرمانبەری خۆش دەوێ ، ئازادیش بڕیاری داوە ژن نەهێنێ چونکە : « پێشبینیم ئەوەیە کە ــ 5 ــ سالی دیکە دەمرم .. منێ کە ــ 5 ــ سالی تر بمرم .. بۆچی ئافرەتێك بکەم بە دایکی منداڵ‌و بیاندەمە دەستی زەبرو زەنگی رۆژگارەوە »(3) .

ئێمە لەو زیاتر کە ئازاد وەك فەرمانبەرێکی خەمبارو نەرم‌و نیان دەناسین، ئیتر هیچی تر لە بارەی ژیانی‌یەوە ئاگادار نین نووسەر ئەوەندە رۆشنایی نەخستۆتە سەر ژیانی تاکو لە هەموو بوعدەکانی ئاشنا ببین .. دەبوایە بمانزانیایە بە چ نەخۆشی‌یەك گرفتارە .. دەبێ ئەوەیشمان لەیادبێ کە ( هەستێکی ورووژاو) لە چیرۆکی زۆر کورت کورترە .. بۆیە نە لە وردەکاری‌ی ژیانی ئازادو نە گزنگ‌خان ئەوەندە نازانین تاکو بۆ دوا رۆژ شتێکمان لەلا بەجێ بمێنێ ..

ئەم حاڵەتە لە ( پرسیارێکی نامەزرۆ )شدا دووبارە دەبێتەوە. هیچ جەمسەرێك لە جەمسەرەکانی شەخسییەتەکە نازانین .. ئەوەند هەیە کەسی ئەم چیرۆکەیش لە ژێر باری خەمدا پرژەی براوە .. پرسیارەکانی بۆ وەلام نادرێتەوە .. « ژان پرسیارێکی زیت‌و وێڵی دووی وەلامێکی لە بیرکراوە »(4) ئەم کابرایە بە تەنگ‌ئیلتیزامەوە نی‌یە .. دەسگیرانەکەی کە زۆری خۆش دەوێ، ناوەستێ لەسەری تاکو بۆی ببێتە ژوان .. خۆی دەداتە دەست شەقامەکان .. ژیان بەبێ هوودە دەزانێ .. چیرۆکەکە تەواو دەبێ‌و ئەم وەلامی پرسیارەکەی دەسگیر نابێ ..

دیارە، شەخسییەتی سەرەکی چیرۆك پێویستە سێ بوعدی هەبێ .. ناوەناوە یاخود سایکۆلۆجی ، ئەمجا دەرەکی ، هەروەها بوعدی کۆمەڵایەتی .. وا بەهۆی شپرزەیی‌و خۆ دانە دەست تەنیا باڵی‌و وێڵ بوونی سەر شەقامەکان زانیمان کە

کابرایەکی شپرزەو نامۆیە .. ئەی چۆن بزانین سەر بەکام چین‌و توێژی کۆمەڵە .. کەسی یەکەمی چیرۆك پێویستە ئەو سێ لایەنەی لەبیر نەکرێ ، دەنا دەبێتە کەسێکی وەهمی‌و زوو کاڵ دەبێتەوە . تابۆکەی نایەتەوە بەر چاوی خوێنەر .. دەبێ بە ئینسافەوە بڵێم هەندێ جار بۆ روون کردنەوەی باری نەفسی‌ی کارەکتەرەکان ، سەرکەوتنی بەدەست هێناوەو ئەم لایەنەی رەچاو کردووە . « چیرۆك نووسی هاوچەرخ لەدیوی ( ناوەوە) وێنەی کەسانی چیرۆکەکەی دەکێشێ . لەرێگای بیر کردنەوەو هەڵس‌و کەوت ئەزموونیان لەسەر ئەو بارو دۆخەی دەورو خولی داون . لە شێوەی ئاخاوتنیانەوە هەروەها لە رێگای جوولاندنی لەشیانەوە ، وەك رەوت‌و رۆیین‌و هێماکردن بەدەست‌و زەردەخەنەو پێکەنین .. »(5) .

لەم رووەوە تا رادەیەکی باش بۆ رەسم کردنی شەخسییەتی کابرای شێتی چیرۆکی ( شێتخانە ) سەرکەوتنی بەدەست هێناوە .. چ گفت‌و گۆو چ هەڵس‌و کەوتی کابرای شێت لە جێی خۆیاندان .. لەم رووەوە دەڵێم هەرچەندە سەرچاوە سایکۆلۆجی‌یەکان کەس ناکەن بە چیرۆك نووس، بەلام خوێندنەوەیان، بە تایبەت بۆ چیرۆك نووس پێویستە «هیچ نووسراوێك لەسەر سایکۆلۆجیای ئەدەب لە توانایدا نی‌یە بەرە بە مەوهیبەی شاعیر، رۆمان نووس، نورسەری کورتە چیرۆك، یاخود نووسەری شانۆ بدات . لە توانایشیدا نابێت جێگای ئەو زانیارییانە بگرێتەوە کە راستەوخۆ لە ژیانەوە وەردە گیرێ .

بەلام دەبێتە هۆی تێگەیشتنی روونتر لەگرێ‌و حاڵەتە دەروونی‌یەکان .»(6) کارەکتەری چیرۆکی (گورێ)یش نازانرێ کێ‌یەو چ کارەیە . مەگەر بەومرا بزانرێ پیاوە کە جگەرەکێشەو رووداوەکە لە دوای خواردنەوە دەگێرێتەوە . ئەگینا نووسەر هیچ جەمسەرێکیمان بۆ روون ناکاتەوە .. بە ئەلبوومەکەیدا دەگەرێ‌و یادی ناساوێکی دەکاتەوە چۆن نراوەتە گۆڕەوە!

ئەوەندە هەیە ئەم کارەکتەرە رووداوی لە گۆڕنانەکە نەك هەر خۆی دەبگێرێتەوە، بەڵکو ئەمیش لە زمانی خەڵکی دیکەوە دەبگێرێتەوە .. « بۆیان گێڕامەوە ، هێنایانە دەرەوە، پێتیان وت، چاڵێکمان بۆ هەڵکەنە ...»7

ئەوەی لێرەدا پێویستە بوترێ ئەوەیە کە دراما بەگێرانەوە (سرد)دروست نابێ . بەڵکو پێویستە وەك دەستووری شانۆگەری کارەکتەرەکان خۆیان دراماکە یاری بکەن .. واتە پێویست بوو لە چیرۆکەکەدا کێشەکە دروست بوایە .. پێویست بوو ئێمەی خوێنەر لە دێرەکانی چیرۆکەکەوە کارەکتەرە کە بە زیندوویی ببینین .. هەڵس‌و کەوتی .. هەڵچوونەکانی .. دایەلۆگ‌و بەگژا چوونی .. نەك یەکێك بێت‌و بە زمانی یەکێکی دیکەوە بۆمانی بگێرێتەوە ..

بۆ مەسەلەی ڕەسم کردنو دروست کردنی شەخسییەتەکان گەلێ جار نەیکردووە ( ناو ) یان لێ بنێ ، بەڵکو هەندێ جار ( بێ ناون .. دیارە ( ناو ) زۆر شتمان بێ دەڵێو بڕێ جار شتێ لە جەمسەری کۆمەڵایەتی کارەکتەرەکەمان بۆ روون دەکاتەوە .. بۆ نموونە ( کارزان ، شۆخان ، ناسۆ ، ڕێبوار ) ناوی تازەن ، ئەوە دەگەیێنن کە کارەکتەرەکان بە تەمەن گەنجن‌و ڕەنگە شارستانی‌و خوێندەوار بن ، کەچی ( فتاح، رۆستەم ، عباس ) ئەوە دەگەیێنن کە بە تەمەن گەورەن ، لادێ نشینن ، ڕەنگە نەخوێندەوار بن .. هەندێ جار ( ناو ) لە وەیش زیاتر روون دەکاتەوە ئەگەر سیفەتێکی درایە یان وەك : ( کوێخا عەلی ، مەلا قادر ، حاجی عوسمان .. هتد ) .

کەسانی چیرۆکی ( لوێچێ ئەشکی سوێر ، زام‌و ژان‌و ئاگر ، پرسیارێکی تامەزرۆ ، ئێ چی‌یە ، گۆڕ ، شێتخانە ) بێ ناون .. لە چیرۆکی ( ئەوو هەنگاو شەقام )دا ، ( ئەو )ی کردووە بە کارەکتەری سەرەکی .. ( ئەو ) بڕوای وایە کە « ئادەمزاد لەبەردەم ژاندا هەڵنایەت .. لەوانەیە تاوێری خەم بەسەریدا بکەوێ بیرووخێنێ ، بەڵام بۆ هەمیشەیی راو نانرێ »(8) ئەم دایەلۆگە لەرستە سەرەتایی‌یەکەی رۆمانی « پیرەمێردو دەریا »ی هەمەنگوای دەچێ کە دەڵێ :

« مرۆڤ تێك دەشکێنرێ بەڵام نابەزێنرێ » .

دەبوایە کارەکتەرەکە لەبری ( ئەو ) کەسێکی دیاری کراو بوایە هەتاکو ئێمەیش دوای سێبەرەکەی نەکەوین‌و شوێن پێی خۆی هەڵگرین .. ( ئەو ) خەمێکی گەورەی بەکۆڵەوەیە ، دەیەوێ دەسباری کۆڵێك بکات تازەکی لە پشتی ئەسپ داکەوتووە .. تەنیا باڵەو بۆی ناکرێ .. بەدوای ئەو هۆیانەدا دەگەڕێ کە خەمیان کردە میوانی . تا رادەیەك دەسنیشانیان دەکات .. دەیەوێ هەنگاو بنێ‌و بارەکە لە ئەسپەکە بنێتەوە .. لای خۆیەوە ڕەنگی بۆ دەڕێژێ مەرجی کاروانچی‌و سەر قەتار دیاری دەکات .. ئەم کارەکتەرە ئیجابی‌یە .. مرۆڤێکی هوشیارە ، لایەنی چاکەی لەوەدایە کە بڕوای بە هێزی مرۆڤایەتی هەیە . ئەو راستی‌یانەی کە دەرکی پێ‌کردووە لەلای خۆی نایانهێڵێتەوە ، بەڵکو بە دەورو پشتی رادە گەیێنێ.تۆوی خێر دەچێنێ .. کەوابوو دوو خاسییەتی ئیجابی هەیە .

ئەم بەکار هێنانی ( راناو )ە ، لە شوێنی دیکەیشدا سەر هەڵدەداتەوە ، ئەوەتا لە ( ڤێللا )دا ، کارەکتەرەکە ، لە ژیانی ئەو ڤێللا شەش نهۆمی‌یە بێزارە . پرۆژەیەکی نهێنی‌ی لەلایەو ئاشکرای ناکات .. ئەم نهێنی ڕاگرتنە وا لە خوێنەر دەکات تاسەی بکات‌و لێی بە پەلە بێ تاکو زووتر شتێکی لێ هەڵکرێنێ .. لە ڕێگا زۆڵێك دەدۆزێتەوە .. لە کۆتاییدا پرۆژە نهێنی‌یەکەی دەدرکێنێ کە بریتی‌یە لە ئاشکرا کردنی دانیشتوانی هەر شەش نهۆمی ڤێللاکە : نهۆمی یەکەم : ( من )ی تێدایە .. دووەم : ( تۆ ) .. سێ‌یەم : ( ئەو ) .. جوارەم : ( ئێمە ) .. پێنجەم : ( ئێوە ) .. شەشەم : ( ئەوان ) .. هەموو دەستەیەکیش چون‌یەك ، بەرستەی نامەفهووم باس دەکرێن .. واتە جیاوازی‌یەکی ئەوتۆ لە نێوانیاندا نی‌یە کارەکەیش‌نهێنی‌ی وای تێدا نەبوو شایانی باس‌بێ .. نەگەیشتینە راستی‌یەکی ئەوتۆ کە پێشتر لە لامان شاراوە بووبێ .. بەگشتی هیچی وەهامان لەلا جێ ناهێڵێ قووڵ‌و پڕ مانا بێ‌و بیرمان نەچێتەوە .. بۆ نموونە دوانهۆم کە ( ئەوان )ی تێدا نیشتە جێن ، وەکو هەواڵێك کە پێشتر خەڵکی بیستوویانە پێمان دەڵێ :

« پیلان نامەی کامپ دیڤیدیش هاتە مۆرکردن »(9)

دەبێ ئەوەیش بڵێم : نووسەر چیرۆکێکی زۆر کورتی بارکردووە . بگرە باری نوڤلێتێکی لێ ناوە .. بۆیە لەژێریا دەرناچێ .. ئەم هەموو دەستەو تاقمەی لەو ڤێلایەدان، چۆن چیرۆکێکی زۆر کورت دەرەقەتیان دێ؟ .. چیرۆکی زۆر کورت، پێویستە رووداوێکی گچکە، لە ماوەیەکی کورتدا، لەشوێنێکی کورت نەیتوانیوە یەکێتی‌یەکانی لەمەڕیۆنان ڕەت بکاتەوە . یەکێتی کات‌و شوێن‌و رووداو بە زۆری ئەم چیرۆکە زۆر کورتانە کات لە نێوان سەعاتێك تا رۆژێکدا دەبات‌و کەم رێك دەکەوێ بکاتە هەفتەیەك . تەنها رووداوێکیش هەڵدەگرێ بەمەرجێ گەورەو چڕ نەبێ‌و لق‌و پۆپی زۆری لێ نەبێتەوە ، لەسەرزەمینەیەکی تارادەیەك‌تەسك‌دەسووڕێتەوەبە پێچەوانەی کورتە چیرۆکەوە کە بواری زیاترە .. »(10) .

ئەوی ڕاستی بێ بەکار هێنانی ( ڕاناو ) لە بری ( ناو ) بۆ کارەکتەرەکان ، وەها دەکات بێ نموود پیشانیان بدات ، وەکو تریش گوێ نەدانە بە دەوری مرۆڤ‌و وەکو سێبەرو تارمایی سەیر کردنێتی .. هەمووشمان لەوە دڵنیاین کە مرۆڤ،یەکێك لەو شتانەی کە شانازی‌ی پێوە دەکات ناوەکەی خۆیەتی .. بەلایەوە خۆشەویستەو مۆسیقای تێدایە .. خەڵکی حەز دەکەن بەناوی خۆیانەوە بانگ بکرێن ..

لە ( تۆڵەو هەستێکی نارەسەن )دا ، کابرایەکی داوێن پیس پارەیەکی زۆری لە ئافرەتێکدا خەرج کردووە .. شەو دەچێتە گیانی .. ئەم جۆرە بابەتە خەڵکی دەورووژێنن . بە تایبەت هەرزەکار .. کەچی ئەم چیرۆکە بە پێچەوانەوە . لەبەر هەندێ رستەی ئاڵۆز خوێنەر لەو جیهانە دوور دەکەوێتەوە.. گرنگی مامەڵە کردن لەتەك ئەم رووداوەدا لەوەدایە، داخۆ چی‌ی وای لەو ئافرەتە کردووە لە ڕێی ڕاست لابدات ؟ .. ئایا نووسەر توانیوێتی لە پەناوە لەو ( هۆ )یانە خەبەر دارمان بکات ؟.. گەڕان بە شوێن هۆکان‌و دۆزینەوەیان گرنگە ...

ئەنجام ) هەموو لایەکمان دەیزانین .. نووسەر لە شـــوێنی دیکەیشدا ویستوویەتی وێنەی شیعری دروست بکات ، بەلام سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە .. رستەی ئالۆزو نامەفهوومی داوە بە دەستەوە .. بەمەیش خوێنەر لەخۆی تەرە دەکات .. وەکو تریش ، وەك چیرۆك نووسێك ناتوانێ بەسەر کەوتوویی بیرورای خۆیو روانینی بۆ ژیان،بۆ خوێنەر روون بکاتەوە.مادام خوێنەر لە رستەکانی نەگەن مانای وایە هیچی پێ نەوتن ..بام سەرنج لەم دایەلۆگانە بدەین بزانین چیان لێوە فێر دەبین :

- **چەند سالە ئەکتەری ؟**
- **هێشتا لە دایك نەبوو بووم .**
- **چەند دەورت بینیوە ؟**
- **9 x 30 + 27 x 365**
- **کۆی هەمووی دەکاتە چەند ؟**
- **هیچ ...(11) .**

لە ( دەستار )دا ، دەلێ : « سەری گرۆلەی وشـــــەی هەنگاوی گرت بە دەستەوە »(12) .. نووسەر ئەوەندە ئامرازی (ی) ی خستنە سەری بەکار هێناوە ، وێنە شیعرییەکەی شپرزە کردووەو هەستی خوێنەر دەرووشـێنێو بێتاقەتی دەکات ، کە ئەمەیان ئەرکی سەرشانی نووسەر نییە ..

ڕاستییەکەی ، ئەم جۆرە دارشتنانە لە ســـەرەتای حەفتاکاندا وەك شەپۆلێك بلاوبوومەوەو تەنییەوە .. بـــەلام دوای ئەوەی کە زانییان بێ هودەو بێ سودە ، ئەوانەی دایـان هێنا هەر خۆشیان لێی پاشگەز بوونەوە .. ئەم جۆرە رستە نامەفهومانە لەلای گەورە نووسەرانی رۆژهـەلاتو رۆژئاوا بەرچاو ناکەون ..

چەرخەکردنو قوول بوونەوە لە خەمی زاتیداو تێکـەل نەکردنی لەگەل خەمی خەلکی دیدا ، وەها لەبەرهەمی هەندێ لە نووسەران دەکات کە تەنهـــا خۆیـــان تێی بگەنو چێژی لێ وەربگرن . جگە لەوەی فیکری نووسەر بە بەرهـــەمەکەیەوە بەرەوونی هەست پێناکرێ .. بگرە بۆ ئەم جۆرە وت و وێژو وەسفە ئالۆزانە دەتوانین بلێین : لە فیکری ئالۆزەوە سەریان هەلداوە ، یاخود رەنگدانەوەی فیکری نووسەرن .. «راستە فیکرو گفتو گۆ دوو ـ کـــردەوە ـ ی جودان .. بـــەلام ، پەیوەندیشیان لە نێواندا زۆرە .. بۆیە بیرکردنەوەی چـەوت دەبێتە هۆی گفتو گۆی چەوت .. پێچـــەوانەی ئەمـەیش دروستە .. »(13) .

لە کاتێکدا کەسێکی وەك (حەمە کەریم ) بە زمانێکی ئەدەبیو شیعریی لەبار بتوانێت بنووسێت ، ئیتر بۆ پەنا بەرێتە بـەر زمانێکی شپرزەو وێنەی شیعریی نامەفهووم .

ئەگەر چیرۆك وێنە گرتنی واقیعو هەول دان بێ بـــۆ گۆرینی ، ئەوا حەمە کەریم ویستوویەتی واقیع لەرێی ئـەم وەسفەو وێنەو دایەلۆگانەوە خەست بکاتەوە .. بـــــەلام ( هەندێ جار ) بە تەواوی بۆی نەرەخساوە .. چونکە وشەکان مانا نادەن بەدەستەوە . کەچی ئەگەر ویستبێتی ، ئەوا بـــە زمانێکی بالاو شیعریی ، رووداوەکانی وەسف کردووە .. بام سەرنجی ئەم چەند رستەیە بدەین : « ئامانج لە تەنیشتییەوە راکشا ، هالاوی هەناسەی تێکەل بوویــان گـــەرمییەکی تاسە شکێنی بە جێگاو بانو سەراپای ژوورەکە بەخشـــی ، قومری سرکی مەمك کەوتە سەر چلی پەنجە .. شیلەی گولی لێو تك تك دەچۆرایە ناو دەمو گیانی هەنگی ئارەزووەوە .. »(14).

هەندێ جار کارەکتەرەکان نامۆن .. وەك تەنیا بالو بێ دالدە هەلسو کەوت دەکەن .. ئەوەی دەیانەوێ بۆیان ناچێتە سەرو ئۆخەی لە ژیانی خۆیان ناکەی .. بە ئاوات ناگەنو لـــە دەورو بەر بێزارنو بە دلی ئەوان نییە .. بـــام دەنگیشیان هەلبرن بەلام گوێی دلسۆز نییە دەنگیان ببیستێو دەســـتی دلسۆز نایەتە.کۆمەکیان نووسەر توانیوێتی ئەم دیاردەیە بخاتە بەر چاوی خوێنەر .. کارەکتەری ( نوشـــتە ) لەبـــەری رەنجی خۆی ناخوات .. پەیامەکەیشی بۆ کورەکانی بـــەجێ دێلێ .. (ئازاد )ی کارەکتەری لەمەر (هەستێکی ورووژاو ) هیچ دلی بە دنیاوە نییە ، ئەوپێشبینی وایە تا پێنج ســـالی دی دەمرێ ، بۆیە دەستی تێی ناچێو دلی نای هێنێ تـــانو بۆی هێلانە بۆ ژیانی جووتەیی بچنێ .. مندالەکەی لەمـــەر ( لوێچن ئەشکی سوێر ) ، بیری دایکی دەکات .. بیری باوەشی گەرمی .. بیری دەست بەسەر داهێنانو شوشتنی بە دەستـــی ئەو ، بەلام بێ هوودەیە .. « چاوی نەسرەوتن ، لەگـــەل نامۆییدا ، کەوتنە راوکردنی خەو ، بیر کۆچەرە ، هـــاودەم شەوێکی سامناکە ، مەنـــزلگای خـــەمو جـــێ ژوانی تاسەکانە .. »(15) .

ئەم ئاوارە بوونە ، وای کردووە بەشێك لە کارەکتەرەکان تووشی دلە راوکێ (القلق) ببن .. خەویان لێ بزرێو لەگەل خۆیاندا قسە بکەن .. واتە یەك لایەنی بلوێن .. دیارە ئەم دیاردەیە نیشانەی تووش هاتنی دلە راوکێیە .. لە چیرۆکی ( بۆچییە ؟ )دا ، لەوەدایە لێی تەشەنە بکـــاتو تووشـــی ( اعصاب ) ببێ .. کابرا شانۆ نووسە .. « هەموو شتێك لەبەر چاوی پەشمە ، هەست بە نامۆیی دەکات ، بۆشاییەکی سەیرو قورس لوولی داوە .. چوار چێوەو سنوورەکان خر داخراون، دیسانەوە،باوەشی کردەوە بە بێ دەنگییەکەیدا»(16). کەسێکی سرکو سلۆکە .. دەیەوێ جانتاکەی هەموو جیهان بگرێو بۆی ناچێتە سەر . لەگەل خۆیدا دەدوێ .. ئەمەیش نیشانەی

( قلق )ە .. ژیانی تەنیایی‌و تێکەڵ نەبوونی خەڵکی ، دەردی گرانتر دەکات .. شەو لەلای ئەم جۆرە کەسانە نابڕێتەوە ..

ڕۆژنامە نووسێکی لێ پەیدا دەبێ‌و دەبێتە مشت‌و مڕیان ..

ئەم هەڵدێ .. کاتێ کە بۆ کلیلی جانتاکەی دەگەڕێ بۆی دەر دەکەوێ کابرای ڕۆژنامە نووس کەس نی‌یە خۆی نەبێ ..

فروێد ، وەهای بۆ چووە : کە دڵە ڕاوکێ ( القلق ) لەگەڵ لە دایك بوونی مرۆڤدا لە دایك دەبێ .. کاتێ نە تاریکی‌ی منداڵدانەوە ، لەو شوێنە هێمن‌و ئارام‌و مسۆگەرەوە بێ دەنێتە ژیانەوە .. یەکەمین هەناسەو یەکەمین گریانی ئەنجامی دڵە ڕاوکێ‌ی ئەم جێ گۆڕکێ‌یەوەیە .. پاشان دوورکەوتنەوەی لە دایکی تووشی دەکات .. پاش ئەوە منی باڵا ( انا الاعلى ) تووشی دەکات کەلە قۆناغی نەو جوانی (مێرد منداڵی )دا دەستەڵاتی باوك دەگرێتەوە .. ئەمجا ترس‌و گومان پەیدا کردن لە پیاوەتی‌ی خۆی‌و گومان کردن لە سەلامەتی‌ی دەزگاکانی زاووزێی خۆی ، دەیخەنە دوو دڵی‌یەوە .. هەر بۆیەکا بەلای فرۆیدەوە ئافرەت کەمتر تووشی دڵە ڕاوکێ دەبێ .. فرۆید ئەم حاڵەتەیش دەبەستێتەوە بە ( لبیدو )وە ، واتە بە وزەی جنسی‌یەوە .. بەڵام نکوولی لەوەیش ناکات کە « دڵە ڕاوکێ لە بنەڕەتدا ، بۆ حاڵەتی پەیدا بوونی مەترسی وەکو کاردانەوە ( رد الفعل ) پەیدا بووە. جارێکی دیکەش هەرکە مەترسی پەیدا بووەوە ، ئەویش سەر هەڵدەداتەوە .. »(17) .

ئەم دڵە ڕاوکێ‌و ترس‌و ڕاڕایی‌یە وەها لە چیرۆکەکاندا دەدوێن‌و دایەلۆگی یەك لایەنی‌یان هەیە .. لە ( پرشنگ )دا .. کەسی یەکەمی چیرۆکەکە هەر خۆی دەپرسێ‌و هەر خۆیشی وەڵام دەداتەوە .. « ـــ کار لەکار ترازاوە ، دەبێت هەر بڕۆم، بواری گەڕانەوەم لێ تەنراوە » .

دوای ماوەیەك هەر خۆی وەڵام دەداتەوە :

« ـــ وا دیارە ئەم کۆڵانە تاریکانە ، دەبێت لەبری قیر ...

هتد »(18) .

شارەزایانی چیرۆك وەهای بۆ دەچن کە دایەلۆگ جگە لەوەی لە باری دەروون‌و ئاستی هوشیاری‌و ڕۆشنبیری‌ی شەخسییەتەکان ، خوێنەر ئاگادار دەکەنەوەی لەبەرز کردنەوەی پلەی دراماو ( التصعيد الدرامي )یەك لایی کردنەوەی کێشەکانیشدا دەوری هەیە .. بەڵام کە دایەلۆگ یەك لایەنی بوو ، ئەو ڕۆڵەی نامێنێ‌و کێشەکان تەنیا لەناو زاتی شەخسییەتەکان خۆیاندا دەمێننەوە .. ئەمە ئەگەر مۆنۆلۆج بوایە جێی خۆی بوو .. چونکە بۆ شیتەڵ کردنەوەی دەروونی شەخسییەتەکان بەکار دەهێنرێ .. ئەم دایەلۆگە یەك لایەنی‌یە لە( دەستاړ )و ( گۆڕ )یشدا دووبارە بۆتەوە ..

ڕاستی‌یەك بە شەخسییەتەکانی ( تیرۆژ )ەوە ، ئاشکرا دیارە ، ئەویش ئەوەیە : ئەم کارەکتەرانە ، بە هەم هەڵچوون‌و بەگژاچوون‌و خۆ خواردنەوەو وەڕس بوون‌و تەباڵی‌و نامۆیی‌و دووره پەرێزی‌و دڵدڵی‌و خواست‌و ئاواتیانە خەڵکی ئەم وڵاتەن .. کوردن .. خۆماڵین‌و خوێنەر هەیوێنەی خۆی لەناویاندا دەدۆزێتەوە ..

نووسەر دەتوانێ بە زمانێکی کوردی‌ی پاك بدوێ ، وێنەی شیعری دروست بکات ، گەلێ جاریش توانیوێتی ڕستەکان چڕو پڕ مانا پێشکەش بکات .. وشەی لەگەڵ ناوچەو هەرێمەوە هێناوە .. بەڵام خوێنەر هەستیش بەوە ناکات داخۆ نووسەر خەڵکی کام ناوچەیانە ؟ . ئەوەندە هەیە دەزانێ کەنووسەرێکی کوردە .. ئەمیش شموولیەتی دەداتێ لە قاوغی ناوچەگەری‌ی دووری دەخاتەوە .. بەهیوای بەرەو پێشەوە چوونی‌و بەرهەمی سەرکەو تووتر ..

---

1 ـــ فن الاقصوصة ، ترجمة : كاظم سعدالدين،1978،ص7
2 ـــ بۆ ئەم کورتە چیرۆکە ، بڕوانە : القصة القصيرة،د.الطاهر احمد مكي ، 1977 ، ص 98 ـــ 103 .
3 ـــ تیرۆژ، حەمە کەریم عارف ، 1979 ، ل4 .
4 ـــ تیرۆژ ، ل 15 .
5 ـــ فن كتابية القصة، حسين القباني، ط3، 1972، ص70،
6 ـــ الادب وقضايا العصر ، ترجمة : عادل العامل ، دارالرشيد للنشر ، 1982 ، ص 47 .
7 ـــ تیرۆژ ، ل29 .
8 ـــ تیرۆژ ، ل 36 .
9ـــ تیرۆژ ، ل 57 .
10ـــ فن الاقصوصة ، ص 7 .
11ـــ تیرۆژ ، ل 19 .
12ـــ تیرۆژ ، ل 48 .
13ـــ التفكير المستقيم والتفكير الاعوج ، روبرت هـ . تاولس، ترجمة : حسن سعيد الكرمي ، ص 9 .
14ـــ تیرۆژ ، ل 24 .
15ـــ تیرۆژ ، ل 7 .
16ـــ تیرۆژ ، ل 17 .
17ـــ القلق ، سيجمند فرويد ، ترجمة : الدكتور محمد عثمان نجاتي ، ط2. ، 1962 ، ص 133 .
18ـــ تیرۆژ ، ل 40 .

مسعود محمد

# خۆدیتنەوە لە دوو رەخنەی دۆستانەدا

لەو دەمەرا کە مـوژدەی نزیـك بوونـەوەی دەرچوونی گـۆڤاری (کـاروان) م پێڕاگەیـەنـدرا چـاوەچـاوی هـەوەل تـروسکەی بـووم وەکوو ئـەستێـرەی بـەیـانییـان لەئاسۆی خۆرهەلاتەوە تریفەکانیم بۆ بنێرێ لەگەل بێن و بەرامەی نزار و گولزارێکی تازە گەشایەوەی ئەدەبی کوردی ، کەچی (بەختی خەوالوو) م کردمی بەو ڕۆژوەوانەی کە لە دەمی بانگی ئێوارەدا وەنـەوزی دابێت و خۆی لە تـەراویحی نوێـژی خەفتنـانـدا دیتبێتـەوە . منیش لە ڕۆژی دەرچـوونی ژمـارەی دوەمـدا . ژمارەی یەکەمی کاروانی خنجیلانەم پێ بوو بە ئەستێرە گەشەی پاش خۆراوا و قومە شەربەتی فتاری بە درەنگە کاتەوە . تا من چاوم هەلێنا کاروان بە خۆی و کالای گەوهەریەوە لە کـۆش و بـاوەشی گەرم و گـوڕی مەفتـەن و خـوێشـاوەنـدی کـورد و کوردستانە ئەزەلی و ئەبەدیەکەی حەسابۆوە و گەشـابۆوە .. بالای بە ئالووالای قەلەمچنی ئەدیبە هێـژاکانمـان ئاورینگی پەلکەزێڕینەی دەدایەوە . چیم پێ نەما مەگـەر وەك شابـاشی دوای ئاهەنگی ئەم ڕیزە دراویلکەی وشەی بەسۆز و پەرۆش لەم گوتارەدا بەرەو هەنگاوی کاروانی پێشڕۆوە هەلاوێـژم و پێی ببمە بەشداری شەوارە و گۆزەبانەی کۆڕەیەکی نازدار .

ڕاستییەکەی ، لە دلی خۆمدا چاوی تەمام بڕیبوە بابەتێك لەوانەی کەمتر دێنە بەر نیگای خوێنەرانەوە بەلکوو هەر نەبێ بەهۆی تازەیی‌یەوە شیاوی یەکەم بەخێرهێنانی چلچرایەکی نـوێی ئـەدەبی کـوردی بێ ، بـەلام ڕێکـەوت وەهـا بـوو لە ڕووپەڕەکانی گۆڤار و ڕۆژنامەی ئەم دوایی‌یەدا نووسینی ئەوتۆ بلاو بوونەوە ئەگەر زووبەزوو تێ‌بینییان تێدا نەکرێ کـڕیان بەسەر دەچێ . لە هەوەلەوە ویستم چەند بابـەتێکان لێـرەدا ناوکێل بکەمەوە بەلام خۆم لکاند بە تێرڕەنگ کردنـەوەی دوو بـابەتی سپی‌پـات بوویـەوەی ڕەخنە لێگیـراو کە پێـوەنـدی هاوبەشایەتیم بەیەکیانەوە هەیە و خاوەنی ئەوی‌دیکـەیانم لە هەردوو کاریشدا مەبەستی سەرەکیم ڕوون کردنەوەیـە نەك لەسەرخۆ کردنەوە .

- ١ -

لە ژمارە یەکەم و دوەمی (کاروان) دا دوو بەشی گوتاری مامۆستا ڕەئووف ئالانی لە ژێر سـەرەناوی (نـرخانـدنێك) و (نرخاندنێك دەربارەی زاراوە زانستییەکان) بلاو بوتەوە لەگەل بەلێنی دەرچوونی بەشی‌دیکەشی . هەرچەنـد وەها پـەسەنـد

دەکرێ کە دوای بڵاو کردنەوەی سەرلەبەری بابـەت قەڵەمی تێ بیخی و وەڵام دانەوە بکەوێتە گەڕ بەڵام ئەو بارەی منی تێدام بەبەریەوە نییە پشووی چاوەنۆڕی تێدا درێژ بکەمەوە هەرنەبێ لەبەر ئەوەی کە بە زەحمەت دەستم دەگاتە چاپەمەنی ئەو دوو دانەیەش لە گۆڤاری کاروان بە ڕێکەوت تێیان هەڵنەکووتم جا ئەگەر ژمارەی دیکەی لێ چاپ کرابێ تائێستا 15/2/1983 بەمن نەگەییشتوە . ئەمە لە لایێکەوە . لە لای دیکەشەوە بە هەویا نیم لە ئاست ڕەخنەکانی مامۆستا ئـالانی دا خۆم دانـووسێنم لە هەرچی دەیڵێت و جوابـەجێ یی لەگەڵدا بکـەم . هەم لەبـەر ئەوەی کە کاری وەها لەڕادە بەدەر درێژخایێنە و هەم لە ڕووی ئەوەوە کە زاراوەکان لەسەرەتاوە بۆ ڕەخنە لێگرتن و عـەیب بڕینیان بڵاو کرانەوە . بەو پێیە نووسینەکەی مامۆستا ئالانی وەرگرتنەوەی خوایشتی لیژنەی ئەو زاراوانەیە و سپـاسی بۆ دەچێتەوە لێرەدا من تەنها بەسەر ئەو شتانـەدا دێمەوە کـە ترۆسکەی زاراوسـازی و زماننـاسی لە هەڵگـیر و وەرگێڕیـان هەڵستێتەوە ، ئەویش بایی دەسەڵاتێکی لە بارمدا بێت .

1– لە بارەی ( شێوە ـ ڕواڵەت ـ وێنە ) وە :

وەك من بۆی دەچم وشەی شێوە پتر لە (وێنە ـ ڕواڵەت) هـۆگری (بـابـەت) دەبێت چـونکـە (ڕواڵەت) ڕووکـەشێکی بێ بـایەخـە (وێنە) ش بـەلای شکڵی نـاو ئاوێنـە و کامێـرادا دەچێتەوە . (form) ی ڕۆژاواییش نە ڕواڵەتە و نەوێنـە . ئنجا ئەگەر نیو هێندەی (ڕواڵەت و شێوە) چاوپۆشی لە کەرتی دووەمی زاراوەکە بکەین ئەوسا (شێوەیە ڕوەرایـەتی) گەلێـك بەولای ( ڕواڵەتـایەتی و ڕواڵەتی ) واتـای ( خۆپێـوە بەستنـەوە ) دەگەیەنێ کە لە ئەسلی زاراوەکەدا مەبەستێکی بنەڕەتییە .

2– لە کوردیدا تەعبیری (پیت بەپیت) بەتایبەتی لە نێو مەلایاندا هێندەی دەقاو دەق پتریش لە باو بوو ، هەردووکیان بۆ یـەك واتاش بەکار دەهاتن ئنجا هەر کامێکیان پەسەند بکرێ جێی خۆیەتی بەڵام نابێ ڕێگە لەوی‌دیکە کوێر بکاتەوە .

3– وشەی (ڕارەو) هەر چونکە لە واتادا بەرتەسکترە لە (ڕێگا ـ ڕێباز) پتر دێتە ڕەدایێ بۆ واتای (مذهب فلسفی) کە ئەویش بۆخۆی باریکە ڕێگەیە .

4– لەگـەڵ ڕوون کردنـەوەی مـامـۆستـا ئـالانیش من هـەر لایەنگیری (گومانگر) دەبم نەك (گوماندار) . چی لیژنـەش لە بارەی تێکرای ئەم خاڵەی گوتوە پێوانەی زمانناسانەی تێـدا کراوە . ( تێپەڕ و تێ نەپەڕ ) لێرەدا بێ دەخلە ، کەرتی دوای (گـومان) یش چ (گـر) بێت و چ (دار) هەردوویـان تێپەڕن ، هەروەك دەگوتـرێ باجگـر دەشکوتـرێ پارەدار و ملکـدار و زەویدار وبەرهـەنگرار .. ئـەم پاشگـرەی (دار) لە (داشتن ـ داشتەن) ی فارسییەوە هاتـوە کە (مضـارع) ەکەی دەبێتـە (دارد) و ناوی کارا ی لێ پێـك دێت و دەبێتە (.. دار) . ئـەو مەبەستەی کە لە واتـای (متشكك) دا هـەیە لەگـەڵ (گرتن) باشتر دەروا نەك لەگەڵ (تملك) کە دەکاتەوە ( داشتەن ـ دارەد ـ دار ) چونکە لە (گرتن) دا (نیاز) ئاشکراترە .

5– لیـژنە لە پـەسەنـد کردنی ئـەداتی (ەکی) بـۆ نیسبـەت نەیویست لە هەموو بارێکدا و بۆ هەموو زاراوەیەك هەر (ەکی) بەکار بێت چونکە دیـارە (ی) نیسبەت هی بـەلاوەنان نییـە . تەعبیری (خۆ لێ دزینەوەش) هەر لایەنی ناچاری ڕادەگەیەنێ ، دیارە ئەگەر (ی) نیسبەت بۆ هەموو وشەیەکی دەست دابایە نەلیژنە خۆی لێ دەدزیەوە نە کوردەواریش زمانی لە (لاوەکی ، شەوەکی ..) دەگێڕا . کەس نالێ ونەیگوتوە ( کوردی ، بەهاری ، خۆماڵی .. ) دەبێ ڕەش ببنەوە ، بەڵام بێ گومان ڕستەی ( ئەم کێشەیە هۆشەکییە نەك کردەکی ) هەڵکەوتووتـرە لە ڕستەی (ئەم کێشەیە هۆشی یـە نەك کـردی وەیا کـردنی ) . تا ئێـرە جوداوازی بیروڕا لەم مەیدانـەی نیسبەتـرا دەگەڕێتـەوە بۆ قەناعەتی زمانناس و زاراوەساز چونکە هەردوو ڕێباز شوێن پێی ئاخێوەری پێوەیە ، بەڵام وا دیارە مامۆستا ئالانی (ی) نیسبەت و (ی) ناوی مەعنای بەلاوە یەك شتن : ئا لێرەدا قەناعەت بڕ ناکات چـونکە هـەروەك لە ڕێی قەنـاعەتـەوە (تێپەڕ) نـابێتە (تێ نەپەڕ) هەروەهاش (ی) نیسبەت نابێتە (ی) ناوی مەعنا . دەبێ کاکە ئالانی بەرەودوا بگەڕێتەوە و بە نێوان دوو ڕاستە ڕێی ئەودوو بابەتەدا سەرەژێر بێتەوە بێ ئەوەی تێکەڵیان بکات . خۆ هەرگیز موجامەلەش لەوەدا نییە کە بڵێم ئالانی یەکێکە لە تاك تاکی ئاخێوەری کوردی کە لە سەلیقەی هەستیاری زگماك و بێ خەوشەوە کوردانە دادەڕسێتە گوتن و نووسین ، کوردانە لە

بابەت هەڵدەپێچێت و کوردانە دادەبڕێت و تێ دەکاتەوە . ئنجا ئەگەر ئالانی لەم جووت چاویلکەی بەریانی ڕێزمان پاژنەی تەڕ بووبێ کێ بێ جارەها و بارەها پلیلاوی لە دەقنی نووسین ڕۆ نەچووبێ !!

لە ئاخاوتن و نووسینی ئێستاکەی فارسی و کوردیدا بۆ نیسبەت و بۆ ناوی مەعنا هەمان (ی) درێژی قووچاو بەکاردێت و دەگوترێ ـ بۆ نیسبەت دەشکوترێ (جوانی ـ بۆ ناوی مەعنا) . لە کۆندا بۆ نیسبەت (یك) و بۆ ناوی مەعنا (یهـ) بەکار هاتوە کتێبە کۆنەکانی پەهلەوی و پێش پەهلەوی ئەم جودایی کردنەیان شتێکی دەستوورییە . بە نموونە لە لاپەڕە (10) ی کتێبی کارنامەی ئەردەشێری پاپەکان ـ نووسینی بهرام فرەوشی ، چاپی تاران 1354 ـ ئەم وشانەی ( چاپوکیهـ ، «سواری» ) لە ناوی مەعنا و وشەکانی ( گەرامیك «گرامی ، ڕێزدار» ، ئەپاریك «بەواتای دیگر ، هی‌تر» ، نامیك «نامی ، ناودار» لە نیسبەتدراو دەدیترێن . لە نێوان ڕۆشنبیرانی کوردی ئێرانیش ئەم زانیارییە وەك ئەلفوبێی لێ هاتوە بەلام لای خۆمان مەسەلەکە هێندە ئاشکرا نییە . یەکەم جار لە لایەن د . فاروق عمر صدیقەوە ، کە ئەوسا جاریٔ خوێندکاریش بوو ، باسی بنەچەکی ئەم دوو (ی) ە بە گوتار لە گۆڤاری کوردا بلاو کرایەوە . بە نموونە وشەی (زندیق ، زەندیك) نیسبەتە بۆ لای (زەند) . دوور نابینم ڕیژەی (دەرەکی ، ناوەکی ..) ش لەو وشانەدا پاشماوەیەکی شێواوی ئەم نیسبەتە کۆنەی زمانە ئێرانیەکان بێت هەرچەند ناتوانم بڕیاری لەسەر بدەم چونکە زمانی کوردی بە نووسین شێوە ئاخاوتن کۆنی نەپارێزراوە تاکوو بزانین لە کەنگینەوە ئەو ڕێژەیە پەیدا بوە و ئایا لە بنەڕەتەوە (ەکی) بوە یاخوە لە (یك) ەوە گۆڕاوە . نموونەکانی مامۆستا ئالانی کە لە لاپەڕە ( 71 , 72 ) ی ژمارەی یەکەمی کارواندا بۆنیسبەتی‌حیساب کردوون بەشی زۆریان هی ناوی مەعنان . وشەکانی ( برایی ، هاوبەشی ، وشەسازی ، داماوی ، سەپانی ، کەڵەگایی ، هەرزەکاری ، جودایی ، لاوی ، گەنجی ، ئازایی ، ئازایەتی ، لاوێتی ، گەنجێتی ) هەموویان ناوی مەعنان و پێوەندییان بە نیسبەتەوە نییە لەبەر ئەمە ڕەخنەیەکی لەسەر بنەمای ئەو وشانەوە هەڵستابن بەرەو بۆشایی دەڕۆن .
وا دەزانم بەکارهێنانی (ەکی) بۆ نیسبەت لە شوێن و باری ئاستەنگدا نووسەر و ئاخێوەر ڕەها دەکات بە نموونە .

تیر بۆ شبعان
تیری بۆ شِبعَ

ئنجا ئەگەر ویستمان بڵێین (شبعانی) و ئەو (ی) ەمان بۆ بەکار هێنا هەر دەبێ بڵێین (تیری) کە بۆ (شبع) مان دانا کە ئیتر لەگەل (شبعانی) دا تێکەڵ دەبێ بەلام دەتوانین تا ڕادەیەك چاو پۆشی لەو لەمەرە بکەین چونکە لە هەموو زمانێکدا وشەی واتا جودا دەگەنەوە یەك فۆرم هەروەك لە عەرەبیدا وشەی (ارى ـ فعل مضارع للمفرد المتكلم) دەگاتەوە ( ارى ـ فعل ماضي للمفرد الغائب ) . لەمپەری گەورە لەوەدا دەبێ کە بمانەوێ ڕێژەی نیسبەت بۆ ( تیری ـ بە واتای شبَع ) بەکار بهێنین و (ی) ی تێدا بخەینە گەڕ کە هەر دەبێتەوە (تیری) . ئنجا ئەگەر هانا ببەینە بەر (ەکی) لەمپەر لە نێواندا نامێنێ :

تیر بۆ شبعان
تیری بۆ شبَع
تیرەکی بۆ شبعانیّ
تیرەکیەتی بۆ شبَعیّ

خۆ ئەگەر ویستمان (شبعانی ـ تیرەکی) کە ناوی مادەیە بکەینە ناوی مەعنا ئەوسا بەرانبەر ( الشبعانية ـ کە مصدری صناعییە و ناوی مەعنایە ) دەڵێین (تیرەکیەتی) بڕواش ناکەم دەرفەتێکی‌دیکە لە دەستووراتی زماندا پەیدابێ بۆ دەربازبوون لەم ئاستەنگە . ئەو وشانەی کۆتاییان بە (ی) ی درێژی قووچاو دێت وەك ( برسی ، ترۆزی ، سۆفی ) ناتوانن (ی) نیسبەت بە خۆیانەوە بگرن ، ناشبێ خەیاڵ بۆ ( برسییانە ، ترۆزیانە ، سۆفیانە ) بڕوات چونکە ئەمانە ئاوەڵکارن هەرچی وشەی نیسبەت دراوە ئاوەڵناوە . ئنجا ئەگەر نەڵێین ( برسییەکی ، ترۆزیەکی ، سۆفیەکی .. ) ڕێگەی کورتمان لێ درێژ دەبێتەوە وەیا هەر بەجاری ڕێگەکە کوێر دەبێتەوە .
لە زۆر شوێنی کورد زماندا ئەگەر ناوی جێگە و ئاوایی وەك ( جەلی ، داری کەلی ، سلێمانی ) بە (ی) کۆتایی هاتبێت بۆ

نیسبەت دەڵێن ( جەلیەتی ، داریکەلیـەتی ، سلیمانیـەتی ) واشـدەبێ کورتی دەکـەنـەوە و دەڵێن (جـەلەتی .. ) .ئـەم بەکارهێنانە تا ئێستاکەش باوە و بۆخۆم گوێبیستی بووم بەلام خەریکە لە بن شالاوی شارستانەتی و خوێندنی نوێدا کـە وا گەلێك ئادگاری میراتی تێدەبات ، ئەمیشیان تێبچێت . باوەڕ دەکەم لەو گوندانەی قوتابخانەیـان تێدا کـراوەتەوە تـەنها بـەسـاڵدا چـوەکـان بـزانن بلێن (سـەرووکـانیـەتی ، جیاقوولیەتی .. ) هەرچی وەچەی تازەیە خەریکە ( دار ، دور ، زار ، زیـر ) فێر دەبێ و بـەلای ئەو وشـانەدا نـاچێتەوە کـە مامۆستاکەی لێیان بەلەد نییە .

لە کوردیدا (ی) ناوی مەعنا هەر بـەو وشانـە دەوێری بیانکاتە ناوی مەعنا کە ئاوەڵناون و وەصفی مادە دەکەن نەك خۆیان مادەن وەك : جوان ، جوانی ـ شیر ن ، شیر نی ـ ناسك ، ناسکی ـ دزێو ، دزێوی .. زمانی کوردی وێڕای (ی) سێ ئەداتی دیکەی هەیە بۆ داڕشتنی ناوی مەعنا :

1 — ئەداتی (ەتی) وەك : پیاو ، پیاوەتی ـ دایك ، دایکەتی ـ برسی ، برسییەتی ..

2 — ئەداتی (ریی) ئەمەیان بۆ مەبەسێکی ورد لەکار دێت : بە نموونە ، وشەی (درێژی) بۆ (مطلق الطول) دێت بەلام کە ویستت (هەندێك طول) نەك (مطلق الطول) دەربڕیت دەڵێیت ( درێژایی ژوورەکە ، شیرنایی شەکرەکە ، رووناکایی پەنجەرە ، بەرزایی شاخەکە ، سەوزایی گیاکە ) .

3 — ئەداتی (ایەتی) بـە زۆری بۆ دەرخستنی پێـوەندی نێوان مرۆڤ بـەکار دێت وەك (خـزمایـەتی ، دوژمنایـەتی ، دۆستایەتی ، کوردایەتی ، قەومایەتی ، مەردایەتی ، کەسایەتی ، رابەرایەتی ، عەبدایەتی .. ) . هەر ئەم ئەداتەیشە دەتوانێ ناوی مادی رەق و زەقی بە پۆز وەرگێـڕی بۆ نـاوی واتا وەك ( بەردایەتی ـ التحجر ، الحجریة . گەچـایەتی ، الجیـریە . خۆلایەتی ، ئاسنایەتی ... )

زۆرینەی گەو وشانەی دەنگی دەنگی ئەلفیان تێدایە وەك (برا ، گەدا) ئەلفی (ایەتی) یان دەسوێت و دەبنە ( برایەتی ـ نـەكبرایـایەتی ـ ، گـەدایـەتی نـەك گـەدایـایـەتی .. ) لە شوێنیدیکە ، دەمێکە گەم دیاردەیەی تێچوونی گەو گـەلفەم ڕوون کردۆتە وە لێرەدا ناچمەوسەری ..

نووسەرانی سلێمانی بە پێی ئاخاوتنی ناوچەیی لە جیاتی ( برسییەتی ، ئەمین داریـەتی ، ئیتالیـەکان .. ) دەنـووسن ( برسێتی ، ئەمینداریتی ، ئیتالێکـان .. ) هەرچی زوربـەی کوردە جۆرەکەی دیکەکە بەکارهێنانی رەسەنە پێڕەوی دەکەن . رەسەنایەتی ئەو جۆریان لە دوو بەلگەوە بە ئیسپات دەگات : بەلگەی یەکەم یەکەم ئەوەیە کە زۆرینەی هـەرە زۆری کورد دەڵێ ( برسییەتی ، وەلیەتی .. ) . بەلگەی دووەم ئەوەم ئەوەیە کە ئاخێوەری سلێمانیش لە ناچاریدا بـادەداتەوە بـۆ ڕێبازە رەسەنەکە کە مەجبوورە بڵێ ( ئیتالیە هونەرمەندەکان ) . چارت ناچارە بلێی ( برسییە هەژارەکان ) . مامۆستا ئالانیش بە ڕێبازی ئاخێوەری سلێمانید بـۆ ( لاوێتی ، گەنجێتی .. ) چۆتەوە . هەرچۆنێك بێ ناشێ ڕێبازە رەسەنەکە ڕێی لێ بگیرێ ، تـەنانـەت لە وشەی وەك ( ڕۆشت ، گـەشت ) یشـدا نـاشێ ( ڕۆیشیت ، گەیشیت ) کە ڕاسترە کوێر بکرێتـەوە . بێخود دەڵێ ( لەو ڕۆژەوە ڕۆییشتوە تۆراوە دڵی من ) . نالی دەڵێ ( کی دەستی دەگاتە بەی و ناری نەگەییشتووت ) . حاجی دەڵێ ( کە پیر بووم تێگەییشتم دەستیگرێم ) . ئەدیب لەسەریەتی لەمانە و لە هەرچی وەك ئەمان هەیـە خۆی لە ڕێبـازە رەسەنـەکەی کـوردی رابهێنێ . ئێمە لە سـەرەتاکـانی رەنگڕێـژ کـردنی شێوازی ئەدەبی کـوردیداین ، چی ئێستـاکە رەنگ دابکـوتێ دەبێتە شەقامەڕێی تەعبیری کوردی . ئەو زمـانەی شێـوەی ئەدەبییان دەقی گرتوە لە ماوەی 50 ساڵدا یەك پیتیان لێ ناسوێ و ناقرتێ : کورت کردنـەوەی بێحیساب لە شێـوە ئاخـاوتنی رەمەکیدا دەبێ تا ئەوەی خەلقی توونس لە ئاخاوتنی یەمەن ناگەن سنەییش زەفەر بە وتووێژی ئاکرێ نابات . چەنـدێکی بلوێ لە پاشماوەی کۆنە زمانەکەمان بپارێزرێ سوودی خۆمانە چونکە هەتا بەرەو دەق و دەستووری رەسـەنەوە بـڕۆین پتر خەلقی تێدا کۆدەبێتەوە و لەیەکدی حاڵێ دەبن . کوردی لەودوو هەزار ساڵەدا هێندەی لێ سواوە لە لزوم بەدەر بێ .

بەر لەوەی لە بەشی یەکەمی گوتارەکـە بڕۆم بـۆ بەشی دوەمی چەند وردە تێبینی هەن پێیاندا تێپەڕ بیم :

کەرتەکاری (گر) و پاشگری ( گەر ـ بۆتەوە «گر» ) لە یەکدی جودان : هەرچی (گر) ە کەرتێکی کـاری (گرتن) ە و ناوی کارای لێکدراو ( بەتەعبیری جاران اسم فاعلی مرکب )

دروست دەکات وەکوو کەرتی زۆرینەی کارەکانی دیکە ( جلشۆر ، نانخۆر ، باجگر ، سەرتاش ) . بەعادەت کاری تێنەپەڕ لەگەڵ وشەی (صفە) و لەگەڵ ئاوەڵکاردا وشەی لێکدراوی ئەوتۆیی دروست دەکات چونکە بەرکاری ناوێت وەك ( خۆشڕۆ ، سەرڕۆ ، بەسەرهات ، زۆروەڕ .. ) . هەرچی ( گەر - لە بەشی زۆری وشە لێکدراوی ئێستاکەدا بۆتەوە «گر» ) بارتەقای (ەوان) لەگەڵ ناو دێت و صیفەتی لێکدراو دەکاتە ناوی کەسابەت وەك ( ئاسنگر ، مزگر - دەرگەوان ، پاسەوان ) .

لە وشەی ( نێرکە پیاز ) دا بەشی یەکەمی وشەکە لە (نێرەك) ەوە نە هاتوە بەڵکوو لە (نێرتك) ەوە سواوە . بەگەسڵ ( نێرتکە پیاز و دەستکە قورادە ) بوە . ئێستاش لە هەندێ ناوچەی عەشیرەتیدا پیرەکان ، بگرە زۆر کەسیان (نێرتك و دەستك ) بەکار دەهێنن ، هەروەك وشەی (قەننە) ش دەکەنەوە (قەڵنە) کە پتر بەرەو ( قەلوون و قلیان ) ەوە چۆتەوە

وشەی (ڕیژە) بۆ (صیغە) دەدات نەك (ڕێژگە) هەرچی (ڕێژگە) یە وەك (ئیستگە ، بنگە ، شەرگە .. ) ناوی شوێنە [ نەك ئاوەڵناوی شوێن ] . وشەکەش لە (ڕێشتن) ەوە بەربۆتەوە کە بە هەڵە وەیا بۆ سووك کردن دەکرێتە (ڕشتن) بەڵگەش ئەوەیە کە لە ئایندە و فەرماندا ئەو (ی) ە دێتەوە :

ئاوەکەم ڕێشت
ئاوەکە دەڕێژم
ئاوەکە بڕێژە

( ڕێژە و پێرە ) ش هەر بەڵگەن .

لە وشەی ( کەڵەمێرد ) دا ئەو (ە) یە کە فەتحەی عەرەبییە نێوبەند نییە . دەنگێك دەبێتە نێوبەند (ناوگر) کە بترنجێتە کلێشەی وشەوە نەك بهێتە نێوان دوو وشەوە . بە نموونە لە وشەکانی ( بزووتن ، بزاوتن - بووردن ، بواردن ) ئەو ئەلفە نێوبەند (ناوگر) ە . بەلای منەوە دەنگی (ر) یش لە (گرنج) دا ناوگرە ترنجاوەتە کلێشەی (گنج) هەروەها (ر) ی (قرژ) چۆتە ناو (قژ) .

دەڕۆم بۆ ژمارە دووی کاروان :

کاتی خۆی کە ڕەخنەکانی مامۆستا ئالانی بۆ کۆڕی زانیاری کورد هاتن گەڕماوگەرم لیژنەیەك - بە سەرپەرشتی کردنی خۆم - دەستی دایە ڕێك خستن و ئامادە کردنی ئەو ڕەخنانە و هی‌دیکەش کە لە نووسەری‌دیکەوە هاتبوون بۆ بلاو کردنەوەیان . وێڕای ئەو ڕەخنانە ، ئالانی ، ڕاسپاردەی بەنرخی دیکەشی بۆ کۆڕ جێ‌بەجێ کردبوو لە بابەتی فۆلکلۆر و کەلەپوور .. خەریکی ڕێك خستنی ئەوانیش بووین بەلام ڕێکەوت وەها بوو بەر لە سازدانی ئەو کارانە پێوەندیم بە کۆڕەوە نەما ، زۆریشی نەبرد یاسای تازە دەچوو ( دەستەی کوردی ) خستە شوێنی‌کۆڕ و ئەو بوە بەرپرس . دەمەوێ زۆر بە خێرایی لە بەشی دوەمی نووسینی مامۆستا ئالانی دەرچم : بۆ هەر مەبەستێك بێ (قسەڕستنەوە) بەجێ‌ترە لە ( قسە کاوێژ کردنەوە ) . ڕەنگە (هاوبەندی) ش لە (هاودەنگی) بۆ (ترابط) لەبارتربێ ئەگەر تارمایی (هاونیری) بۆ خۆی نەباتەوە .

(ژیربێژی) بۆ هونەر وەیا زانستی (منطق) و (ژیربێژ) بۆ کەسێکی (منطق‌زان) بێ و (ژیربێژەکی) بۆ نیسبەت وەلای (ژیربێژ) و (ژیربێژیەکی) بۆ نیسبەت وەلای (ژیربیژی) کرە ناکەن . هەرچی (ژیربێژانە) یە ئاوەڵکارە وەك بڵێی : ژیربێژانە دەدوێ ، کوردانە دەپۆشێ ، مەردانە هاتەکایەوە . وشەکان لەم ڕستانەدا وصفی کار دەکەن نەك کارا (فاعل) .

ئەگەر (پۆلاندن) بۆ تصنیف بێنە دەستووری داتاشینی (کار) لە (ناو) خزمەتێکی گەورە بە زمانەکەمان دەکات هەرچەند لە پۆلاندنیشدا هەر واتای کۆ و کۆمەڵ و ئاپۆرە وەردەگیرێ نەك واتای ( جۆرجۆر و خواروژوور ) کە لە (صنف) ی عەرەبی و (class) ی ئینگلیزی وەردەگیرێ . بەلام لزوم نابینم بینی پێوە بنێین و بڵێین ( کابرا چەتری لێدا و خۆی عەلیشیشاند .. ) مەگەر بەنیازی گەپ و گاڵتە کردن بێ .

وشەی (ڕەخسکان) لە ئاخاوتندا باوە هەرچەند لە هەموو هەرێمێکیشدا ئاشنا نەبێ . ئەم نەبیست بوونەی ئەدیبەکانمان کە دەچێتەوە بۆ دوو هۆی سەرەتایی ، یەکیان نەگەڕان و سەر لێنەدان . دوومیان نەبوونی چاپەمەنی لە هەموو هەرێمەکاندا ، تا ئەم نەبیست بوونە زۆنە زۆر جاران دەمەتەقەی هەڵستاندوە تەنانەت جارێکیان نووسەرێکی سەر بەزمان لە ئاست وشەی (چیم) بە واتای ( فریز - فریزوو ) وەها نەسەلمێن بوو هەر لەبنەوە ئینکاری هەبوونی دەکرد . کەچی فریزجار بەواتای

چیمجارە . ئەو پێمەرەیەی بۆ کێڵانی زەوی چیمجاڕ دروست دەکرێ پێی دەڵێن ( پیمەرەی چیمبڕ ) . نووسەرێکی دیکەش بەرانبەر وشەی (ڕایەخ) سەری لەو (ی) ەی ناو وشەکە سوڕمابوو ، بەدرێژی لە تەعلیل پەرێنەوەی یێیەکە بۆناو وشەکەی دەکۆڵیەوە چونکە هەر گوێ بیستی ( ڕاخستن ، هەڵخستن ، خستن .. ) بووبوو کەچی فۆرمی وشەکە ( یەخستن ، یێخستن ، ئێخستن ، هێخستن ) ە لە هەموو شیاندا دەنگی (ی) هەیە کە ئیتر دیارە (ڕایەخ) لەوان کەوتۆتەوە . گۆرانی بێژی کۆیی ( حوسێنی حەبەتۆز ) بەر لە 50 ساڵ پتر قەوانی دەرکرد دەڵێ ( هات کاروانێ کەرداران ، یێخستیان لە بن داران ، لێدەن دەردی حەلۆکێ .. ) . وشەی (تێوەرێخ) لە دوو پێشگری (تێ ، وەر) و کەرتێکی بەرایی (یەخستی) پێک هاتوە . هەر لەو جۆرە گوێبیست نەبوونە جارێکیا دوو فەرهەنگ نووسی کوردی لە وشەی (فروسمان) کە من لە نووسینمدا بەکارم هێنابوو ڕامان و نەیانبیستوو کەچی لە زۆر شوێنی بەری سۆران بە واتای ( ئەفسوون لێخوێندن ، تەلەسم بەند کردن ) لە گەڕدایە . یەک لەو دوو فەرهەنگ نووسە (زەبیحی) دواتر پێمی گوتەوە کە توێژینەوەی لە وشەکەدا کردوە و لە خەڵقی پاڵەکەتی بیستوە لە جیاتی فروسمان دەڵێن (فلیسمان) . وا دیارە وشەی (ڕەخسکان) یش بەوی ڕێک نەکەوتوە بەر گوێگری بەری بابان کەوتبێ . دەنگی (ک) لە وشەسازی کوردیدا دەورێکی چالاکی هەیە ، لێرەدا کارمان بەیەک باری ئەو دەورە هەیە کە دەبێتە پاشگری کار و زێدە واتایەکی تێدا پەیدا دەکات . پاشگری (کا) لە چاو پاشگری (ا) خەستوخۆڵییەک وەیا شێوە گۆڕییەک لە وشەدا پەیدا دەکات . بە نموونە ، لە ڕەگی (بزڕ) ەوە بە هۆی پاشگری (ا) کاری (بزڕان) پەیدا دەبێ . کە پاشگری (کا) ی پێوە لکا دەبێتە (بزڕکان) شێوەیەکی نوێ بۆ (بزڕکاو) پەیدا دەکات لە چاو (بزڕاو) . وشەی (پەشێو) دەبێتە (پەشێوان) و دەشبێتە (پەشێوکان) کە سەختترە لە پەشێوان ، هەر خۆشیەتی بۆتە (پەشۆکان) . دوور نابینم (هەڵپەوان) و (هەڵپەووکان) ش دوو دڵۆپی ئەم خورگەیە بن . نووزانەوە بنگەی وشەی (نووسکانەوە) یە بەڵام دەنگی (ز) بە جیرانەتی دەنگی (ک) بۆتە (س) چونکە هەردووکیان واتە (س ، ک) دەنگی کپن هەرچی (ز) ە ئاوازەدارە لەبەر خاتری (ک) ەکە خۆی کپ کردوە وەک کە وشەی (نازک) کە لە (ناز) ەوە هاتووە بۆتە (ناسک) لەبەر هەمان سەبەب ، (بازوو) ش بۆتە (باسک) . هەرچی وشەی (ڕەخسکان) ە خزمی نزیکی (ڕەخسان) ە و هەردوویان لە واتادا پە ( ڕەخسین و ڕەسین) دەگەنەوە ، بەڵام لە (ڕەخسکان)دا زێدە هێزێک هەیە .

ئەگەر (کۆکر) بە (جامع) وەربگیرێ (کۆنەگر) نابێتە (مانع) : دەبێتە ئەوشتەی هەندێکان دەگرێ و هەندێکان ناگرێ . بۆنەوەی ببێتە پێچەوانەی (کۆکر) دەبێ بگوترێ (هیچنەگر) ئەوساش (هەمووگر) پەسەندتر دەبێ لە (کۆکر) . بەڵام (هیچنەگر) هەر لە بەرانبەر (کۆکر ، هەمووگر) دا دەسازێ نەخۆ (مانع) (هیچنەگر) نییە .

**لە کۆتایی ئەم پێداچوونەوەیەدا دەڵێم ماندوو بوونەکەی ئالانی جێی سپاسە و دەبێ بەوپەڕی هەناسە درێژییەوە لەگەڵ زاراوەکاندا خەریک بێ ، منیش ئەگەر چاوم بە نووسینەکانی کەوت و بەچاکم زانی پێیاندا بچمەوە تا پێم بکرێ تێبینیەکانم بۆ خۆی دەنێرم بە هەرجێک ئەدرەسی بزانم . زۆریش گوشاد دەبم هەر جارە کە دەبینم نووسەرانی لەو زاراوانە وشە وەردەگرن و بەکاری دەهێنن ، وەک بڵێ حەسانەوەی ئەو باغەوانە هەست پێدەکەم کە دەبینی نەمامەکەی شین بوە و بەریشی گرتوە**

- ب -

لە (العراق) ی (9) ی شوباتی 1983 ، لە ژێر سەرەناوی ( وێنەی هونەری لە شیعری حاجی قادری کۆییدا ) مامۆستا عەبدوڕەزاق بیمار بەدوا شیکردنەوەی چەند نموونەیەک لە نیگارکێشی ی هەستیارانەی بەهاریەکەی حاجی دەنووسێ :
« جا لەم ڕووەوە ووتەکەی مامۆستای دانەری کتێبی ( چەپکێک لە گوڵزاری نالی ) بەئاسانی ڕەت دەکرێتەوە کە لە لاپەڕە 199 دا گوتوویەتی :
« یادی گوتەیێکی تری (دڵدار) دەکەمەوە کە دەیگوت حاجی قادر لە بەهاریەکەیدا شوێن پێی ( قوربانی تۆزی ڕێگەتم ) ی

نالی هەڵگرتۆتەوە و ئەوسا من ئەمەم لە دڵدار نەدەسەلماند کەچی ئێستا وەکبەڵایەیە ئاشکرایە لەبەر چاوم چی دڵدار دەیگوت ڕاستە » .

چونکە دانەری ئەو کتێبە منم پێویست بوو لێرەدا نەختێك ڕووناکایی بۆ لای ئەو شوێن پێ هەڵگرتنەوەیە و ڕەت کردنەوەکەی بهاوێژم .

دەبێ لەپێشەوە بڵێم شوێن پێ هەڵگرتنەوەی نالی لە لایەن حاجی قادرەوە نەکەمایەتی تێدایە نە بلعاتێکیشە لەکەس بەعەیب بگیرێ . لە نێوان شاعیرانی کورددا وێڕای شوێن پێ هەڵگرتنەوە ( تضمین و اقتباس ) یش بەرچاو دەکەوێ کە پتر لە نزیکەوە خولیای شاعیر بە غەیری خۆیەوە دەلکێنێ . نالی کە دەڵێ :

**ناری سینەم گەرنەبێ غەرقم ئەمن**
**ئاوی چاوم گەر نەبێ سووتاوم ئەز**

یەکسەر واتاخوازی لەم بەیتەی (ابن الفارض) کردوە :

**فلولا زفیری اغرقتنی ادمعی**
**ولولا دموعی احرقتنی زفرتی**

بەلام نالی مەهارەتێکیتێدا بەکار هێناوە وا بزانم لەو کتێبەی (چەپکێك ..) دا ڕوون کراوەتەوە . جارێکیان باسی ئەم ئیقتیباسەم بۆ (بلە) کرد . لە پێشەوە نەیسەلماند بەلام کە گرتم ناشێ نالی شیعری تصوف وەها .. قسەکەی پێ بریمەوەو گوتی کە تصوفت ناو هێنا سەلماندم .

حاجی قادر دەڵێ :

**بە (تضمین) بەیتەکی نالی دەهێنم تا ڕەفیقانم**
**بزانن من بە ئەو نابم خەزەف قەت وەك گوهەر نابێ**
**« کەمەندی زولفی دوو لانە لەبۆ کەبر و موسڵمانە**
**دەکێشن بێمحابانە چ لەم لابێ چ لەولا بێ »**

پێنج خشتەکی لەلایەن کورد و غەیری کوردەوە جۆرێکە لە تێك ئاڵانی دەروونی و ڕواڵەتی شاعیر و شاعیر ..

(تلمیع) یش هەر لەم بابەتانەیە .

ئەمانە هەمووی لە نێوان کورددا باو بوون بەلام ئەوەی پێی دەگوترێ (معارضە) لە کوردەواریدا بەرچاو ناکەوێ ، هەر نەبێ من ئەمدیتوە بەلام وابوە دووشاعیر هەمان پارچە هەڵبەستیان لە شیعری بێگانەوە وەرگێڕاوەتە سەرکوردی وەك کە بێکەس و گۆران کردیان . دەشبێ بزانین ئەم بابەتانە تێکڕایان خۆتاقی کردنەوە و خۆ بەخەڵك گرتن و خۆ نواندنیان تێدایە هەر چەند ئەم نیازانەش ڕێ لە هەڵچوونی عاتیفە ناگرن ، بگرە وەها بوە لە پێنج خشتەکی سەرکەوتوودا سۆزی شاعیری دووەم سەر دەکات کە بە ئاهەنگی سەدلەسەدی شاعیری یەکەم دەدوێت :

**دڵی بردم بە ناز و عیشوە دیسان شۆخی عەییارێ**
**فریبی دام بە چاوی مەستی خۆی مەحبووبی سەححارێ**
**لە هیجرانی تەقم کرد ئەی ڕەفیقان کوا مەدەدکارێ**
**ئەمان مردم عەلاجێ سا لە ڕێی پێغەمبەرا چارێ**
**وصال یا قتل یا تسکین لە هەر سێ بۆم بکەن کارێ**

سەرلەبەری دیوانی شێخ ڕەزا تاکە یەك غەزەلی تێدا بۆ سۆزی دڵداری تای ئەم پێنج خشتەکیەی کردبێتەوە کە لە بڵێسەی کوردییەوە ئاگری تێبەربوە . (معارضە) بەو شیعرە دەڵێن کە لە کێش و قافیەی شیعری بەر لە خۆی هەڵبەسترابێ وەك کە احمد شوقی موعارەزەی قصیدەی ابن زیدون :

**اضحی التنائی بدیلا من تدانینا**
**و ناب عن طیب لقیانا تجافینا**

دەکات و دەڵێت :

**یا نائح الطلح اشباه عوادینا**
**ناسیٰ لوادیك ام تشجیٰ لوادنیا**

ئەگەر بەهاریەکەی حاجی لە کێش و قافیەی قصیدەکەی نالی بایە پێی دەگوترا (معارضە) . لە لایەن کێشەوە هەردوویان لە یەکدی نزیکن تا ئەوەی هەندێ شاعیریش فەرقی پێ ناکەن ، بەشێکی بەرچاوی (صدر) وەیا (عجز) ەکانی بەهاریەکەش وەك دێرە شیعرەکانی نالی دەبنە 14 بڕگە بە نموونە ، ( لە خەو هەڵستە زومانێ بچێنەوە ئەولا ) 14 بڕگەی یە ، صدرەکەش 15 بڕگەیی یە .

لەم بـوارەدا دەبێ ڕاستییەکی گـرنگی دیکەش ڕوون کەرەوەی شوێن هەنگاومان بێ : داسەپاندنی بڕیاری (نی یە) پتر موحتاجی بەڵگەیە لە (هەیە) چونکە مەبەستی (هەیە) بـە تاکە یەك بەڵگە ئیسپات دەکرێ وەك ئەوەی گوێت لە خشپەیەك بوو و دەنگت دا (کێی ؟) بە تاکە وەلامی (منم) دەزانـرێ

خشپەی بەنیادەمە . بەلام کە وەلامێکت وەرنەگرتەوە جەوالێك بەڵگەت دەوێ تا

ئیسپاتی (بەنیادەم نەبوون) ی خشپەدارەکە دەکەیت ، ڕەنگە یەك بەڵگەشت چنگ نەکەوێ . لەگەڵ ئەمەشدا بڕیاردان لەسەر هەبوونی خزمایەتی لە نێوان ئەو دوو قصیدە بەناوبانگەدا تا ئەوەی خەیاڵ لە ( شوێن پێ هەڵگرتنەوە ) بکەین بە بادی هەوا نابێ بەتایبەتی کە دەنگ و سەدای ئیعتیراز بڵند بوو : پێویستە لێرەشدا (منم) ێك بەخەبەر بهێنین .

ئەوسا لە (چەپکێك ..) دا کەس بەرهەڵست نەبوو تاکو بەڵگەکاری تێدا بکەم ، قسەشم لە دڵدارەوە دەگێرایەوە کە ئیتر لزوهم نـەدەدیت بە بـەڵگە و نمـوونە هێنـانەوە لە سیفـەتی (شایەد) ەوە ببمە داواکار .

بەلگەی ئەم شوێن پێ هەڵگرتنەوەیە لە چەند لایەکەوە تێك دەکەنەوە : نالی شاعیرێك بوە لە سەرامەدی شـاعیرانی سەدەی نۆزدەم ، چ سـەیر لەوەدا نییـە شیعری ببێتـە ئەو (بەردەعازەبانە) یەی گەنجی لە خۆڕازی هێزی خۆی پێ تاقی بکاتەوە . ئێمـە بلێین و نـەلێین نمـوونەی زێـدە بالا لە هـەر هونەرێکدا هەبێ دەبێتە ( سەرمەشق . حاجی قادر لە چەندین جێگەدا باسی نالی و شاعیریەتی دەکا . وەك دیتمان (تضمین) یشی لە شیعری کردبوو ، لەو (تضمین) ە بەهێزتریشی هەیە کە دەلێ :

**زاهیرەن شیعرم لە کوردی و نالی زۆر کەمتر نییە**
**تالعم پەرگەشتەیە بەدبەختە بەختم نووستوە**

پێم بلێن کام شاعیری نوێ خوازی کوردی لە تاووتینی گۆران ڕەها بوە ؟ ڕەها بوونی چی ؟ هەرچی هەیە دەلێ گۆران دەروازەی شیعری نوێی کوردی خستە سـەر گازەرای پشت . واوەی گۆران لەم ڕۆژەدا کام شاعیر سەرەتاتکـە لە شیعری شێرکۆ بێکەس ناکات ؟ ئنجا ئەگەر شاعیرەکانمان لە هەڵبەستدا باسی گۆران و شێرکۆ نەکەن و لە توێژینەوەی ئەدەبیدا ناویان بهێنن خۆ حاجی قادر لە شیعردا خۆی بۆ نالی شکاندۆتەوە ، ئنجا هاتوە خۆیشی بەو ( و بە کوردی ) گرتـوە . لەمە زیـاتر چیمان دەوێ بیکەین بە ڕووناکی بـۆ ناو دەروونی حـاجی تا شەبەنگی نالی تێدا بدۆزینەوە ؟ بە خەیاڵ لە حاجی بپرسین ئایا نالی و شیعرەکانی چ ئەسەرێکیان بوە لە ویژدانی ئەودا دەبێ چ وەلامێکمان بداتەوە ؟ ڕەنگە پرسیارەکەمان لێ بەعەیب بگرێ چونکە خۆی بە شیعری پاتەوپات ئەو ئەسەرەی کردۆتە بەڵگە نەویست . خۆ ئەگەر بگوترێ حاج باسی شاعیری دیکەشی کردوە و هەلی داوەتەوە دەلێم :

**1 – باسی شاعیر و ئەدیبێکی بەقەدەر نالی نەکردوە .**
**2 – شیعری کەسی دیکەی بە (تضمین) نەهێناوەتەوە .**
**3 – لە نالی و کوردی بترازێ خۆی بەکەسی دیکە نەگرتوە .**
**بەدوا ئەمانەدا دەلێم :**
**4 – شوێن پێی غەیری نالی هەڵنەگرتۆتەوە .**

لە فەرزی یەکێك بۆم ئیسپات بکات کە حاجی بۆ غەیری نالیش دەروون کرایەوە بوو ئەوسا کـاری من ئاسـانتر دەبێ چونکە بەڵگەیەکی تازەم بەدەست دەکەوێ و ژمارە (5 —) ی دەدەمێ و دەیخەمە ڕیزی بەڵگەکانی سەروو .

ورد بوونەوە لە شیعرەکانی حاجی دەری دەخات کە لە مـەیدانی (نـالی نەوازی) دا حـاجی بە سێ پلەدا تێپـەڕیوە : یەکەمیان ئەوە بوو گوتی ( من بە ئەو نابم ـ وەیا نـاگەم ـ ) .دوەمیان ئەوە بوو گوتی ( بەیتم لە کوردی و نالی زۆر کەمتر نییە ) . سێیەمیان ئەم بەهارییەیە کە بینبـڕکێی تێدا کـردوە لەگەل ( قوربانی تۆزی ڕێگەتم ) هەتا شاعیریش شاعیر بووبێ نەیتوانیوە هێندەی بەهاریەکە ڕاستی نموونەی سـەرمەشقی کردبێتەوە لەوەشدا حاجی سەدجاران ئەو نەرمە چرپە چرپ و

منگەیە ڕیسوا دەکات کە لە بن لێوانەوە دەڵێ حاجی لە شۆرەتی شاعیریەتدا قەرزداری قەومایەتیەکەیەتی مایەی شانازی حاجی و ئێمەیشە ، بەلام هەزار قەومایەتی و حەق پەرستایەتی و مەلایەتی بەسەر یەکدا کەڵەکە بکەن (بەهاری) وەها پاراو و ناوپێکدار و ئەفسووناوی نازێن ئەگەر شاعیرایەتی لەگەڵدا نەبێ . جاروبار حاجی بە زاری خۆی دەڵێ گلەیی لە کەموکوڕی ئەم شیعرەم مەکەن چونکە دەمەوێ ( .. لەم بەند و باوە دەربچن ) کەچی لە بەهاریەکەیدا لە پشت پەردەیەکی تەنکی وەقاردا ئەو هەڵبەستە دەکاتە بەڵگە بۆ زمانی کوردی کە ( بەلاغەتێکی هەیە هیچ زمانێ نایگاتێ ) . حاجی ئەو لە خۆ ڕادیتنەی ناو بەیتی ( زاهیرەن شیعرم لە کوردی و نالی زۆر کەمتر نییە ) لەم بەهاریەدا بە ئیسپات دەگەیەنێ چونکە بەڕاستی نموونەیەکی هەرە پێشکەوتووی هونەری شیعرە بە ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە ، لە کوردی و غەیری کوردیدا ، خۆ هەتا خەتمی کەلام بە شیعری شیرن هاتبێ شیرنتر نابێ لەمە :

بە هەمەحاڵ دەرخستنی مەهارەت و پەنجە ڕەنگینی و ئارایشت و سۆز و هەستی بریندار و هەنیسکی غوربەت و واقیعیەت و ئەو جۆرە دیمەنانە لەو بەهاریەدا گەلێکی بەبەرەوە هەیە کە دەبێ لە لایەن بەڵەدی زانستە ئیسلامیەکان و ئەدەبی کلاسیکیەوە تۆژینەوە و شی کردنەوەی بێن دریژی تێدا بکرێ . هەتا تێ‌دەگەین وەیا تێناگەین لە بەیتی :

**پیالەیی زەڕی نەرگس لەسەر کەفی سیمین**
**لە بۆ نثاری مهیّایە پڕ لە زێڕی طلا**

چۆن شیا (ظرف) ی نێرگز خۆی زێڕ بێت و (مظروف) ەکەشی (زێڕی طلا) زێڕ بێت و هەر دووکێشیان (ظرف و مظروف) ئەو زەردایی‌یەی ناو نێرگزەکەن ؟. تا تێ دەگەین شەکەت دەبین .

نالی ڕاسپاردەی بە بادی (خۆش مرور) دا بەڕێ دەکات ، حاجی قادریش لە مەهارەتی خۆیەوە (بەختی خەوالوو) دەدوێنێت و گرۆچکەکانی هەنای بەرەو کوردستان بەڕێ دەکات . دیارە بەختیش پتر لە بای چالاك پێوەندی بە مرۆڤەوە هەیە و جێی خۆیەتی بەدەنگ بێت و بکەوێتە وتوویژ .. لەوە بەولاوە ناوەڕۆکی هەر یەکێك لە دوو قصیدەکە دەبێتە تەرجومانی ئەو گیانەی ئاوەئاگرینەی بورکانی خۆی وەدەر دەنێ . هەر وەك لە

(معارضە) دا دوو قصیدەی لەیەکدی ڕاماوی هاوکێش و هاوقافیەش دەبێ ناوەڕۆکیان جوڕا بێ دەنا قصیدەی (معارض) لە بایەخ دەکەوێ و دەبێنە لاسایی کردنەوە ، لە شوێن پێ هەڵگرتنەوەشدا دەبێ ناوەڕۆك جودا بن تەنانەت لەیەکدی نزیك بوونەوەیان لە بەیت و دوو بەیتدا قصیدەی دوەم داناڵەنگێنێ . بەنموونە ، حاجی قادر کە دەڵێ :

**ئەگەر منم لە فراقیان کزەم لە جەرگەوە دێ**
**ئەگەر دڵە وەکو جەرگم دەڵێی ئەوا سووتا**

قسەکانی خۆیان لەو دوو بەیتەی نالی دەخشێنن :

**سووتا ڕەواقی خانەیی صبرم دڵ و دەوون**
**نەی‌ماوە غەیری گۆشەیی ذیکریکی یا صبور**

**لەم شەرحی دەرد و میحنەتە لەم سۆزی غوربەتە**
**دڵ وەختە بێ بە ئاو و بە چاوما بکا عبور**

خزمایەتی واتای ئەم بەیتانە هەر بۆیە لەسەر ماجی قادر بە لاسایی کردنەوە و واتا خواستنەوە حیساب ناکرێ چونکە مەحکەمی و (اصالة) ی سەرلەبەری بەهاریەکە لە تومەی وەهای دەپارێزێ : ئەویش وەکوو نالی لە بیرکردنەوەدا هەستی ئاگر تێ بەربوون دەکات ، ئیتر چۆن نالێ سووتام !!

هەروەك حاجی شاکاری نییە بەرانبەر بەهاریەکەی ڕاوەستێ ، سالمیش هەڵبەستێکی نییە بکاتە ئەو وەلامەی کە بە (بادی سەحەر) دا بۆ نالی دەنێرێتەوە .

**قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادەکەی سەحەر**
**وەی پەیکی شارەزا بە هەموو ڕاهی پڕ خەتەر**

نەسەیرە و نە لە سالمیش بە عەیب دەگیرێ کە لە جوابدا بە وشەکانی نالی دەست پێ بکاتەوە و هەمان بادی خۆش مروریش بکاتەوە بە پەیکی نامە هەڵگر چونکە ئەو یەکسەر لەبەر تین و تاوی بۆلوەکانی نالی دڵی خۆی دەتاوێنێتەوە لە سالم و حاجی بترازێ (مصباح الدیوان) یش شیعرێکی نەگوتوە هاوتای پێنج خشتەکیە بێ‌پەردەکەی بێ کە ڕاستەوخۆ لە (مستورە ..) ی نالییەوە تیشکی داوەتەوە ، تەنانەت سەرنجم بۆ ئەوە دەکشێ کە (مصابح ..) بە ئانقەست چوار مصرەعی هەرە پڕهەست و خوستەکەی وصفی یاری هێناوەتە سەر قافیەی قصیدەی (مستورە ..) کە کێشیشیان لەگەڵیدا پێکەڵێ

**وەك تازە هەڵووژێكى لە ناو دوو لقەدا بێ**
**وا رێك گوشرابێ كە لە دوو .... هەتاد ..**

بەش بەحاڵى خۆم هەستى سەربڵندى دەكەم لەوەدا كە سێ كەلە شاعیرى كورد بە رەفاقـەتى سەرامـەدێكى شیعرى كوردى بەسەر خۆیاندا زاڵ بووبن .

ئیستا بە ئیزنى كاكە بیمار وا پەسەند دەكەم هەڵەى ئەو بەیتانەى بە نموونە لە بەهاریەكەى هێناونەوە راست بكەمەوە . بـەداخەوە زۆر لە دیـرانى شاعیـرە بەسـەرچووەكـانمـان لە نووسینەوەدا هەڵەیان تێكەوتوە جگە لەوەى كە لە دەمى چاپ كردنیشدا هەڵەیان تێدا دەكرێ تا ئەوەى كێشى بەیتەكان تێك دەچێت ، ناوناوە مەعناشیان نامێنێ :

مصرەعى ( لە كێو و كەژ كە سەر لە ئێوارە مالآت ) بەم شكڵە پازدە برگەیە كە دەبوو لەبەر وشەى كۆتایى مصرەعەكە (مالآت) چواردە برگە بێ چونكە ئەم وشەیە لەوانەیـە لە دوو برگەوە بكرێتە سێ برگە و كێشى شیعرەكەش تێك نەچێ . بـۆ روون كردنەوە دەڵێم ئەگەر مصرەعەكە بە راستى وەرگیرابایە دەشیا (مالآت) ەكەى بكرێتە (مەرومـاڵ) و كێشى تێك نـەچێ كەچى ئیستا دەیكاتە شازدە برگە . وا بزانم دەبێ بگوترێ :

**لە كێو و كەژ كە سەر ئێوارە دێتەوە مالآت**

**لەمەشدا پێویستە (سەرێوارە) بخوێندرێتەوە دەنا كێشى تەنبەڵ دەبێ . بەم جۆرە ئەگەر بگوترێ ( .. مەروماڵ ) كێشى ناشێوێ چونكە وەك لە پێشتر گوتوومە بەحرەكە بە پێى سازدان 14 برگە و 15 برگەش هەڵدەگرێ . تۆ بێنە ( لەسەر**

كەڤى سیمین) بكە (لە سەر كەڤى گوهەرین كێش عەیبدار نابێ . لێرە قسە لە نـەشێوانى كێشى شیعـرە ، دەنا دەزانم حـاجى نەیگوتوە (مەروماڵ) .

وشەى (گوهەرین) یش جێى نابێتەوە لەو مصرەعەدا چونكـە زەردایى نێرگز بۆ زێر دەچێتەوە نەك گەوهەر .

مصرەعى ( مەلائیكەى سەرتاق و رەواقى مینایى ) بۆتە 13 برگە و هەڵەیە دەبێ بڵێین ( مەلائیكەى سەرى تاق و رەواقى مینایى ) .

وشەى (جومبش) دەبێ بنووسرێ (جنبش ـ جونبوش) چونكە لە (جنبیدن) ەوە هاتوە . (منارەى جـ:بان ـ جونبان) ى ئیسفەهان رێژەى ناوى كارا (اسم فاعل) ى (جنبیدن) ى تێدا بەكار هاتوە .

هەر دوو مصرەعى .

**پیالەى زەرڕى نێرگز لەسەر كەڤى سیمین**
**پڕە لە شەبنەم وەك دوڕى لولۆى لالا**

دەبێ راست بكرێنەوە و ببنە :

**پیالەیى زەرى نەرگس لەسەر كەڤى سیمین**
**پڕە لە شەبنمى وەك دوڕڕو لؤلؤى لالا**

حاجى وشەى (نرگس و سیمین) ى گـوتوە كـە هاتـین گوتمان (نێرگز) دەبێ بنووسین (زیوین) .

مصرەعى :

**بەهار وا هەموو ساڵێك دێتەوە ئەمما**

بۆتە 12 برگە راستییەكەى ئەمەیە :

**بەهارى وا هەموو ساڵێك دەیێتەوە ئەمما**

وەیاخود :

**بەهارى وا هەموو ساڵێكى دێتەوە ئەمما**

دەبێ بڵێین :

**مەكانە : شەوقى بە عیلاتە ..**
**حەیاتە : زەوقى بە ئەحبابە ..**

مصرەعى ( گەر بێ‌یو بچیەوە ئیستا (كانى) دیسان ) بە قسەى عادەتیش قبول ناكرێ وادەزانم راستییەكەى ئەمەبێ :

**گەر بێ‌یو بچیەوە ئیستاكە بۆ وەطەن دیسان**
**سەفەر دەكەى لە وەطەن دەچیە شارى جابولقا**

لەم دەمەدا دیوانەكەى حاجى و دەسخەتى دیرانەكەشم لا نیـە بزانم لەوانـدا ئەم بـەیتـە و ئـەوانى‌دیكـەش چـۆن نووسراون : بە رێ‌نەهایى كێش و واتا و نەختێكیش یاریدەى بیرهاتنەوە قالبى ئەم بەیتانەم راـت راگـرتنەوە . ئـە وەى راستیش بێ هەرچى نموونەیەكە لەم نووسینەدا هێنابێتمەوە هى یاد كردنەوەیە ئنجا ئەگەر سەهوویان تێدا بێ لێم ببوورن .

لەكـۆتایى‌دا دەڵێم مـامۆستـا بیمار هـەقى هەیـە گەو بۆچوونە پەسەند بكات كە بە لایەوە راستە بەڵام منیش هەقمە بڵێم ئەو بەڵگانەى بۆ ( بە ئاسانى رەت كردنەوە ) ى هێنابوونەوە با یى رەت كردنەوە ناكەن . لەگەڵ رێزمدا .

# فوئادێ تەمو كێ يە و چی يە ؟

عبدالكريم فندي دوسكى
ئامادە كرى يە وئينايە
سەر رێنفيسا نوى

**فؤاد كى يە ؟**

ناڤێ وى فوئادێ تەمو بەگێ يە ژكوردێد بازێرێ وانێ يە ژبەر هندێ ناڤێ وى هاتيە « فؤاد تمو بك الوانـلي » و لسالا [ 1910 ] زاينى كومەلا « هيڤى » يا قوتابێد كورد دامەزراند ل ستامبولێ و فوئادێ تەمو دگەل عمر ، قدرى ژ بنەمـالا جميل پاشايێ دياربكرى و زكى بگ ژ قوتابێد قوتابخانا كشت وكالێ ل ستامبولێ ئەڤ كومەلە دروست كرب هارى‌كاريا خليل موطكى . « هيڤى » يا بەردەوام بو لسەر پروگرامێد خو هەتا دەولەتا ئوسمانيا هەڤ پشك بوى د شەرێ جيهانێ دا . ئينا كارێ ڤێ كومەلێ راوەستيا ژ بەر چونا ئەندامێد وێ بو قادێد شەرى . ئەڤ كومەلە ديار بو ڤە پشتى شـەر راوەستيايێ (مصـطفى كمال) ستامبول ستاندى[1] . وئەڤ گوتنە موكم ترلێ تێت دەمێ د بينين ڤێ كومەلێ دگەل هندەك رێكخراوێد دى يێد كـوردى بروسكەك بۆ دەزگەهێد تەنايێ هنارتى پرسيارا مـافێ كوردا كرى[2] .

ژ كريارێد ڤێ كومەلێ يێد بەركەتى ئەو بو گـوڤارەك ل ستامبولێ دەر دئێخست ناڤێ وێ « روژێ‌كورد » بو و بزارێ وان دئاخفت و بيرێد وان بەلاڤ دكرن[3] . وئەڤە يا هاتيە گوتن د يەرێد گوڤارێ دا دەمێ دبێژيت :

« ئەڤە لهرە خورتێن كرمانجا خوە دان هەڤ و جمعيەتەك كوردا چێكرن ، ناڤێ جەمعيەتێ (هيڤى) دا نينە ؛ نهو ژى بـدەست جەريدە كرنە ئەڤ جەريدا هە ژ علم و مەعريفەتێ بەحس دكە ، ژ تشتك دى نكارە بەحس بكە ، چونكە قانونا دەولەتێ دا مادەك هەيە دبێژە حەچيكو جەريدێ سياسى دەرخە ، دڤێ پێنج سەد زێرا ئەمانەت دانى ؛ حەچيكو كوردون ؛ عاجزن ژ تەداركا ڤان پەرا ؛ فكرە نهو بڤێ جەريدێ « روژێ كورد » إكتفا كرنە[4] . ژ بەر ڤێ گوتنێ فوئاد ئێكە ژ نڤيسارێد گوڤارێ . ئەم ڤێ بتنێ ژ ژيانا فوئادێ تەمو بەگێ وانى دزانين . هيڤيا مە ئەوە روژ بو روژێ پتر روناهى و زانين ژ هێژا فوئاد بێتە خويـاكرن و روژ درێژن .

**فوئاد چى يە ؟**

پشتى پەردێ تارياتێ ژ سەر ژيانا ڤى نڤيسارى هاتيـە دراندن مە دڤێت بزانين كانێ چ رەنگى نڤيسنێ لجەم هەبۆيە . هەتا بەرى سالا (1981) زاينى يا ئاشكەرا بو چيروكا كـوردى

لسالا (1925) زاینی یا دەست پێکری ل سەر دەستێ ماموستا جمیل صائب و چیروکا « لەخەوما » . بەلێ پشتی گوڤارا « روژیکورد » هاتیە ڤ چاپکرن ژ لایێ ماموستا (جمال خەزندار) ڤە . فوئادێ تەمۆسەرێ بەرچەمکێ چیروکا کوردی ژ جمیل صائب وەرگرت وبرە سالا (1913) زاینی . لڤێ سالی چیروکەك ل ژمارە ئێك و دو ل « روژیکرد » دا فوئاد بەلاڤ کر و هێژ بدوماهیك نەهاتیە . بەلێ مخابن گوڤار راوەستیا و چیروك بدوماهیك نەهات . براستی چیروکا فوئاوێ تەمو چیروکەکا هونەری یە . بکوردی یەکا رەوان و خوش یا نفیسی ب سەر زارێ هەکاریا ڤە دچیت و هندەك چارا زاری بوتاتی دگەل تێکەل کری یە . بەلێ جهێ کەسەری پە زور چەوتید چاپێ تێدا یێد هەین . و ب رێنفسەکا کەڤن و بێ سەرو یا هاتیە چاپکرن . لهرە ئەز ڤێ چیروکێ ساخ دکەم و ب رێنڤیسا نهۆ دنفیسمە ڤە دا مفا ژێ بێتە وەرگرتن و هەر کەس بشێت بخوینیت . و ئەڤە ئێکەمین چیروکا کوردی ژوەرا :

## - چیروك -

شەڤیش کوڕێ شڤانەکی یە . بۆخا دەهـ سالی یە زاروکە ، بەلێ پر چاڤ ڤەکری یە .

شەڤیش دیا خو نە دی یە . باڤێ وی رەبەن و بەلنگازە ڤەت تشتەکێ وان تونە ....

تنێ مەتەکێ شەڤیش هەبو . ئەو ژی پیرەك بو . شەڤیش جارنا بال وێ دچە . دلێ مەتا خو هونك دکر .

شەڤیش نولا سا کۆل گوندێ تەشقەلەتی نە دکر . ب کەس دا تشتەك نە دگو . تم ب خوە بخوە بو

کۆل هەڤالا خۆ باش دچە . بو واندا گوتنا دل مایی نەدگو هەتا ئێڤاری دانا ل گوندی بێ دەنگ دکرە . دلەێزە ، روژا خو دەرباز دکر .

ئەو جکوتنا شەڤیش پر خاشبا کو دریان دچو هەموو شەڤیشی هەزدکرن ریس پی یێ گوندی هەرو ئەو مالا خو دبر . خارنا وی د دا . بو وی خویەتی دکر . هەر کەس دا ڤ زاروك ڤەنجی ژێرە دگو .

شەڤیش هەرۆ ئێڤاریدا سەر رێ باڤێ خۆ دچە . هیڤی وی دمینە . وەکی باڤێ وی تێ پێشیی ێ وێ دبەرزە . بوخا سەر کێلەك باڤێ خو دا ڤێژە . دەستێ وی دگرە . ماچ دکر .

باڤێ وی ژی هەردو چاڤێ کوڕێ خو ماچ دکر . دل هونك دبو .

روژەکێ شەڤیش دیسا سەر رێێ جو . هیڤی یێ باڤێ خو بۆ . کاڤەك بوهری روژ چو . هەمو ئەردەکی تاری کەت باڤێ وی . هێژ ، نە هاتبو .

شەڤیش ناڤا وێ تاری یێ دا تنێ نێما . دلێ وی لەزدکە . چار جاران گوهداری دکر . باڤێ خو گازی دکر تو دەرێ دا دەنگ نەدهات ؟ ..

شەڤیش جیکی رونشت . بونا باڤێ خو گرێ پاش بوخا چو بۆ . باڤێ شەڤیش هێدی هێدی ژ ئالی یێ نوالێدا دەنگێ پەزان دەشنێ گرتبو .

شەڤیش وی دەنگی بهیست . رابو . کازی باڤێ خو کر :

باڤو ! باڤو

باڤێ وی ژی ؟

ئا .. شەڤیش لاوو تویی . تو وێدەرێ یی .

شەڤیش :

هەرێ باڤو ئەزم .

باڤ :

وەرە بال من مەرکێ م کۆری .

شەڤیش : بەزیا بال باڤێ خۆ دەستێ وی گرت ؛ ماچ کر . پاشی گو :

باڤو تو ئێرو بۆچی وەسان دڕەنگ مایی ؟ بونا چی زو نەهاتی ؟

پاڤ گۆ : کوڕێ من ؛ پەزان تێر نە خاری بۆ ئەژی پیجەك وەستی بوم لما درەنگی مام .

شەڤیش گو :

باڤۆ ؛ ئەز گۆری تو ئێدی وەسان دڕەنکی نەمینە تو دزانی کو مالدا کەس تونە . ئەز بال کێ بمینم . گری .. باڤ : گرینا کوڕێ خو دی . بریندار ی یا دلێ وی نۆ بۆ :

ئاڤا چاڤێ وی ژی ڤالا بۆ ....

شڤانێ کال بوخا هات . سەرێ شەڤیشی ناڤ هەر دو دەستێ خوە ستاند . ئاڤا چاڤێ وی پاقژ کر . رادموسا . پاش گو : کوڕێ من خودێ مەزنە . مرازێ ئێمە ژی د دە ....

پاشی دەستێ خو گرت . هێدی هێدی هاتنە گوندی . شڤانێ پەزان هەڤشی دا کر . پاشی گەل کورێ خورا نێ چون . مالا وا دا لهێف بالگی تشتەکێ وەسان تونە بو . تنێ مەلیکەکێ هەبو باف و کور پاخلێ هەف کەتن باڤێ ملێ خو بو شەڤیشی بالگی چێکر شەڤیش ژی سەرێ خو سەر سنگێ باڤێ خو دانێ ملێ خوٚ ژی فستویێ باڤێ خو ئاڤێت .

هێ ستێرێ سوبێ دەرکەتی بوٚ . نێزیکی سوبێ دیکا بانگ د دا . بایێ نەرم هێدی هێدی سەرێ داران لێدخست . پەلان د هەژیانا . دەنگەکێ خاش چێدکر ... هەمو ئالێدا دەنگ دهات . هەموٚ گوندی رابون بەلێ کور و باف هێژ رازابون ...

کافەك ژی چو بو . شڤان خانیدا هشیار بو کافا پەز راکرین رو [ روژ ] بوهری بو . بەلێ شڤانێ کال نەخوش بوٚ . ناف جێیا خودە دنالە . جار نا جاران ژی رویێ کورێ خو مێزە دکر .

وێ کافێ بو ریسپی‌یێ گوندی دەرێ شڤان لێدا . پاش گازی کر .

شڤانوٚ ! شڤانوٚ !

شڤان ژی د هوندر دا گو :

هو لبێ ....

شڤان چڤا دخاست کوٚ رابیت دەری ڤەکەت . بەلێ نەخوشی‌یێ وی نەدهشت . دەنگێ دەری شەڤیش هیشار کربوٚ . دەری ڤدکر . ریسپی هوندر دا هات . شڤان را گوٚ :

شڤانو ! تو ئیرو بوٚچی وەسان درەنگ مایی . نیو رو بویە . پەز هێژ ناڤا هەڤشی مایە برچی نوٚ بێ خوٚیی یە . گوندی گالگال دکن .

شڤان ژی گوٚ :

ریسپی ! ئەز چ بێژم . تو من دبینی . ئەز ئیرو نەخوشم . نەخوشی‌یێ من گرانە . لما پەز راکرنێ نەهاتم . تو ئیرو چی‌یێ من مروٚڤەکی بشینە . کا خودێ چەوا چێدکە . چ دەرێ هیڤێ رویێ من ڤەدکە ....

شڤان وێ گوتنێ گوٚ . پاشی ناف جێیا خو کەت نالینێ وی رابو .... شەڤیش ژی نالینێ باڤێ خودی . دل تاری بو . سەر بابێ خو کەت . گری ...

ئەف دەنگێ لاوو چ دلێ ریسپی شەوتاند . ژوورا مێزەکر . ئەو خوٚ ژی نکاری بو کمیدە(5) . ئاڤا چاڤێ وی ژی ڤالا بو ....

پاشی بوخا هات . ب شڤان را گو :

شڤانوٚ ! دلێ خوٚ تەنك مەكە . خودێ مەزنە . نەخاشی یێ تە گران تونە . دیسا روژان دەرباز دبە . ئەز هەرم ئێکی بەر پەزان بشینم . توٚ ژی ئیروٚ راکەڤ . بو خوە رازێ دە .

زکێ وی ژی نوها برچی یە . شەڤیش بلا گەل من بێ . کا مالا مەدا چی لێناندینە . پیچەك تێشت بی‌نیت بخوٚن . ئەز ژی ئێڤاریدا بێم . شەڤیش شاند . گەل هەف چون . شەڤیش رێدا نەخاشی باڤێ خوب ریسپی را پرس کر . ریسپی ژی دەستێ خوٚ ئاڤێتە ستویێ شەڤیشی گوٚ ؛ کورێ من کوڤان مەکە . دل ڤەکری بە . تشتێ باڤێ تە تونە . دوٚ سێ روٚژان ئەو رابە سەرخوٚ . ئەو گوتنا ریسپی دلێ شەڤیش پیچەك هونگ کر . کافەك پاشی مالا ریسپی هاتن هوندر دا چون روینشتن .

ریسپی خولامێ خو گازی کر . ژوورا گو :

رزقو ، کورێ من شڤان نەخوٚشە . ئیرو بەر پەزان تو هەرە . پەز هەڤشی دا قربوٚ .

رزقو ژی ب گوتنا مەزنێ خوکر . دارەك دەستێ خو گرت . چوٚ ... ریسپی دگەل شەڤیشی زکێ خو تێرکرن . ئامانەك ژی تژی کر ؛ ب دەستێ شەڤیشی دا . گوٚ : کورێ من دل تەنك مەبە . ئەف ژی هێدی هێدی بوٚ باڤێ خوٚ ببە . هیڤی یێ ژی یە . بال باڤێ خوٚ روٚنە . گوتنا وی بکە ، چ دخازە چێکە . دلێ وی مە شکێنە ئەز ژی تم .

## ژێدەر


1– الدکتور بلیج شیرکوه ـ القضیة الکردیة . مطبعة السعادة بجوار محافظة مصر / 1930 . لاپەرە — (52) —

2– مجلة الثقافة عدد (1) / 1983 بغداد لاپەرە (62)

3– القضیة الکردیة لاپەرە (52)

4– روژی کورد ـ مجلة ـ نشرها جمال خزندار بغداد / 1961 لاپەرە (76)

5– بەیڤا « کمیدە » بەپەڤەکا ترکی‌یە ب مەعنا (ب غەمکەت) تێت

# ژنا كورد و بزاڤا راميارى و رۆشنبيرى

**هيڤى‌دار هرورى**

ژنا كورد وەكى هەمى ژنێن جيهانێ تورەو ژينـەكا سەرفەرازو نـاڤەكێ نـەمر يێ دتـەڤنێ دیروكـا كورديـدا ڕاچاندى‌و ددلێ هەر كەسەكيدا ئاڤاهى يێن بو خو دانايين‌و دەنگێ خو يێ كرى‌يـە حەيـرانوكـا سەر ئـەزمانێ هـەر كەسەكى ژمە ، بەلێ نە بڕەنگەكى بەرفرەهـ .

ژنـا كورد ژ ميـژەوەرە ڕێكا هـونەرى‌و تـورەيى‌و ڕاميارى گرتى‌يەو لبەرە ، ژميـژەورە ويژى دەست دايـە ڕەواله كـرنا بـاغێ ژينا خـو ژ دڕو دەحـلو زيـوانـا ، ژ ميژەوەرە بەرێ خو دايە ئاسمانى‌و هيڤى‌يێن بلند لپێشى‌يا خو دانايين .

ژنـا كـورد ڤيـايـا تـوڕەو ئـەڤيـنـدارى‌و وەلاتى‌و سروشتى‌يێ‌يە ، لێ هەر وەكى مە خويا كرى دريژكێن سەريدا كو ژنا كورد وەكى بژگوژكەكا نەخيف بوويە ، لێ بهەزارا بزاڤا خوو خونيا خو يا كرى‌يە ئاڤا بژگوژێن لدويڤ خو ، هەر وەكى ئەمێ دبينين كو ژنا كورد يا هاڤچەرخ يا گـەش‌و خيڤ بوويـەو پتر بيهن‌و ڕەوش‌و جوانيا خو دێ پێش چاڤ كەت‌و بەلاڤ كەت . ڕامانا ڤا ڕێزكێن بورين نەك ئەوە كو ژنا كورد يا دخەوو نەهشيار بوو ، نەخێر ... لێ هندەك ئاستەنگا چاڤ لێ تارى كربون‌و ڕێ لبەر بەرزەكرن ... كو ديل‌و بن دەستا مالا خو بو .

لێ دسەر ڤا تەپەسەرى‌و ئاستەنگارا گەلەك ژنێن كورد ڕێكێن بڕى ئاستەنگ برنيەو دەرپايـێن بڕى كـەڤ‌و زڤڕوكـك شەقاندينەو قەستا هيڤى‌يێن خو يێن سەرفەراز كرى‌يەو چ جارا نەگوتى‌يە .. مابوچى‌يە ؟ ! بزاڤا من بێ هيڤى يە ! ، نەخێر .. بەلكو پێشكەفتن‌و گەهەشتنا مرازاو هيڤى‌يێن نەمر ئامانجا وابو

، هەروەکی دیروکا مە ژمەڕا خویا کری . ژڤا ؛ حەپسەخانێ نەقیب و مەستورە خان و میهرەبان و زێرین و حەزینە و گەلەکێن دی . هەر چەندە فەلەکێ خو دابوێ و کەپا خو لێ بلند کربوو ، ڕوبیارا کەڤ و زڤروك لبەر گەمی یێن وا ڤەدان و ڕێك لێ بوونە پەسار و نەفرازی و دەحل و دڕ ، لێ دسەر ڤێ چەندێڕا وەکی مە خویا کری ئاستەنگ پاشڤە پالدان و تەڤنێ خو دەست ژێ نەبەردان و ڤەچنی و یاڤەدچنیت .

دیسا مشە ژنێن کورد هەنە کو چو ڕوژ ناچن دیوانا خو لدەف مە نەگریدەن ، وەکی ، خەجێ و زینێ و شرنێ و لەعلیخانێ و عەیشەشانێ و زولەیخایێ و گەلەکێن دی .. کو نڤێژو ڕوژی و خارن و ڤەخارنا وا بزاڤ و خەبات و ئەڤینداری و هیڤی بوون .

بڤی ڕەنگی ژنێن کورد کەڤن ری بوو یێن هاوچەرخ ڕەوال کرو دەرگەهێ ڕامیاری و تورەیی و جڤاکی و تاد .... بو ڤەکرە . ژبەر ڤێ چەندێ من بزاڤ کر کو تشتەکێ ژبزاڤ و ژنیا هەندەکاژێ دانمە پێش چاڤێن هەمی خاندەڤاێن کورد .

« تێبینی »

1 – ژلایێ ڕوشنبیریڤە تەنێ دێ بەحسێ هوزانڤانا کورد کەین .
2 – ئەو ژێدەرێن من پێتە دایە بێ شێوەیێ نڤیسینێ من بەرفرەهو ڕونتر کرینە .
3 – جهێ داخێ یە کو سالا بون و مرنا گەلەکا ژڤا ژنێن کورد دیار نەکرینە ، هندەکاژی یان سالا بونا وا یانژی سالا مرنا وا .

## ژنا کوردو هوزان : –

هوزان ئیلهامەکە خودای کانیکا وێ دناف دەولکێن مەژی یێ مروڤیدا دانایە ژ ژن و مێرا لێ نەبڕەنگەکی تڤایی ، ژنا کوردژی بارەکا بەرکەفتی یا ژڤێ کانی یێ هەی .

ژنا کورد هوزان یا ڕاپاندی لسەر هەمی لایێن ، لسەر ژنا بێ پشکك و ماف ، لسەزاری یێ ء دیلی یێ ، ئاوارەیی و بن دەستی و خەمێ و زورداری و ئەڤینی و تاد ....

ژخویایایە کو گیرو گرفت و ژان و ئازارێن ژنێ پشکەکن ژگیرو گرفت و ژان و ئازارێن ملەتی ، ئەڤجا ژنا کورد نەیا بێ باربو ژخەم و ئێشاو خەفەتی یێ ، بومارا وێژی کەڤی یێن بەفرێ خو پێدادا بوو پاییزێ زوی مالا خو دکێشایێ . ژبەر ڤێ چەندێ ژنا کورد هەر دگەل هەبوونا خو دەست دایە نڤیسیناو ڤەهاندنا هوزانا لسەر بارو کاودانێن[1] تێدا دژی یا . لێ ئەو کەلیڤێن خو لژنا کورد کری یە خودان و ڕێ دایێ کو هزرو بیرێن خوو دوزێن خو برەنگەکێ تڤاپی بکەتە گوهارێ گوهێ مە ، دزورن ، لێ ئەم دشێین کورت بکەین ئێبەڤێ خارێ ؛ بارێ جڤاکی و کوپوری و ڕامیاری و زانیاری یە بهەمی لاو تایێن خوڤە .

ئەڤجا ژنا کورد چو لایێن ژنیی نەهێلاینە داڤەکك ژێ نەکێشایە تەشیکاخو ، چونکی هەروەکی مە خویاکری ئەوژی یا بزاڤێ دکەت بهەمی شیانا خو کو ڕاستی یێ بکەتە پارزنیکێ خو ڕاستی یێ ژێ بدەت .

هەر چەندە ژنێن کوردێن هوزانڤان دکێمن ، لێ مشە ناف و دەنگی یا خویا هەی ، چونکی هوزانا خو یا ڤەهاندی ڕوی بڕوی ، لسەر نبگەهەکی ڕندو کاریگەرو پەیڤێن بساناهی و دویر ژ گرێ و هشکاتی یێ ، هەر چەندە هندەك پەیڤێن بیانی تێکەلی هوزانێن خو کرینە .

دیروکا مە مشە ژنێن کورد یێن بمە داینە نیاسین کو برستنا تەشیکا هوزانا ناف و دەنگی یا وا یا بەلاڤبوی ، ئەڤەژی هندەك ژێ :

## میهرەبان خاتوینا بەرواری[2] : –

**کچا مەلا حوسەنیی بەرواری ژووری یە « دناڤبەرا سالێن ( 1858 – 1905 ) ی ژیا ژیای »**[3] . ئانکو دسەدێ هەژدێدا ، دتولازی یا خودا گەلەکا ڕندو ژێهاتی بوو . خاندەڤاو هوزانڤانەکا نبەجە بوو ، گەلەکا بکێر هاتی بوو بو نەخشاو تەڤن کرنێ و وێنە چێکرنێ . هەمی لایێکێن ژنیی و ئەڤینێ یێ دخەیالا وێدا وەکی ڕوبیارێن سەر نەخشەکی لبەر چاڤا ڕەوال ببون .

ژ بەر زیرەکی و چەلەنگی و جانی یا وێ گەلەك مروڤا ڤیا بخازن و بو خو بینن ، لێ بزاڤا وا نەدگەهەشتە چو دوماهی یا ، چونکی میهرەبانێ گەلەك حەز ژ پسمامێ خو دکر . ڕوژەکێ میرێ ئامێدی یێ خاست و بابێ وێژی بڤێ چەندێ ڕازی ببو ، ( جهێ داخێ یە ناڤەڕوکا ڤێ چیروکێ نزانین ) ، دبین یهرەبانێ

هوزانەك ڤەزانەك ڤەهاندو بو میری ڤرێکر ، ئینا میری ئەو هیڤی ژبەر دلێ خو هاڤێت ، چونکی زانی کو حەز ژ ئێکەدی دکەت .

میهرەبانیێ هـوزان ڤەهـاندنیـە ڕوی بروی ب پـەیڤێن بساهی کو مروڤ لێ گیرو نەبیتو زوی تێ بگەهیت . ئەڤەژی نموونەکا هوزانێن وێیە ، ئەوە یا بو میرێ ئامێدیێ مزێکری :

ئەز چ بێژم چ بەیانکەم !
کی بحالێ من دزان ؟
مەخفیاتا ئاشکراکەم
ئاهـ ژڤی دەردێ گران
ئاهـ ژدەست عەشقێو ئەڤینا
کەڤتیمە تازیو شینا
کی دێ سلخکەت ڤان برینا ؟
چو ژدل سەد ئاخو ژان

دەردەکێ زورێ گرانە
عەقلو هوش من چو نەمانە
مام پەپیکو پێ خودان
کێ دێیە ئەڤ چ زەمان ؟

من نەما سەبرو قەرارە
دل ژمن بو پارە پارە
دوزەخێ پڕ ئارو مارە
لەو ژمن چون هەستو ژان

دوو دلا یەك دوو حەباندن
زەحمەتە بێنە ڕەڤاندن
ئایەتا عشقێ بخاندن
نابێتە شەرحو بەیان

لدویماهیێ دبێژیت :
عشق نزانێتن گەداهی
عشق نزانیتن پاشاهی
شوعلەکە ژنوڕا ئیلاهی
هەروەشکو روحو ڕەوان

## حەزینە: -

ناڤێ وی « زەینەب » ە کچا شێنخ عەبدولکەریمێ شێخ ئەحمەدیە ، ژنا حەجی مەلا عەبدولکەریمی جەلی زادەیـە ، لباژێری « کویە » یا هاتیە دونیایێ . کچەکا کـورد پەروەرو دەست هەلبوو ، خاندەڤایەکـا زیرەکو تێگـەهەشتی بـوو . هوزانڤانەکا شارەزابو . هوزانا خو دقالبـەکی ڕنیکو جـاندا ڤەهاندی یە .

ل سالا « 1330 » مێرێ وێ چو بەر دلوڤانیا خودێ ، ڤێ مـرنێ کارەکی مـەزن کرە سـەر هەستو هـزرو بیرێن وێ . ئەڤەژی نمونەکە ژ هوزانێن وێ کو یا بمرنا مێرێ خو چێکری : دبێژیت :

ئەی ڕەفیقانی شەریعەت بێن بکەن گریانو شین
حەیفە بو ئەو قطبی کامل کوچی کرد بو ژێر زەمین

* *

حەیفە بو ئەو کوهی عرفانو دەلیل زاهی حەق
پێشەوای ئەهلی محبەت ئەو « رئیس العاشقین »

* *

ئەو چراغی خانەدانی علم فلنوسی خودا
طالبی ڕاهی خوداوو ناصبی إعلامي دين

* *

وەك جەبابی حەق تعالێ مەرحەبای فەرموو لەوی
روو لە رووی کردو لە دونیای کردو داعي آخرين

* *

« إرجعي عبدي إليَّ » فەرمووی موشتاقم بە تو
« هذه جنّات عدن فادخلوها خالدين »

* *

نولدویماهیێ دبێژیت :

هەر « حەزینە » بەس بسوتێ سوتنت بێ فایدەیە
بگرە صبرێ بەلکو مأجوری لە جملەی صابرین .

* * * *

## حەیران خانما نەفچەوانی* : -

کچا کەریم خانێ دونبەلیە ، ل باژێرێ ( نەخچەوان ) یێ ل وەلاتێ قەوقازێ ژ دایك بوویە . ژینا خو یا ل « ئورمیێ » بریە سەر ، گەلەکا دەست هەل و زاناو شارەزابو ، دەستەکێ بالا هەبو دنڤیسینا هوزانێدا بزمانێ دایکیو زمانێ فارسی .. جهێ داخێیە چو هوزانێن وێ بێن بزمانی دایکێ ڤەهاندین ڤدەست مەرا نە گەهەشتینە ، لێ ئەڤە نمونەکا هوزانێن وێیە بزمانێ فارسی ، دبێژیت :

دوو چشم مست تو ظالم ، چە ظالم ، چە ظالم ، ظالم کافر
چە کافر ، کافر رهزن ، رهزن إیمان

* *

بو دحیران ترا عاشق ، چە عاشث ، عاشق بێ دل
چەبێ دل ، بێ دل والە ، چەوالە ، والە حەیران

* * * *

## مەستورە کوردستانی* : -

هوزانڤانەکا کوردە ، ناڤێ وێی دروست « ماە شەرەف خانە » ل سالا « 1220 » ێ مشەختێ یا هاتیە دونیایێ ، ژنا خەسرو خان ، ی بوو ، کو ژ مێرچاکێن کوردا یێن نباڤ و دەنگە ، میرێ تڤایی یێ هەرێما کوردستانێ بوو .

مەستورە ، کچە کوردەکا شارەزاو چەلەنگ بوو ، زیرەك و تێ گەهەشتی بوو ، هوزانێن خەمێ و شاهیێ و وەلات پەروەریێ دانانە ، کوردایەتی نیڤشکێ هوزانێن وێ بو . دیوانا وێ هاتە چاپ کرن ، پشتی گهورینیا وێ بو سەر زمانێ فارسی .

دیسا جهێ داخێیە کو چو هوزانێن وێ نەگەهەشتینە دەستێ مە .

## ژنا کوردو بزاڤا رامیاری : -

ناپلیون دبێژیت : ژن بدەستەکی لاندکێ دهەژینیت و بدەستەکی جیهانێ دهەژینیت .

ئەڤە خوش بەلگەیە بو کو ژنێژی دەورەکێ مەزن و خوگر یێ دبزاڤ و پێشڤە چوون و خەباتێدا هەی ، دژی بن دەستی و زورداری و دیلیێ .

پشتی شەرێ ئێکی یێ جیهانی ژن کەفتە دپێلین رامیاریێدا و دەست دا پیتە پێ کرنێ بهندەك کارێن پربهاو مەزن وەکی ئاشتی و ئازادیێیا گەلاو خەباتێ دژی کەڤنە پەریسی و چەوساندنێ [7] .

ژنا کوردژی ژڤا دەردەسەری و ئێشا نە یا بێ بار بوو ، بەلکی روژا ویژی هەر مژو عەورا دەستێ خو بسەردا گرتبو ، خەمێ رهێن خو ددلێ ویژیدا چکلاند بون .

ژنا کورد هەروەکی زانا سون « soan » دبێژیت ؛ یا پەیت و شارەزابوو بو سیار چاکی یێ و مشە ژێ هەنە دپەیت بو هەلگرتنا تڤەنگێ . دیسا دبێژیت ژنا کورد مل بەملێ مێرێ کورد پشکداریێ دشەریدا دکەت دژی دەست دریژی و زورداریێ [8] .

ژنا کورد دسەر جانی و دەست هەلیا خورا یا پەهلەوان و چەلەنگ بوو دشیا تڤەنگێ هەلگریت دژی دەست دریژی و نەخوشیا بەرەنگاری ئاخاوێ ببیت [9] .

ژنا کورد ناڤ و دەنگیەکا بەرفرەهـ بو خو پەیدا کربو ،

تا هندەك زەلام « كورین وا » دا هێنە نیاسیحە بناڤێ وا ، وەكی ، « باپیر شاشان دەیكا باپیرییە[10] » ، لڤێرە دیار دبیت كو ناڤ و دەنگێن باپیری بەلاڤ بوون بناڤ و دەنگێن دەیكا وی شانێ .

ژنا كورد نەك ناڤ و دەنگییا خو هەبوو بێ ی بزاڤ وكار ، نەخێر ، بەلكو گەلەك ژێ ین بوینە سەروكێن هـوزا ، وەكی ، خانم « هارتمان » كو سەروكا هەكارییا بو[11] .

هەل بشكێنەر[12] مینورسكی Minovisky دەمێ بارو كاودانێن ژنا كورد راڤە دكەت ، ڤێ چەندێ جان رون دكەت و دیژیت ؛ ژنا كورد كەسایەتییەكا خوگرو بێگومان یا هەی ، گـەلەك جارا ناڤێ كورێ وێ بێ پالدایە ناڤێ وێ و بێ هاتییە نیاسین ، دیسا گەلەك جارا ژنـێن كورد بـێن بوینـە سەروكـێن هوزاو هـەمی دەستەلاتی دلەپێ وادا بوو[13] .

ژ نووكە ویڤە دێ بەحسێ چەند ژنێن كورد كەین كو دگورەپانا راستیێدا ئالایێ خو بلند كری .

## قەدەم خێر فەیلی[14] : ـ

ژوان كچـێن كورد پـەروەرو كول نـەدەرە یێن ئـاگرێ شورشا « پشتكو » هەلكری دژی شاهێ ئیرانێ ، كو كارێ وی یێ ژ هەما لدەڤ پیروزتر ئاوارەكرن و چەوساندنا كـوردا بوو لكوردستانا ئیرانێ . گەلەك بزاڤ و خەبات كرییە ژبو ئازادكرنا مللەتێ كورد ، چو دەما سەرێ خو بو دوژمنا نەچەماندییە . لێ دوماهیكا چەند شەرو شورشێت گەرم وە دیارە كو گەلەك نەچار بوویە لەورا « رەزا شاه » گرت و كرە دزنیدانێدا ل تەهرانێ .

ئەو زیندان بو بوو نبگەهێ ژینێ تا تێڤە چوویە بەر ئازایییا خودێ ، كوڤان و هڤییێن وێ مانە ددلیدا .

## زێرینا ئامێدی : ـ

زێرین كچا شێرو خانێ میرێ ئامیدی یێیە ، سـەروكا دەولەتا ئازاد یا ئامێدیێ بوو . جانترین و زاناترین كچ بویـە چەرخێ خودا[15] . كچەكا كورد پەروەربـو ، روژا خو ڤێشت چیاو پەسارا دئێخست بدانانا رێكێتی سەركەفتنێ و هزرو بیرێن وەلاتی ، دناڤ خەم و ژان و كولادا ژیایە .

زێرینێ د بەرسڤا ناما خودا ئەوا بو پەشەنگی[16] ڤرێكری كو دەنگێ خو دابو دگەل دەنگێ وی ، دلسوزیا خو بەرامبەری مللەتێ كورد دیار دكەت و دبێژیت ؛ من بریار یا لسەر نـەفسا خودای تا هیڤیێن خو بجەنەئینم شوی نەكەم ، چونكی ئەز ڤێ چەندێ بیا دوویێ ددانم ، یا ئێكێ من دڤێ هەمێ لات و چینێن كوردا بكەم وەلاتەك و ئیمارەتەكا مەزن ژ كوردارا دانم ، چو چارا سەرێ خو بو فارس و روم و چو كەسێ دی شوو نەكەم ، خارنا وەلاتێ كوردا نەدەم خەلكێ بیانی[17] .

پشتی كو هەرقەلی و قەیسەرێ رومێ و یەزدی گوردیی و پەشەنگی دەنگێ خودایە پال دەنگێ زێرینێ بوان كارێن برێڤە دبرن ، زێرین ئێخستە قالبەكی بهێزترو پتر شیا بزاڤێ بكەت و بەرامبەری دەست درێژییا راوەستیت و شیـا ئالایێ كـوردا دهـەمی دەڤـەرێن كـوردیـدا بچـەقینیت . بـەلێ پـا ئـەڤ سەربەخوبونە وگەرماتییە یا ژی كورت بوو گەلەك نەكێشا ، لەشكەرێ عەرەبا پێ خو دانا دعێراقێدا ، زێرین ل قادسییێ دگـەل كەفتـە دشەرێدا ب لەشكـەرێ خـوڤـە ل « 16 » ی صەفەرێ « 637 » ی ز .

پشتی چەند سالا دناڤ خـەم و ئازارادا ژیـای ل سالا « 645 » ی ز ل چیایێت پشتا وانێ .. وێ و پەشەنگێ جانێ خو یێ پیروز دیاری ئاخا باب و باپیرێن خو كر[18] .

زێـرینێ دەستەكێ بـالا هەبـوو شـارەزابـوو زیـرەك و تێكەهەشتی بوو ، بزاڤا سەربەخوبونا كوردا هیڤی و هزرەتا وێ بو .

رێكا شەرەڤێ و سەرفەرازیێ لبەر سنگێ ژن و مێرێن كوردا خویا كر .

پشتی كو روژا وێ ئاڤابووی ، عەرەبا دەستێ خو بسەر كوردستانێدا گرت ، بڤی رەنگی دەولەتا ئازاد یا زێرنیا ئامێدی بدویماهی هات[19] .

## حەپسەخانی نەقلیب : ـ

كچا شێخ مەعرووفێ حەفیدێ ئەحمەدێ شێخییە ، ل بازێرێ سلێمـانییێ یا هـاتییە دونیـایێ ل سالا « 1891 » .

دوتماما شێخ مەحمویدێ پەهلەوان‌و نەمرە ، ژنا شێخ قادرێ حەفیدە یە .

ل « 15 » ی گولانا « 1953 » ی ب نەخوشیا پەنچە شێرێ چو بەر دلوڤانیا خودێ . ل گرێ « سەیوان » یا هاتی یە ڤەشارتن[20] .

ژنەکا کورد پەروەر بوو ، ئێکە ژوان بزاڤکەرێن رێکا راستی‌یێ گرتی‌و پشتەڕی‌یا وێ نەبووی . د سالێن سهادا چەند نامەیێن نەخاسمە ڤرێکرن بو بارەگا وەلاتێن ئێککرتی ل « جنێڤ » ، تێدا بەحسێ وا خەم‌و ئێشا دکر ئەوێن بسەر کورادا دبارین[21] . ئەو نامە نوکە یێن بونیە نیشانێن پڕ بهاو پایە بەرز بوو لدویڤ چوونا دیروکا نوی‌یا گەلێ مە[22] .

د ڕوژێن کومارا مەهابادێدا « میناخان » ا هاوسەرا ( قازی محمد ) ێ نەمر جهێ وێ گرت‌و بزاڤکر بو دانانا ئێکەمین رێکخراوا ژنا[23] .

## عیسمەت قازی موحەممەد :[24] -

کچا پەهلەوانی نەمر « ڤازی محمد » ی یە ، یا تێکەهەشتی‌بو ، دەستەکێ بالا هەبو دڤەهاندنا هوزانێدا ، نەخاسمە لسەر لایێن جڤاکی‌و ڕامیاری ، هەر دوی دەمیدا کچەکا ئازاو زیرەك‌و کوردپەروەر بوو ، کوردایەتی کاکلکا هوزانێن وێ بوو .

پشتی کو بابێ وێ یێ نەمر « ڤازی محمد » هاتی‌یە شەهیدکرن بدەستێ کاربەدەستێن ئیرانێ ، هەڕەشە برنە سەرکچاوی ( عیسمەتێ ) لێ سەرێ خو بلند ڕاگرت‌و وەکی چیایەکی لبەر سینگی ڕاوەستیا ، بەختێ وێ قەبیل نەکر ئاخا خو ڤدەسَت دوژمنێرا بەردەت . تا سالا « 1953 » ی ژبەر چەند ئەگەرا خو بدەستێن خو کوشت‌و ناڤێ خو دا بخودان کرن .

خەبات‌و بزاڤا عیسمەتێ‌و قەدەم خێری‌و حەپسەخانێ‌و هەمی ژنێن دی یێن کورد دپێنجەمەتا سەربەخون‌و ڕزگاری‌یێدا .. یا بویە نەخشێ سەر بەرا لپێش چاڤێن هەمی کوردێن دل سوزو یێن بووینە ئەگەرا بلندکرنا دەنگێ ژنێن کورد .

### ژێدەر : -

1 — کاودان : ضروف .

2 — کوڤارا چیا ، سالا ئێکێ ، ژمارە ( 2 ) ، 1971 ، هەولێر ، ب[35] .

3 — ئافرەتە ناودارەکانی کورد

4 — هەر ئەو ژێدەر

5 — هەر ئەو

6 — باسیل نیکیتین ، الاکراد ، اصلهم ، تاریخهم ، مواطنهم ، عقائدهم ، عاداتهم ، قضایاهم ، طرائف عنهم ، 15 — 5 — 1967 . ب[284] .

7 — د .کمال مەزهەر ئەحمەد ، ئافرەت لە مێژووی کوردیدا ، کورتە باسێکی مێژوویی‌و کومەلایەتی ، ب[71]

8 — د .شاکر خصباك ، الاکراد ، دراسة جغرافیة اثنوغرافیة ، مطبعة شفیق ، بغداد ، 1972 .

9 — رحلة متنکر الیٰ بلاد مابین النهرین . ب[185] ، تألیف : میجرسون . ترجمة : فؤاد جمیل .

10 — ژێدەرێ چووی . ب 190 .

11 — هەر ئەو ژێدەر .

12 — هەلبشکێڤەر : باحث .

13 — د .شاکر خصباك . الاکراد ، دراسة جغرافیة اثنوغرافیة ، مطبعة شفیق ، بغداد . 1972 . ب 447 .

14 — ئافرەتە ناودارەکانی کورد.

15 — میرزا محمد امین مەنگوری . زێرینای ئامێدی ، کچە کوردی قارەمان ، « 637 » ی ز.1971 ب14 .

16 — میرێ وانێ بوو لکوردستانا تورکیای .

17 — میرزا محمد امین مەنگوری ، زێرینای ئامێدی ، کچە کوردی قارەمان ، ( 637 ) ی ز.1971[22]

18 — ژێدەرێ بوری ب 40 .

19 — هەر ئەو ژێدەر .

20 — ئافرەتە ناودارەکانی کورد .

21 — د . کەمال مەزهەر ئەحمەد ، ئافرەت لەمێژووی کوردیدا ، کورتە باسێکی مێژوویی‌و کومەلایەتی .

22 — ژێدەرێ چووی .

23 — هەر ئەو ژێدەر .

24 — ئافرەتە ناودارەکانی کورد .

ئەنوەر قەرەداغی

## ئامێری مۆسیقا

# کەمانچە

### مێژووی

کۆنترین ئامێری ژێدارەکە بە کەوان لێ درابێ لە جیهاندا ، ئامێرێکی هیندی‌یە کە مێژووی ئەگەڕێتەوە بۆ پێنج هەزار ساڵ پێش مەسیح ، ئەو ئامێرەش ناوی (راڤاناسترۆن)ە کە دوو یان سێ ژێی هەبووە ، ئەم ئامێرە زۆر پەرەی نەسەندوە لە بەر ئەوە ووردە فەوتاوەو نەماوە (نموونەی ژمارە 1) . وەك زۆر لە سەرچاوە نووسراوەکانی جیهانی باس ئەکەن و ئەڵێن ئامێری کەمان ئەچێتەوە سەر ئامێری (رەبابە) کە لە گەلێك لە وولاتەکانی جیهاندا بە شێوەی جیاواز لە یەك هەن . لە هەموویان کۆنتریش ئەو ئامێرەیە کە لە سەروو ناوەڕاستی وولاتی عێراقدا هەبووە کە تەنها یەك ژێ یان دوو ژێی هەبووەو بە کەوانەیەکی کورت لێ دراوەو پێی ووتراوە (ربابە) . (نموونەی ژمارە 2) .



نمونه 2

هەروەها لە ناوچەی جەزیری خۆمان پێی ووتراو (رەبابی جەزیرە) (نموونەی ژمارە 3) ،.هەبووە پێی ووتراو



نمونه 3



نمونه 1

(رەبابی ترکی) یان (ئەرنەبە) (نموونە ژمارە 4) یان هـەبووە پێی ووتراوە (رەبابی یۆسلاڤ) (نموونەی ژمارە 5) یان هەبووە پێی ووتراوە (رەبابی جەزائری) یان (سوری) یان (میسری) یان (چینی) (نموونەی ژمارە 6) ئەم ئامێرە لە هەر ناوچەیە ناوی نـاوچەکـەی وەرگرتـوەو تیا بـڵاو بـووەتـەوەو دەستکـاری کارمەنـدانی خۆی دیـوە تا گـەیشتووەتـە پلەیەکی نـاسراو هەرچەندە هەندێ رای تریشی هەیە لەسەر دروستبوونی ئەم ئامێرە بەڵام بە گشتی زۆر ترینی راکان لەم جـۆرە بووە کـە باسمان کردن هەر چەندە جیاوازییەکی بچـوکیش هەیـە لەم رایانەدا ، هەندێـك دروستبوونی ئـەم ئامێـرە دەگێڕنـەوە بۆ سەرەی یەکەمی زایینیو بە ناوی رەبابەوە ناسراوەو یەك ژێی هەبووە ، دوایی بووە بە دوو ژێی هاوسان لە ئـەستووریو درێژیدا ، پاشان بووە بە چوار ژێ ، هـەر دوو ژێیان هـاو ئەستووربووەو لە دوانەکەی تر ئەستوورتریان باریکتر بووە ، ئەم جۆرە ئامێرە لە میسردا پێی ووتراوە (رەبابی شاعیر) کە سندوقەکەی لە شێوەی لاکێشەیەکدا بووەو ئەم لاو ئەو لاکەی قەوسێکی بۆ ناوەوە تیا بووە .

پاشان جۆرێکی تر پەیدا بووە کە سندوقەکەی بە نیوەی توێکڵ گوێزی هیندی دروستکراوە ئـەویش لە هەنـدێ جێگا پێی ووتراوە (کەمانجە) یان (چەمانجە) ئەویش (جۆزەی) لای خۆمانە [وەك نموونەی . 7] ، پاشان رەبابەی سەرووی ئەفریقا کە ووڵاتانی میسرو جەزائیرو مەراکشو تونس ئەگرێتەوە .

ئەم ئامێرە لە گەڵ هاتنی ئاینی ئیسلامدا بۆ ئەنـدەلس



ئەرنەبە (رەبابەی تورکی) نمونە (4)



رەبابی یۆغسلاڤ نمومە (5)





نمونە 6



نمونە 7

بڵاوبۆتەوەو لەوێوە گەیشتۆتە وولاتانی ئەورووپا . هەر لەو وولاتانەشدا دەستیان کرد بە دروستکردنی ئەم جۆرە ئامێرە . ئەوە بوو مۆسیقا ژەنە گەڕۆکەکان بەکاریان ئەهێنا ، پاشان کۆمەڵێ (ترووپا دۆ Trobadur) ئەمانە ئەو کۆمەڵە بوون کە ئاوازیان دائەناو بە هۆنراوەی خۆیان لە ناو کۆشکەکاندا بە سەماکردنەوە ئەیان ووت .

بۆ یەکەم جار لە فەرەنسادا شێوەی ئەم ئامێرەیان دروستکردو ناویان نا رۆبێلە یا (رۆبیبە) ، ئیتالیەکانیش ئامێرێکیان لەسەر ئەم شێوەیە دروستکردو ناویان نا (ربێس) یان (ربێسە) لە سەدەی (14) هەمدا ئەم ئامێرە لە وولاتەگانی ئەورپادا زۆر بڵاوبووەو گۆڕانی بەسەردا هات هەتا کۆتایی سەدەی (15) هەم کە ناوی (ڤیۆلا) دەرکرد واتە (ژێ) .

گەلێ جۆر لەم ئامێرە دروستکرا ، جۆرێکیان ناوی (ڤیۆلای باسک)بوو (نموونە 8) کە لە ساڵی 1742 زانیی‌دا دروستکراوە . ئەم ئامێرە لە سەر شان راگیرکراوە لەکاتی لێداندا ، جۆرێکی تریان ناوی نرا (ڤیۆلای ئەژنۆ) چونکە لە نێوان هەردوو ئەژنۆدا دانراوەو لێ دراوە (نموونەی 9) .

هەروەها (ڤیۆلای ئەڤینی) ئەم ئامێرانە پتر لە (4) ژێیان هەبووە ، هەیانە(5) یا (6) یا (7) ژێ یان هەبووە ، بەلام ئەم فرە ژێیە یارمەتی ئەوەی نەداوە کە بە باشیو پاکی لەسەر ژێکان کەوان بەکار بهێنێو دەنگەکان باش دەربچێت لەبەر ئەوە ئەم ئامێرە لە گۆڕیندابوو تاکو وای لێ هات هاتە سەر چوار ژێ ، ئەم جۆرەش لە کۆتایی سەدەی (18) هەمدا لە دەورو بەری ساڵی 1873دا دروستکراوەو چوار ژێی لێ بەستراوەو لە مۆزەخانەی شاری (مارکنویکرش) لە ئەڵەمانیای دیموکراتی نموونەیەکی لێ دانراوە .

لەم جۆرە (نموونەی ژمارە 10) . لە ئەورووپادا نموونەی جوانترو بچوکتر دروستکراوە کە پێی ووتراوە (کەمانی گیرفان) ئەم جۆرەش بە زۆری بۆ سەماکردن بەکار هێنراوەو بە ئاسانی بەم لاو بەولادا براوە [نموونەی ژمارە 11] .


نموونە 10


نموونە 11


نموونە 9


نموونە 8

لە گەڵ ئەم جۆرانەی سەرەوەشدا جۆرێکی تریش لە فەرەنسا هاتە کایەوە کە لە قەوارەو ژێکانی دا جیاوازی هەبوو لە گەڵ ئەوانەی تردا ئەویش پێی ئەوترا (ڤیولای لامۆر) کە (7) ژێی هەبووە . لەم ئامێرەشەوە ئامێرێکی تر هاتە کایەوە وەك

ئامێری کەمانی لێهاتووە پێی ووتراوە (ریبیك) لە سەدەکانی (14)هەمدا ئەم جۆرە بە فراوانی لە ئەوروپا بلاوبووەوە ، زۆرلە شاعیرە مۆسیقا ژەنەکان بەکاریان هێناوەو ناویان ناوە (مینستریل) ، ئەڵێن ئەو کۆمەڵە شاعیرە مۆسیقا ژەنانەش هەر کۆمەڵی (ترووبادۆر) بووە .

لە سەدەی پانزەهەمدا ئامێرێك هەبووە کە لە شێوەدا زۆر لە (ئەرنەی ترکی) چووەو ناوی (کرۆت) بووە ، بەلام بە کۆمەڵی رەبابە ناژمێررێت ، چونکە لە رۆژئاوای (دورگەی بەریتانیا) پەیدابووە کە دوورە لەو ناوچانەی رەبابەی تیادا بووە . رەبابەش لە وولاتەکانی رۆژهەلات بە تایبەتی عیراق و سوریەو وولاتانی سەروی ئەفریقا پەیدابووە .

لەپاش سەدەی 17 هەم ئەم ئامێرە باش پەرەی سەندو جۆرەهای تری لێ دروستکرا ، دوا قەوارەی مامناوەندی بوو بۆ دەستی ئادەمیزادو چوار ژێی لەسەر ئەبەسترا ، ئەم جۆرە بە ئیتالی پێیان ئەوت (ڤیولینۆ) و بە فەرەنسی پێیان ئەووت (ڤیولۆن)و بە ئینگلیزی (ڤیولین) لای خۆشمان پێی ئەڵێین (کەمانجە) یان (کەمان) . بەلام ئەوەش لەبیر نەکەین کە (ڤیولینە) یەکەم ناوی ئەم ئامێرەبوو کە لە ساڵی 1523دا بە سەریدا برا .

ئەوروپاییەکان وەستاییەکی تەواویان بە کارهێناوە لە پەرەپێدانی ئەم ئامێرەدا لەسەر بناغەیەکی زانستی و گەلێ نموونەیان لێدروستکردوە کە لە قەوارەی دەنگدا جیاوازیان هەبێ ، بە جۆرێ هەر یەکەیان جورێکی تایبەتی لەچینەکانی دەنگ بە باشی دەربهێنێ وەك دەنگەکانی (باس ، تینۆر ، ئالتۆ ، سۆپرانۆ) .

ئەم جۆرە ئامێرە ژێدارانە کە یەك جۆرن و هەریەکەیان چینێکی دەرئەبرێ پێیان ئەڵێن (سترینگس فامیلیا) (Strings family) واتا (خێزانی ژێ دارەکان) کە بریتین لە (کەمان ، ڤیولا ، ڤیولۆنسیل ، کونتر باس) .

**دروستکردنی ئەم ئامێرە**

لە سەرەتادا لە ئەوروپادا بە تایبەتی لە وولاتی تیرۆڵ و ئیتالیا زۆر خەریکی دروستکردنی بوون . ئەو خێزانانەی خەریکی دروستکردنی ئەم ئامێرە ئەبوون ئەمانەن :

1 - **خێزانی (ئەماتی) کە بە سەلیقەترین خێزان بوون بۆ دروستکردنی ئەم ئامێرە لە سەدەی شانزە هەم و هەڤدەهەم لە ناوچەی (کریمۆنا) لە دەشتی (لۆمباردی) لە ئیتالیا .**

2 - **خێزانی (ستراديڤاريۆس) ساڵی** 1644 — 1737 .

3 - **خێزانی (جوارینریۆس) ساڵی** 1626 — 1698

ئەم دوو خێزانی دوایی رۆڵێکی گرنگیان هەبوو لە پەرەپێدانی ئەم ئامێرە لە دروستکردنیدا ، کارزانانە جوانکاری و ووردەکاری و رێك و پێکیان بەکار دەهێنا . بەم جۆرە لە سەدەی 18 هەمدا جوانترین شێوەی وەرگرت .

چەندەها کارگەش لە ئەڵەمانیادا . بە هۆی (یاکوب شتانیر) وە لە نێوان خویاندا بۆ دروستکردنی نایابترین ئامێری کەمان پێشکەوتنیان دەکرد ... بەلام ئەو خێزانانەی کە باسمانکردن هەر بە ناوداری مانەوەو لوتکەی کارەکەیان گرتبووە دەستخۆیان ، هەر چەندە زۆر هەوڵ ئەدرا بۆ ئەوەی کارەکانیان بشکێنن و رەواجی نەهێڵن ، پاش ئەمانیش لە سەدەی نوزدەهەمدا بە هۆی (جان بانێت) هوە قوتابخانەیەکی تر پەیدا بوو . بەم جۆرە کارگەو وەستای دروستکردنی ئەم ئامێرە لە پەرەسەندندابووە هەتا ئەمرۆ .

ئەم ئامێرە لە چاکیدا ئەگەرێتەوە بۆ ئەو دارەی لێی دروست ئەکرێ و ووردەکاری و ئاگاداری کورتی و درێژی و ئەستوری پارچەکانی ئەم ئامێرە . هەرچەندە بە کارکردن کۆنبێت ، ئەوا دارەکەی باشتر ئەبێ و ئەو دەنگەی لێی دەرئەچێ ناسکترو خۆشترو رێکترو پاکتر ئەبێت و نرخیشی گرانتر ئەبێت ، چونکە بەو لێدانە گۆڕانێکی فیزیکی بەسەردا دێت .

ئامێری کەمان لە داری سنەوبەر دروست دەکرێ ... دارەکە ئەبڕرێو دائەنرێ تا بە تەواوی ووشك ئەبێتەوە بۆ ئەوەی پاشی پارچاندی بۆ دروستکردنی کەمانەکە ڕیزەی درێژیو کورتی نەگۆڕێ ، چونکە ئەبێ ڕێژەیان هەمیشە وەك خۆیان بمێنیتەوەو زیادو کەم نەکەن .

**کەوانەی ئامێری کەمان** :وێنەی ژمارە (12)



کەوانەی کەمانجە نمونەی ژمارە (12)

کەوانەی کەمان لە کۆتایی سەدەی (18) هەمدا دوا شێوەی خۆی وەرگرت ، لەوەپاش گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە ، جگە لە ووردەکاری لە دروستکردنیدا ، بەلام پێش ئەم بەروارە وەك کەوانەی (ڕەبابەو ڕافانا سترۆن) وابووە . خێزانی (تۆرتێس) ی فرنسی لە گۆڕینوچاککردنو پەرەپیدانی کەوانەدا زۆر هەولیان داوەو دواشێوەی کەوانەش لە بەرهەمی دەستی (فرانسوا تۆرت)ە کە دوایین یەکی ئەو خێزانەبووە . لەپێش ئەمانیش‌دا هەندێ هەوڵ دراوە ، بۆ نموونە (کۆریلی) لە سالی (1653ز) داو ڤیڤالدی لە سالی (1692ز) دا . بەلام هەولی ئەمانە وەك پەرە پێدانەکەی (فرانسوا تۆرت) نەبووە . درێژی کەوانەکەی کە دروستی کردووە (75سم) بووە لە داری (فێرنامبوك) دروست کراوەکە لە بەرازیل زۆرە ، تالەکانیشی کۆن لەمووی کلکی ئەسپ دروست ئەکرا بەلام ئێستا لە نایلۆنێکی تایبەت دروست ئەکرێت .

**نرخی هونەری‌ی کەمانجە** :

نرخی هونەری‌ی ئامێری کەمانجە لە لایەن گەلانی جیهانەوە زۆر نرخێنراوە پاش ئەوەی دوای سەدەی (15) تا (16) هەم دەوری خۆی درایە بۆ بەکارهێنان ... لەبە ئەوە زۆرترین تیپە موسیقاکا ن ئایا ئۆرکسترابوو ، یان میللی یان جاز تیپی ئاسایی زۆر بەکاریان هێناوە وەتا ئێستاش هەروایە ، تەنانەت ناونراوە بە گەورەی ئامێرەکان واتە (سید الالات الموسیقیە) ، چونکە لە زۆرترینی تیپە موسیقاکاندا جێگەی یەکەمی گرتووە . کەمانجە بە هەموو جۆری جوانترین هەست دەرئەبڕێ بە تایبەتی ئەتوانین بلێین کە بە هەستی موسیقا ژەنەکە یان ئاوازدانەرەکە یان کۆندەکتەرەکە دەنگی لێوە دەرئەچێ ... وەك فەیلەسوفو شاعیری ئەلمانی (هایتی) ئەلێ (ئامێری کەمان دەروونی ئادەمیزادی هەیە ، بە هەستی موسیقا ژەنەکە قسە ئەکا ، هەستەکانی ئادەمیزاد چەند کەمیش‌بن دەریان ئەخاو دەریان ئەبڕێ چونکە لە کاتی لێدانی‌دا لەسەر شانی چەپی دای ئەنێو نزیکە لە دلیەوە بۆ ئەوەی ترپەی دلێ لە ژێکانیەوە دەرببڕێو گەورەی بکا) .

لە کەمانجەدا گەلێ نهێنی سەرسوڕهێنەری وا لە ژێکانیو سندوقەکە ی‌و کەوانەکەی‌دا هەیە لە ژمارە نایەت بۆ دەرهێنانی ڕستەیەکی موسیقاکە ئامێرە موسیقاکانی تر ناتوانن دەری بهێنن یان دەری ببڕن بەلکو بە هێزترین دەنگی ئادەمیزادیش بۆی دەرنایەت . ئەو چینە دەنگانەی پێی دەردێ لە سێ چین دەنگو نیو پترە . بەم جۆرە دەنگی لە دەنگەکانی (سوپرا نۆی یەکەم) دایە کە دەنگی تیژی ئافرەتو منالانە .

هەستی توندیو نەرمیو خۆشەویستیو هەلچوونو خۆشیو ناخۆشیو چەندەهای‌تر لەم بابەتەی پێ دەرئەبڕدرێ .

**ژێی کەمانجە** :

ئامێری کەمانجە چوار ژێی هەیە ، ئەم ژێیانە هەریەکەیان لە ئەستوریدا جیاوازن . یەکەم ژێ پێی ئەوترێ ژێی (می) کە باریکترین ژێی کەمانجەیە ، دووەم پێی ئەوترێ ژێی (لا) کە لە ژێ ی (ی) ئەستوورترە ، سێیەم پێی ئەوترێ ژێی (ڕێ) کە لە ژێی لا ئەستوورتروگرترە ، چوارەم پێی ئەوترێ ژێی (سۆل) کە لە هەموو ژێکان ئەستوور ترو گرترە . هەر ژێیە لەسەر ناوی خۆی توند ئەکرێو ژێی (سۆلە)وە بۆ (ڕێ)و بۆ (لا)و بۆ (می) هەر یەکەیان بۆ ژێی ئەنیشت خۆی بە پێنج دەنگ لە یەك دوورن .

دەنگەکانی لە دەنگی سۆلی ژێر پلیکانەی مۆسیقاکە کلیلی سۆلی بۆ بەکار بهێنین دەست پێ ئەکا تا دەنگی سۆلی پێنجەم ئۆکتاف کە لە 4 ئۆکتاف دایەو ئەشتوانرێت پتر لەم دەنگانەی پێ لێ بدرێ (نموونە 13)




بۆ نووسینەوەی نۆتەی ئەم ئامێرە کلیلی سۆل بەکار دەهێنرێت ژێی یەکەم نۆتەی بۆشایی چوارەوە لە پلیکانەی مۆسیقادا ، ژێی دووەم نۆتەی بۆشایی دووەمە لە پلیکانەی موسیقادا . ژێی سێیەم نۆتەی ژێر هێلی یەکەمی پلیکانەی موسیقایەو ژێی چوارەم نۆتەی خواروی دوو هێلی زیادی ژێر پلیکانەی مۆسیقایە ، (نموونەی 14) .



**گرتنی ئەم ئامێرە :**

ڕاست گرتنی ئەم ئامێرەو هەموو ئامێرێکی تریش نیوەی فێربوونی ئامێرەکەیە . کەمانجە ژەن لە کاتی گرتن یان لێدانی ئامێرەکەی دا ئەبێت ڕێك بالابێت و شۆخی خۆی بگونجێنێ لە گەل گرتنی ئامێرەکەی دا ، بزانێ چۆن ئەیگرێت و چۆن دەستی کەوانەکەی بەکار دەهێنێ و جومگەکانی هەردوو بال و مەچەك و دەست و پەنجەکانی دەجولێنێ و بەکاریان دێنێ ، چۆن ملی کەمانجەکە ئەخاتە ناو دەستی یەوە ، چونکە مەرج نیە هەموو گرتنێکی کەمانجە ڕاست بێ .

گەلێك هەن لە کەمانجە ژەن پتر لە 10 — 15 سال خەریکی کەمانجە لێدانن بەلام زۆر پێش ناکەون و ئەدەنە دواوە ! . ڕەنگە هۆی سەرەکی پێش نەکەوتنیان باش نەگرتنی ئامیرەکە بێ .

ئەوەی دەیەوێت فێری ئەم ئامێرە بێت پێویستە بە ڕاستی و بەدل حەز بە فێربوونی بکات و کاتی تەواوی بۆتەرخان بکات چونکە بڕوا ناکەم کە بەبێ شەونخونی بە دیارکاری هونەری یەوە بگەینە ئەو مەبەستەی ئەمانەوێ ، ئەبێ ئاراممان هەبێ لە مەشق کردنداو لە وەرگرتن و ڕاستکردنەوەی ئەو هەلانەی تووشمان دێ . ئامێری کەمانجە توانایەکی تایبەتی و هەست و دەرونێکی زۆر ناسکی دەوێ بۆ فێربوون چونکە زۆر هەستدارەو بە کەمترین و بچوکترین جولەی پەنجە لە سەر ژێکانی دەنگەکە ئەگۆڕێ .

**سەرچاوەکان**

1 ـ الموسيقى النظريه تآليف سليم الحلو
2 ـ تأريخ الالات الموسيقيه تآليف دكتور محمود احمد الحفني
3 ـ دعوه الى الموسيقىٰ تآليف مايسترو يوسف االسيسى
4 ـ محاضره د. خالد ابراهيم
5 ـ الموسيقى النظرية تآليف د. محمود احمد الحفني 1954
6 ـ قواعد الموسيقى الغربية وتذوقها تآليف د.محمد محمود سامي الحافظ
7 ـ تمهيد للفن الموسيقي تآليف ماكس پنشار ترجمة محمد رشاد بدران
8 ـ Musical Instrument by ANN REES, B.Sc.
9 ـ In struments of the Orchestra by charles W.Walton

# بەشەکانی کەمانچە

سەری دەسکەکەی

کلیلی کەمانچە

زمانی ژێ گان

ملی دەسکەکەی

رووی ئەودیوی کەمانچە

سنگی سەرووی کەمانچە

تەختەی پەنجەگان

قەوسی لاکانی

مووی کەوان

ژێ گان

تەختەی ژێ گان

کونی کەمانچە

داری کەوان

سنگی خوارووی کەمانچە

شانەی ژێ گان

چەناگە

برغوی ژێ گان

دوگەی ژێ گان

ئەلی قایم کردن

مەکینەی جولان

بنی کەوان

برغوی کەوان

## کەمانچە بەشێوەی ئەمڕۆ






تەختەی بەینی سەرەوەو خوارەوە



میوت
یان سۆردینە
یان ئاسنە یان تەختە بۆ کزکردنی دەنگ
بەکار دەهێنرێ کە ئەکرێ بەسەر تەختەی
ژێ گاندا



چنۆکی کەوان
بۆ چەورکردنی مووی کەوان
بۆلێدان

# گۆرانی « گلەیی لە کەس ناکەم »

هەڵبەستی : پیرەمێرد
ئاوازی : فۆلکلۆری

ئامادەکردنی : ووریا ئەحمد
گوتنی : دلێر صادق



گلەیی لە کـەس نـاکـەم     بـۆ بـەختی خـۆم ئـەگـریم
دڵی خـۆم بـۆتـۆ هـانـی     زاڵم قـەدرت نـەزانـی

* * *

دایـم دڵم دەشـکـێـنـێ     رۆژێـك ئـەبێ نـامبـینـێ
دێی دەگـەڕێی لە شوێنم     ئـەوسـاکـە من نـاتبێنم

* * *

شـەزتبێ ڕۆژێکم مـابێ     نـەهـێـڵم دڵـت لابـێ
هـێـنـدەی لێپـاڕامـەوە     ڕووی نـەکـرد بـەلامـەوە

* * *

بـەئـاهـم گـرفـتـاربـی     لای عـەشقم شەرمـەزاربی
چـاو کـاڵ لەتـۆ تـۆراوم     دڵم تـەنـگـەو گـریـاوم
گلەیی لە کەس ناکەم ...

ئەم گۆرانیە ئامادەکرا بۆ ئەوەی لە میانی فیستیڤاڵی یەکەمی هونەری کوردی پێشکەش بکرێت لە بەغدا بەیارمەتی تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە بەلام لەبەر چەند هۆیەکی هونەری نەتوانرا پێشکەش بکرێت .

# گۆرانی «جوانی کوێستان»

ئاوازی : فۆلکلۆری
هەڵبەستی : جلال جۆبار
ئامادەکردنی : وریا ئەحمد
گوتنی : صلاح محمد




با بچینە کوێستان بۆ گەشتی ئەم ناوە
جوانی جیهانی خوا بەم شوێنە داوە
ئەم ناوچە جوانە شوێنی کۆچەریانە
هۆبە بە هۆبە رەشماڵیان هەڵداوە
تا چاو لێ ی دیارە چیمەن و گوڵزارە
پڕ جۆگەو کانی و ڕووباری بەفراوە
لە چلەی هاوینا ئەو بەهار ببینە
قەندیل مەندیل هەر فرێ نەداوە
بلوێری شوانی لە بەرزی تەلانی
کیژ لەسەر کانی دێنێتە سەماوە

یەکەم جار لە میانی فیستیڤاڵی یەکەمی هونەری کوردی لە بەغدادا پێشکەش کرا بە دەنگی (صلاح پشدەری) ساڵی 974 بە یارمەتی تیپی مۆسیقای باواجی . بۆ جاری دووەم ساڵی 1978 بۆ تەلەفزیۆنی بەغدای ڕەنگاوڕەنگ تۆمارکرا بە یارمەتی تیپی هونەری هەولێرو بە دەنگی (صلاح محمد) .

# لە یادگارەکانی مەکسیم گۆرکییەوە

وەرگێڕ: د. احسان فؤاد

ئەم هۆنراوەیە زۆر بەدڵم بوو، خاوەنەکەشی کە کیژۆڵەیەکی بوێژە بە تەواوی بەزەیی لە دڵما جوڵاند.. سەیرکەن چۆن دەتوانن ئازارو ناسۆری دەروون دەرببڕن؟
خاوەنی ئەم دێڕانە کیژۆڵەیەکی نازدارە، لە وەرزی بەهاردا لەگەڵ برادەرەکەی خەریکی گەشت و گەڕان بووە! کە زستان نزیکبۆتەوە ئەمی بەتەنیا بەجێهێشتووەو بەخۆی ڕۆیشتوە.. ئەم بەجێهێشتنە زامێکی قووڵی لە دڵی کیژۆڵەکەدا هەڵکەندووە، کەمایەی ئازارکێ بێ وێنە بووە.. مرۆڤ ناتوانێ باسی شتێ بکات بە جوانی، ئەگەر بەراستی و دروستی هەستی پێنەکردبێ! دەسەیری ئەم کیژۆڵە لە دۆست و برادەرە بڕاوە چ هۆنراوەیەکی هۆنیوەتەوە....

مەکسیم گورکی
یادگارەکان «بەرگی سێهەم»، چاپی ئەکادیمیا.

(بەفری یەکەم)

هەی داخەکەم ئاوابوو ڕۆژی هاوین
لە تاریکی شەوا کەوتە ئاوابوون!
کەوتە ئەو دیو دارستانە دوورەکان
منی جێهێشت بۆ سروەی گەڵاڕێزان!
سبەی تەنیا، تەنیا تەنیا دەبم من
دەست لە ملی بەهار ناکەم ئیتر من!
کە چوومە سەرڕوخی شەقامی گەورە
لە چوار لاوە یادگارم لە دەورە
یادەکانی مانگی ئەیار لەبیرما
هەڵدەقوڵێن لەناو دڵو لەسەرما!
مەلبەندەکان ئێستا رووتن بە جارێ،
نمنم تەمو خەمیان لە ڕوو دەبارێ،
ئای لەوێدا مەستبووم بەلام بۆ تاوێ
ئای لەوێدا لاویم دۆڕان بەهارێ...
زوقمو خەزان: کەلایان ڕاپێچاوە
مەلو چرۆ: ئاهەنگیان لێبڕاوە!
ئازیزان ئاخ! بەفری یەکەم کە باری...
سینەم بگرن دل دەربێنن بە دیاری...
لەناو کلۆی ئەو بەفرەدا بتنێژن!
ماڵتان ئاوا! فرمێسکم بۆ مەڕێژن!

# بۆ خۆشترین درود ..

«بۆ بیرەوەری شاعیری ناسراوو بە توانا مامۆستا علی کمال باپیری خوا لێ خۆشبوو وتراوە»

- ١ -

لەسەر روکاری چارەی من وشەی شادی نەبینراوە
بە ناسۆری ئەم ژیانەم بەجێ دێڵم ئانەی چاوە
لەناو شالاوی تەنگانە بەگژ بوونی ڕەشما ئەچم
ڕەنج و گەنجم پەژارەیە بەدەس دەردەوە مل کەچم

- ٢ -

تێبینیکەن لە ناکاوا چرای ژینی ناو دارێکمان
ئەکوژێتەوە بەبای مەرگ خامۆش ئەکا ڕووی شارێکمان
دیومخانی زاناو ئەدیب بە فرمێسکی شین شۆراوە
لەو کاتەوە (کەمالی)مان لە باوەشی ژین تۆراوە

ئەگەر وەفا لە مێژوودا کەردێ وەفای لەبیر مابێ
هەناسەی ناسەوەن ناکا لە ئەستۆی سهڵە گیرنابێ
ئەوەی ئەو کردی لەرازە دەربارەی باری پشکەوتن
بۆ هەستیارێ وا کەمنەبوو، نەبووە یاری خوانو خەوتن
لەگەڵ درێژی تەمەندا سەرگەردانیو هەزاری چەشت
پاداشتی بێیارمەتی لە کونج خزاو بێبەش لە گەشت
لە فرمێسکی چاوەکانم ڕێژنەی باران دروست ئەکەم
بۆ سەر گۆڕت گوڵ بڕوێنێ، دەرگو دانی پێ پەست ئەکەم

○ احمد حسین احمد ○

## پەندێکی یەکبوون بۆ منالان

مدحت بێخەو
1974-6-20

منـــالەکان هـــــەبوو نـــــەبوو
دەڵێن لـــە کۆن لـــە دەوری زوو
چوار بـــرای ناســـوودەو تەبــــا
بە هۆی بەدکار بەینیـــان تێکچوو
زوو لەیەکتـر جیـــا بوونـــەوە
بـە وێنـەی قـــەپێلکو بـــەڕوو
بـــرای گـــەورە کوڕی کوژرا
بـەبێ تۆلـــە خوێنی ونبـــوو
بـــرای دووەم مـــالی دزرا
سۆراغ نەکـــراو ئـاوو ئـاو چـوو
سێیەمیـــان دەغلـەکەی ســـووتا
خۆیـــان مـاتکـــرد لـــە باروبوو
برا گچکەش خـــەم دڵی خوارد
لای نەمـــا هێـــزو ڕەنگو ڕوو
بـــەڵام کـاتێ زانیـــان دوژمن
هـــات داگیرکات هەردو خــانوو
هـــەر چواربـــرا ئاشـــتبوونەوە
داگـیرکەریـــان هـــەلبڕی زوو
بـــزەی یـــەکبوونو ســـەرکەوتن
کەوتە ســـەرلێوانی هـــەموو . . . .

## دەکۆچ مەکە و هەوارگەی مەر بەجێ مێڵە

مەجید هێرش
1977 / 11 / 20

هۆ کیژۆڵە ئەزیەت بارە
خەمبارەکە
بۆ کوێ دەچی ؟!
بۆ سەری خۆت ، هەڵگرتوە ؟!!
وەرە ..وەرە ..
وەرە .. مەڕۆ ..
بەو ناوەختە ، خۆتو پرچە قرژنەکەت
بۆ کوێ دەچی ؟
وەرە .. مەڕۆ ـ
وەرە ئەتۆش
وەکو هەموو ، ئەو زامە سەر بە ژانانەی
دوو هەزارو ، چەند سەد ساڵە .
هەڵگرتوون
وەرە ئەتۆش
وەکو هەموو ، ئەو خەمە سەر ، ژەهراویانەی
دوو هەزارو ، چەند سەد ساڵە .
هەڵگرتوون
لە سوچێکی نێو دڵدا ..
پاڵدەرە پاڵ ..
ئەو زامە گەرد لێکەوتوانە .
پاڵدەرە پاڵ ..
ئەو خەمە سەر ، ژەهراویانە ..

***

هۆ کیژۆڵە ئەزیەت بارە ..
خەمبارەکە !
خۆتو سەرە بە هەشەکەت
بۆ کوێ دەچی ؟
وەرە .. مەڕۆ
دڵنیابە ....
لە لانەی من گەرمترت
دەست ناکەوێ .
دڵنیابە ..
لە دڵی من ، قەت پاکترت
دەست ناکەوێ ..
وەرە .. وەرە ....
وەرە .. مەڕۆ ..!
دە ڕاوەستە !!
لە ئاسمانی ، پڕ بارانی
هێوای مندا جێی خۆت بگرە ..
لە بەهاری ، پڕ سەوزایی
ئاخی مندا ..
ئارام بگرە ..
لە چاوانی ، پڕ لە تۆڵەی
توورەی مندا ..
سەنگەر بگرە ..

# کەی ئەگەینە دوا بەندەری خۆشەویستی

فەرمیوون عەبدول بەرزنجی
سلێمانی - پاییزی ١٩٨٢

\- ١ -

بۆچی هێشتت خۆشم بوێی ؟..
کە ئەتزانی
ڕۆژێ دێ جێم دێڵی ئەڕۆی ..
پەنا بۆ کام شیعر ببەم
هەموو ئەندێشەی دووری تۆ
بگرێتە خۆی ؟..
لە کام خەونا گرێ کوێرەی
ئەم حەزە بێ سەرو شوێنە بکەمەوە ..
کام ڕێگا جێ کۆچی تۆیە
تا شوێن کاروانێ بکەوم
یاخود ئەمکەیەنێ بەتۆ
یا تەنیا ناکەڕێمەوە ..

\- ٢ -

لەو ڕۆژەوە لە تیشکی چاوت بێ بەشم
ووشکە سەرچاوەی گریان و هۆنراوەشم
بە چاوی تۆ وەکو جاران بێ ناکەنم
بە خۆڕایی ئەڕوا ڕۆژانی تەمەنم
بێ واتایە ئەوەی ئەیڵێم و ئەینووسم
بۆ تۆ نەبێ بۆکێ بنووسێ بینووسم
کە تۆی چرای شەوانی پڕ لە مەترسیم
کە تۆی تێشووی گیانی هێجگار ماندوو برسیم
کە تۆ ڕۆشتی ، گەنجیم ڕۆیی ، بۆ ڕۆیشتی ؟.
ئەو هیوایەی لە دڵا بوو دووری کوشتی

\- ٣ -

تا ئێستاش چاوی هۆنراوەم
هۆن هۆن فرمێسکی لێ ئەتکێ ..
نەتئەزانی دڵی شاعیر
هێندە ناسکە زوو ئەشکێ ؟..

\- ٤ -

تۆ هەموو شەوێ بەڕووتی
لەبەر پەنجەرەی شیعرێکما
سەما ئەکەی
تریفەی مانگ
ئەبێتە کراسی بەرت
ئەستێرەکان ئەبن بە قرینەی سەرت
چاوم لێیە نەرمە بایەك
هێدی .. هێدی
بە شەپۆلی قژی خاوت یاری ئەکا ..
نمی شەونم
بەسەر چرای گۆنانتەوە دائەگیرسێ
نم .. نم جێگای ماچەکانم
بە ڕووتەوە دیاری ئەکا ..

---

\- ١ -

کە چاوەکانی تۆم بینی ،
هێندە شەیدای سەوزایی بووم ،
لە ماڵەوە باخێکی بچکۆلەم داچاند
چنارم چاند ،
قەزوان و سپیندارم چاند ،
بەڵام کاتێ کە سەوز بوون
هەموو تێکڕا ،
لە بەراوردا تێشکان .
بۆیە بەم پایزە وەختە
نیازم وایە ،
شەتڵی سەوزی چاوەکانت ،
بگوێزمەوە باخەکەمان .

\- ٢ -

پایز لایدا باخەکەمان ،
باڵندەکانی کۆچیان کرد ،
دارەکانی زەرد هەڵگەڕان
کەچی زەیتوون ،
هەروا بە سەوزی ماوەتەوە
بۆیە چەقۆێکی دڵدار ،
باسی ئەشقی باخەوانی
لێ هەڵکەنان .

ئازاد دلزار

# بووهاری تازە

■ بورهان جاهید ■

وەتەن شیرینە داخی لە گیانم
چی بکەم قووربانی بەس شیعرەکانم؟
بریا گەنجێ‌بام بەدەستەو قامەت
کەڵلەم دانابا لەناو مەیدانم
بووهاری نووسان ئەوا دێتەوە
بەخێر بێتەوە لەسەر چاوانم
جۆگەلەو کانی کە شەپۆل ئەدەن
بەفر ئەتوێتەوە لە شاخەکانم

خەریکە چیمەن خۆی برازێنێت
بۆ بولبولانی مەستو خەندانم
خەریکە نێرگز سەری دەربخا
لە لووتکەی شاخی بلندەکانم
خەریکە برا برای بناسێت
باوەشم لێدا بگرێ دەستانم
بەس کینو قەهرو غەزەب بپرژێ
لەسەر ئەو خاکەی پاکو جووانم
غەیرە دەمێکە خەریکە تێکدات

شانو شەوکەتو سامانەکانم
کورد لەگەڵ عەرەب هەردەم برایە
هەروای فەرمووە باپیرکانم
ئێمە نەتەوەی صلاح‌الدینین
یاری یارانی جاری جارانم
جووتیار مەهێڵە زەویم خەسارێ
شووان گورگ نەخوا بزنو مەڕانم
فەرمانبەر کارت پاکو پووختەبێ
دختۆر دەرمانکە نەخۆشەکانم
کرێکار پەلە مەکەن بۆ مووچە
ڕاست دوورووستبکەن دیوارەکانم
کڕیار فرۆشیار صاغبن لەگەڵ‌یەک
بۆ تەمەع مەبەن مێشکی سەرانم
بژی کۆمەلی ئەمینداریتی
ڕەوشەنبیریو زانیارانم
حەقیقەت گەلێ سەعیو هەوڵ‌ئەدەن
بۆ بلاوبوونی ووتارەکانم
منیش ووتاری زۆر چاك دائەنێم
بۆ ڕۆلەکانم چوونکە ( بوورهانم )

# دەمێکی دەی..!

فوئاد جەلی زادە
1983/2/6

دەمێکی دەی لەبەر دەمما بڕۆو بێرە کوڵی عەمرم
بەخوڕپەی دڵ ئیقاعی ئەم ڕەمڕەموتەت لەبۆ دەگرم

برۆ ، بێرە هەتا دنیای لەشی پڕ تلم وڕەنگوبۆ
بجولێنێ ڕەگو ڕیشەی دەماری لاوی تامەزرۆ

هەتا گیانی سەرنج بفڕێ بە عەشقی لاولو گەردن
هەتا تێنویتی حەز بشکێ بەسینگی گۆشتنو خڕبن

برۆ ، ئیدی لەشی نەرمت نەخەیتە بلومشی ماشێن
گونامە ، چونکە تۆو ئاسن ، مەحاڵە ، گەرە پێك ناشێن

ئەگەر هەنگاوی سەرعەرزت بەلاوە ئەستەمو ننگە ؟
ئەگەر پڕتاوی گەردو تۆز دەمێنێ لەم قەدی شەنگە ؟

گەلێ ساگارە لام گیانە لەسەر ئەم ڕێگەوو بانە
لە جەرگو دڵ بەووردی فەرشت بۆبچنم بەلام گیانە :
دەترسم تۆ ڕەتێ بەیگەر وەکوو بەرد گەوتە زێرپێ ، دڵ
دەترسم مەیلێ بۆ لاری بکا بالات ، نەمامی گوڵ

# زەوی..

سەلام مەنمی

(۱)

مام برزو پیاوێکی بەسالاچووو مێشك و شك بوو ، هەمیشە لە ناو ڕوباری ئەفسانەدا بۆقمەلەی ئەکرد . ژنێك‌و کوڕێکی هەبوو، ژنەکەی ناوی ئەفتاو بوو، کوڕەکەیش کاکە لاو لە مالی دنیادا چەند سەرێك ڕەشەولاخ‌و پارچەیەك زەوی هەبوو .. ژن‌و کوڕەکەی خزمەتی ولاخەکانیان ئەکرد .. زەویەکەیش پشت گوێ خرابوو، دڕك‌و دال وەك چنگنە سەریان تێ کرد بوو ، مشك‌و مار شاریان تیا کردبوو ، کابرای مشکی زلی دراوسێ زەویان هەر وەرزەی چەند هێلێك، ئەچووە ناو سکی زەویەکەیانەوە، زەویەکەیش باری گران بوو زوو خاوی هەل ئەڕشت‌و ئەتوت کۆستی کەوتووەو دادو بێدادی دەر ئەبڕی : (ئەوەتەی دوو گوێم ڕواوە ئەگبەتی وا ئامبازم نەبووە، بێ خاوەنم، خاوەنەکەم ئەلێی سای مەل لێی داوە یەکێ نیە وەرتەو بەرەم تیا بکات، یاخود پابێلێکم تیابوەشێنێ ، هەر چەند زەویەکانی دراوسێم بە سەوزی ئەبینم، ئەوەندەی تر کۆستم ئەکەوێ‌و چاوەکانم موقرایان دادێ ، وەك مەڕی گێژ بە دەوری خۆما ئەخولێمەوە ، نازانم من هەتاکەی بە نەزۆکی ئەمێنمەوەو پانتایی‌و درێژ یم چەواشە ئەبن ..؟! ئەوەتا مشك‌و ماری زەویەکانی‌تر بەرەو من وەك کوللە زەرد دێن‌و کۆچ ئەکەن‌و ئەلێن :ـ ئەمەیە چێکەی ئیمە، بەئارەزووی خۆمان زاوو زێی تیا ئەکەین ..)

(۲)

شەوێك لە خەویا کابرایەکی ڕیش سپی دار عاسا بە دەست، لەزەویەکەیا بوو، هەر دوو دەستی ماچ کردو لە دلی خۆیەوە وتی : (بێ‌و نەبێ ئەمە فریشتەیە، ئەو جێگەیەش خزنە ، هیچ نەبێ لەو دنیا چاوی ئێمەوە ئەبێ ) .

بەیانی لە خەو ڕاپەڕی خۆی پێنەگیرا بۆ ناو زەویەکەی چوو: (ئەوە جێگەکەیەتی)

بەردی کۆ کردەوە، هەلی چنی‌و ناوی ناقسن، هاتەوە چەند پەڕۆیەکی سوورو زەردی ئامادە کردو پێوەی چەسپ کردن‌و ناوی نان بەیداخ‌و لە بنیا پرخەی خەوی ئەهات ، چاوەڕێ بوو هیچ نەبێ جارێکی تر لە خەوا ببینێ ، خەلکی گوندەکە سەریان لەم کارە سوڕما لێیان پرس :

**ـ مام برزو ئەمە چیە..؟!**

**ـ ئەوە جێگەی فریشتەیە، دەرمانی نەخۆشە، ئەم شەو لە خەودا دیم..**

هەندێ ساویلکە بڕوایان پێ کردو وتیان !

ـ پیاوی خوایە قسەی وا لە گۆترە ناکات، پیرێژنەکان بۆ نەخۆشی ئەچوونە سەری، جگە لەوەیش پارچەیان لە بەیداخەکان ئەکردەوەو ئەیان بەست بە لۆرە لەپ ودۆژەنگ سێپای مەشکەکانیانەوە.) تەنانەت دۆلەقێن‌و پشکەکانیشیان دەر نە ئەکردو ئەیان وت : (بەرە مەشکەکانمان زیاد ئەکەن، کەرە دانەکانمان زوو پڕ ئەبن ..)

کابرای مشکی زلیش بە تەوسەوەپێی وت،

ـ هەر لە ئێستاوە نوورت لێ ئەبارێ‌و بڕوا بکە خۆت لە فریشتە ئەکەیت، ئەم بیابانەت ڕوون کردۆتەوە ، منیش لەمەولا خێری بۆ ئەکەم بەیداخی ڕەنگاو ڕەنگی بۆئەکرم ..

(٣)

زەویيەكەیش هەناسەیەكی هەڵكێشاو وتی : (ئینجا نۆرەی خەوبینینمانە، هەر ئەمەم كەم بوو، ئەمەیە ئەڵێن ــ: مەیموون لە خۆیانەبوو ئاوڵەیشی دەركرد .. )

(٤)

كاكەلاو لاوێكی پانزە تا شانزە ساڵ بوو، هەر چەند بە تەمەن منداڵ بوو، بەڵام هۆشیارو عاقڵ بوو، چاوی كردەوە : (ئەم كابرایە شێت بووە .. یەكجاری بووە بەزیەوانو شۆرباي پیرێژن هەڵ ئەقورێنێ .. مێشكی خەڵكی ساویلكەی تێكداوە خەڵك خوا خوایانە پارچەیەك زەویان هەبێ بۆ ئەوەی ژیانی پێ مسۆگەر بكەن ، كە چی ئەم تازە خەو ئەبینێو دمردو بەڵا بڵاو ئەكاتەوە، ئێمە هەژاری دەستی ئەوین، باران لە زەوی خەڵكا فەرئەرژنێ بەڵام لە زەوی ئێمەدا دڕكو داڵو خەوی پووچەڵ ، دایكیشم وەك مەخودە لەبەردەستیا هەڵ ئەسورێو ئاگای لە هیچ نیە..)

(٥)

**ـ چاوت لێیە خەڵك چۆن ئەژین..؟**

**ـ كوڕم من هەر لایەكم بۆ ئەگیرێ .**

**ـ تەومزەلیو ئەفسانە هیچ لایەك ناگرنو ڕۆژیان بەرەو ئاوابوون ئەچێ ..**

(٦)

جووتی خستە زەوی، لایەكی بۆ گەنم دانا، لایەكی تری بۆ كشتوكاڵ ، جێی خزنەكەیشی بۆ باخ .. زەوی سەوز بوو، دڕكو داڵ فرێ درانە دەرەوە هەر چەند سەیری خۆی ئەكرد بست بست باڵای ئەكردو ئەی وت : (ئەمە منم بەرگم گۆڕیوەو گوێم بۆ خوڕەی ئاوو دەنگی باڵندە شل كردوە..؟! ئەمە منم زیكەی مشكو فیشكەی مار نابیستم ..؟؟!..)

ناوچەوانی كاكەلاوی ماچ كردو پێی وت :

ـ چەندەها ساڵە بە دەست ئەم گەمژەوە گیرم خواردوە، دڕكو داڵ هەناومیانخانبر كردوە ، ئەگەر بڵێی من سنوورێكی فراوانم هەبوو، ئەو مشكی زلەی بەیداخی بۆ من ئەكرێو لاقرتی بە باوكت ئەكرد ، وەك ژێی كەوان منیهێنابۆوە یەك . قسنە بۆ ریش دوو مەلێكی بە سوێ بوو، لەلا كەلەكەم هاتبوو .. ماوەیەكی تری بە سەرابرۆیشتایە لێی ئەكردم بەشێر پەنجە ئەوجا گەنەخۆر بەرەی هەمیشەیی لەسەر ڕائەخستم ...

قسنەكە گوێی لەو قسانە بوو، ملی قیت كردەوەو لە نێوان كاكەلاوو زەویدا دانیشتو وتی :ــ

ـ من بە خۆڕایی قیت كراومەتەوە، هەر ڕۆژەی پیرێژنێك دێتە سەرمو پارچەیەك لەو پەڕۆشرانە ئەكاتەوە، وا ئەزانن پزیشكن ، ئەگەر من كار بەدەست بوومایەو شتێكم پێ بكرایە لە پێش هەموو شتێكا، لە ملی كابرای مشكی زلم ئەدا.. ئێستایش زۆر بەختیارم جێكەم بۆ باخو نەمام چۆڵ كردوە، چونكە ئەمانە جێگەی بەرژەوەندی مرۆڤن، حەز ئەكەم سەیری ئەو پەپوولە ڕەنگاو ڕەنگانەو ئەو هەنگە زەردانە بكەن، پۆل پۆل میوان داریمان ئەكەن، جارانیشی تفەنگ هاوێژێ لێمانەوە دوور بوون، هەر ئەمانەو هەر پەڕۆ شرەكانو پیرێژنەكان.؟!

(٧)

مشك، مار ، دڕك هاتن بۆ لای مام برزو ، پێیان وت :

ـ بۆچی ئاوت كردە ژێرمان ، وەرە باتەگبیرێ لە كاكەلاو بكەینو جێگەی پێ لەق كەین ..

ـ تۆ لە ناو جۆگەلەیەك ئاودا ئەخنكێیتو دەست بەزیكەزیك ئەكەیت ..

**ـ تۆیش هەر چەند ژارت سەختەو وەزن ئەكەیت بەڵام بەرگەی پابێلی گوخل ناگری ..**

**ـ تۆی دڕكیش نووكەتیژەكانت لەناو ئاودا وەك لۆكەیان لێ دێو كوڵ ئەبن**

**ـ منیش وەك ئەڵێن پیریو سەد عەیب ، جگە لەوانەیش، من ئەو ڕۆژە نەگبەت گرتمی بووم بە هاوڕێی ئێوە ..**

**ـ دەمێكە هاوڕێی ئێمەیت .**

ـ بەڵێ پێ بەپێی ئێوە زیانم لە زەوییەكەمو منداڵەكانم داوە، ئەوەی ڕاستی بێ منو باپیرانم فەروەی تەمەڵیمان لە بەر كردبوو ، بەڵام كاكەلاو تۆزی فەروەكەی تەكانو نەخشەی بۆ دوا ڕۆژ كێشاوە .

# ئەو کورەو خرایە

رەزا سەید گوڵ بەرزنجی

لەبەر تیشکی گلۆپەداو لە دووری چەند هەنگاویکەوە ئارەقەی نێوچەوانی دەبریقایەوە، نزیک بە نزیکیشەوە چەند دڵۆپێك ئارەقە بەچڕی بۆ ناوچەوانی دەبینرا دەتوت رووی ئامانێکەو خوناوی لەسەر کەوتی‌یە، ئارەقە بە پشت هەردوو برۆکانی‌یەوە بە نیمچە لوفەبێك ریچکەی بۆ خوارەوە کردبوو .

دانیشت .. رەنگی هەڵبزرکابوو، پشی سواربوو.. چاوێکی لەخەلکەکەدا گێرا .. بە پەنجە کەلەی دڵۆپە ئارەقەکانی ئەم لاو ئەو لای نێوچەوانی وردو خاش کرد، رووی لە یەکێکیان کردو وتی :

- ئەرێ فلان دیارنی‌یە .
- بەئیشێکی سەر پێی رۆیشتووە ئێستا دەگەرێتەوە .
- تەلەفۆنم بۆ کرد ... مەبەستم ئەوەیە تەلەفۆنی بۆ کردووم .. دەربارەی .. ژ ...؛ .

نێوچەوانە نمچە تەڕاوی‌یەکەی بە دەستەسڕ وشك کردەوە .

- نازانم چ ئیشی هەیە .

ئەمەی وتو نقوومی ناوەخۆی بوو :

« - تۆبڵێی ئەوەی لە تەلەفۆنەکەدا وتی راست بێ !؟ خۆ ئەگەر وابێ خوا رۆژی تەواو تەکردبێ تەواوی دەکەم .. بەلام زۆر سەیرە من لەگەڵ خۆمرا بردمو دواییش تا نزیكماڵەوە رەتم کردەوە .. یانی چی .. ! تۆ بڵێی .. نا .. نا شتی وا نەبووەو نابێ .. ها .. بۆ .. نا .

2— کە دیقەتی دایەوە خەڵکەکە سەیری یەکتریان دەکرد دڵی داخرپا :

« - بڵێی ئەمانەش شتێکیان بیستبێ .. ئەم سەیرکردنەیان لەچی‌یە ! دوور نی‌یە بەمانەشی نەوتبێ .

دیسان رووی دەمی کردەوە ئەوەکەی تەنیشتی‌و وتی :

- دەبێ زۆر دوا بکەوێ ؟ باشە کەڕوویی هیچی نەوت چ قسەیێکی بۆ جێ نەهێشتم .
- نەخێر .

بێ دەنگ بوەوە، درەچاوێکی ئەم‌و ئەوی کرد .. خۆی وا

نیشاندا کە ئاگای لەمان نەماوە .. کەچی هەمووکیانیشی کردبووە گوێچکە بۆ بیستنی چرپەیەك . تا مێشکی وەکو ئامێری بروسکە وەرگرتن کەوتە جووڵەو قسەیێکی ژنەکەی لە مێشکیدا زرنگایەوە .

« پیاوێژگە .. دەزانی خەڵك بەخراپە ناومان دێنن .. بەخراپە .. ناومان .. وێنن .. ناو .. دێ .. نن .

دەتوت گومانی لەوە بوو کە زرنگانەوەی وشەکان گەیشتۆتە دەوروپشتی بۆیە سەیرێکی کردنەوە . دیسان لەگەڵ خۆیدا نقووم بووەوە :

« ـ ها .. خۆمن ئەو رۆژە ئەم قسەیەم بەهەند هەڵ نەگرت .. تۆ بڵێی تەلەفۆنەکە لەگەڵ ئەم قسەیەدا لە شوێنێك تێك نەکەنەوە . بەڵام ناچێتە ئەقڵەوە کەلەم قسانەیدا مەبەستی خۆی بووبێ .. باشە، ژنێ قسەی لێ بوەشێتەوە خۆشی هەستێ قسەکان بەمێردی بکەیەنێ ..! ناچێتە ئەقڵەوە .. بەڵام ئەم ماستە بێ موو نییە .

لەم تێکەو لێکەیەدا بوو فلانەکەکاتەوەو لەتەکییەوە دانیشت .

« ـ بڵێی هەر بۆ ئەم قسەیە نەچوو بێتە دەرەوە .
ـ ئەرێ .. فلانی نازانم لە تەلەفۆنەکەدا مەبەستت چیبوو ؟! فلان هەڵسا، ئەمیش بەدوایەوە .. دوورکەوتنەوە .. ئینجا پێی وت :
ـ وەاللە .. حەز ناکەم خەڵك بەخراپە ناوت بێنن .
ـ ها ! .

هەمیسان قسەی ژنەکەی لە مێشکیدا زرنگایەوە :

« ـ پیاوێژگە خەڵك بەخراپە ناومان دێنن .
ـ وتت خراپە ؟!.
ـ ئا .. بەڵێ .
ـ چۆن ..؟! خراپەی چی ؟
ـ کاکە ئادەم هەر خەڵەتاوە .
ـ تێ ناگەم .
ـ ژن هەیە پیاوێ دەگەیەنێ و ژنیش هەیە پیاو دەڕوخێنێ .
ـ ژن ..! کام ژنە ؟
ـ ئەوەی نزیکی کوورە بێت پرووشکی بۆ دەچێت .
ژن .. خراپە .. کورە ، بووە حەزورە تێ ی ناگەم .
ـ چاك بزانە ئەگەر خۆشم نەویستبای پێم نەدەوتی .. حەزیش ناکەم خەڵك ناوتان بێنن .

ددانەکانی قرساند .. ئێسکی پەنا گوێی کەوتە جووڵە .. خوێن هورژمی بۆ دەمو چاوی برد ، رەنگی دەمو چاوی بەچەند رەنگێك گۆڕا .. بەری چاوی لێڵ بوو .. بە توورەییێکەوە وتی :

ـ پێم ناڵێی چیت لە ژنەکەم دیوە ..؟!! پێم ناڵێی ؟
استغفرالله .. استغفرالله .. کێ ناوی ژنی تۆی هێناوە ..! کێ باسی کردوو ..
ـ ئەی تەلەفۆنەکەی بەیانی ؟
ـ بوتێ ناگەی من لە تەلەفۆنەکەدا چیم وت ، ماڵەکەی تەنیشتتان .
ـ ئیە ..!
ـ ئەوەی تۆ خانووەکەت بۆ دۆزینەوەو هێناتە تەنیشت ماڵەکەتەوە.. ژنەکەی سووکە .. خەڵك هامو شۆیان دەکەن . باسیان دەکەن پرووشك ئیوە دەگرێتەوە، بیستوومە خۆت و ژنەکەت چوونەتە ماڵیان .

ـ ئا .. ئا .. ئەمممم .. ئێستا تێ گەیشتم .

ماسولکەکانی خاوبوونەوە .. شۆرشی دەروونی وامرکا یەوە .
یەك دوو هەناسەی خۆنەکرد لە دەروونیدا دەرپەڕییە دەرەوە، بێ دەنگ بووەوە .
11— پیاوێژگە خەڵك بەخراپە ناومان دێنن .

ـ تێ گەیشتم .
رووی لە کابرا کردەوەو وتی :
ـ دەزانی بەم شتەم نەزانیوە .. شەو دێمەو شەو دێمەوە .. فلانی ملت ئاوا من خراپی بۆ چووبووم ، هەر باش بوو .. ئەگینا ... .

# عەزیای ناو سەندووقەکە

**نووسینی : م . جین کرایك**
**وەرگێرانی لە ئینگلیزیەوە : ماهر وسمان خۆشناو**

**«چیرۆکێکی یەکجار کورتی کوڕێکی یەکجار بچووك کە خاوەنی نهێنییەکی یەکجار نهێنی بوو »**

ئێوارەیەکی سێ‌شـــەممـــە، دایکی مـــاثیۆ کاتژمێرێکی ڕەنگـداری کـــڕی‌ـ گەیشتـــە مـــاڵەوەو کاتژمێرەکـــەی ناو ســەندووقەکەی دەرهێناو بەدیوارێکەوە هەڵی واسی . ماثێوـ کوڕە بچکۆلەکەی‌ـداوای لە دایکی کرد سەندووقە بەتاڵەکەی بداتێ . دایکە دڵی نەشکاندو لێی پرسی :

**ـ ئایا ئەتەوێ چی لێ بکەی.**

**ـ شتێك‌ دایەگیان ..**

ڕۆژی چوارشەممـــە دایکە بینی ماثیۆ سەندووقەکەی داخـــستوەو گۆشـەکانی بەجەوی‌و کەتیرە پێکەوە نووســاندوە . ئەمەی سەرنجی دایکی ڕاکێشا ئەوە بوو ماثیۆ بۆ هەر شوێنێ دەچوو یاخو هەر شتێکی دەکرد سەندووقەکەی لەگەڵ خۆی دەبرد تەنانەت کاتی خەوتنیش لای سەرینەکەی خۆی دای دەنا . دایکی لێی پرسی .

**ـ کوڕی شیرینم .. تۆ پێم ناڵێی چیت خستۆتە نێو ئەو سەندووقە؟**

**ـ دایەگیان ، هێلکە عەزیای تیایە .**

**ـ بەراستیتە کوڕم!**
**بەڵێ دایە .**

ئەمەی ووت‌و کەوتە خەوێکی شیرین .
ڕۆژی پێنج شەممە، کاتی نان خواردنی بەیانی ـ باوکی لێی پرسی :

ـ ڕۆڵە هێلکە عەزیاکە دەبێ ئیمرۆ چی بکا؟

ـ باوکە گیان، هێلکە چۆن دەتوانێ شتێ بکا! ئەو شتەی لەناو هێلکەکەدایە چاوەڕوانی ئەوە دەکا کاتی خۆی بێ‌و بێتە دەرێ .

نیوەڕۆ، کاتێ کەبرا گەورەکەی لە قوتابخانە گەرایەوە لێی پرسی :

ـ ماثیو ـ بیستوومە هێلکە عەزیایەکت هەیە لە نـــــاو سەندووقەکەتدا دات ناوە!

خوشکەکەی لێی پرسی :

دەپێمـــان بڵێ بـــزانین ئەو هێلکەیە چۆن گەیشتە نێو سەندووقەکەت؟

ماثیۆ وەڵامی دانەوەو ووتی :

ـ دایکە عەزیاکە خۆی هێلکەکەی لە ناو ئەم سەندووقەدا دانا پێش ئەوەی!!!

براکەی پرسی :

ـ پێش ئەوەی چی ماثیۆ؟ .. مەبەستت چیە؟

ـ پێش ئەوەی بە جەوی‌و کەتیرە سەندووقەکە دابخەم .

ئینجـــا دەستی دایە ســـەندووقەکەو ژوورەکەی خۆی جێ هێشت . بۆ ئێوارە باوکی ویستی بزانێ چۆن هەوا دەچێتە نێو سەندووقەکە کە لە هەر شەش لاوە بەسترا بێ ...

**ـ بابە گیان ئێستـــا هەوای پێویست نیە؟ کەی لە نێو هێلکەکە هاتە دەرێ ئەو کات هەوای پێویست دەبێ . ئەم جارەیان ـ بێ ئەوەی گاڵتەی بەقسەکانی بێ‌ـ خوشکەکەی پێی ووت :**

**ـ ڕاست دەکەی .. بەڵام چۆن دەزانی لە هێلکە دێتە دەرێ‌و کەی؟**

**ـ پێویست ناکا من بزانم .. فەرخـە عەزیـاکە خۆی دەیزانێ ...**

ڕۆژی هـەینی کـە مـاثیۆ بۆ نـان خـواردن هـاتو سـەندووقەکەی لەسـەر مێزەکە دانـا. کە دایكو باوكو براو خوشکانی ماثیۆ بینیان کونێکی بچکۆلە لە یەکێك لە گۆشـەکانی سـەندووقەکە کراوەتەوە . کەس پرسیاری لێ نەکرد ماثیۆ لە خۆیە هەڵی دایەو ووتی :

ــ دوێنێ شـەو دردەنگ فەرخە عەزیاکە لە هێلکەکە هاتە دەرێ. .. نێرەش بوو ..

دایکی پرسی :

ــ جا چۆنت زانی؟ وەك بڵێی گوێت لێ بووە؟
ــ نەخێر ... زۆر بەهێمنی هاتە دەرەوە. بەڵام من زانیم وەختی خۆیەتی بۆیە ئەم کونەم بۆی لە سـەندووقەکە کردەوە .
خوشکەکەی ووتی :

ــ کەواتە ئێسـتا دەتـوانی لە کونەکەوە سـەیری بکەی تاکو بزانی چۆنە؟

ــ دەزانم چۆنە بێ ئەوەی سـەیری بکەم . هەر لە فەرخە عەزیا دەکا .. بەڵام ئەو حـەز ناکا کەس سـەیری بکا .. دەیەوێ بەتەنیا بێو کەس بێزاری نەکا ..! ڕۆژی شەممە. ئێوارەیەکی دردەنگ براکەی لێی پرسی :

**ـ ئەرێ ماثیۆ هیچ سەیرت نەکردوە؟**

**ـ بەڵێ .**

**ـ چۆنە؟**

**ــ لەبەر ئەوەی کونەکە گەلێ بچوكو نێو سەندووقەکەیش تاریکە بۆیە وەکو من بزانم ڕەنگی پەمەییەو دوو باڵەکەیشی نەرمو زێڕینن .**

**ــ باشە بۆ کونەکە گەورە ناکەی تاکو بەجوانی سەیری بکەی؟**

**ــ نەخێر پێویستە ژوورەکەی تاریك بێت ..**

دایکی ووتی :

ماثیۆ. کەواتە چۆن دەزانی وایە؟ .

ــ دایە گیان ئەوەی ڕاستی بێت عـەزیاکان هەموویان وان . ڕۆژی یەکشـەممە ماثیۆ بەخوشکەکەی ووت :

ــ ناوم لێنا «ئێمیلین» .
ــ ئەم ناوە ناوی کچەو کەچی تۆ ئەڵێی فەرخە عەزیاکە نێرە!
ــ بەڵێ ڕاست دەکەی بـەڵام دایکەکەی لە (چین)ەوە هاتووەو خەڵکی ئەوێشەو عەزیا نێرەکانی وڵاتی چینیش حەز دەکەن ناوی کچیان لێ بنێن .
ــ ئایا دەتوانم سـەیری بکەم؟
ــ نەخێر .. ئێمیلین زۆر شەرمنە بەدووریشی مەزانـە زویر بێت .
ــ ئەی بۆ شـەرم لەتۆ ناکا؟
ــ چونکە من دەناسێ .

ڕۆژی دووشـەممە باوکی لێی پرسی :

ــ ڕۆڵە تۆ چ خواردنێکی دەدەیتێ ؟

ــ بابە گیان عەزیا لە کاتی بچووکی پێویـستی بە خواردن نیە تا باڵەکانی بەهێز دەبن .

کە ڕۆژی سێشـەممـە داهـاتەوە، ماثیۆ هاتە ژووری خواردن بەڵام سـەندووقەکەی پێ نەبوو . کەسیش پر سـیاری لێ نەکردو ئەویش هیچی نەووت .

شـەو کە دایکی چوو شـوێنی خەوتنی بۆ ڕێك بکـات سـەیری کرد مـاثیۆ یاری لەگـەل کەلا شووشـەکانی دەکاو سـەندووقەکەی لەسـەر زەوی کەوتودو سـەرەکەی دانەخرابودو لێی پرسی [1]

ــ دەڵێی فەرخە عەزیاکەت ڕۆیشـتووە؟

ماثیۆ خەریکی کەلا شووشـەکان بوو لە ناو جـانتاکەی دەری دەهێنان، وەڵامی دایەوەو ووتی :

ــ دوێنێ شـەو، ئێمیلین زۆر گەورە بوو .. باڵەکانی بەهێز بوونو فڕی .

ــ بۆکوێ؟
ــ بۆلای عەزیا گەورەکان .. ئەم سـەندووقەش بۆئەوە چاکە کەلا شووشـەکانی تێ کەم. وانیە دایە گیان؟ ...

**پەراوێز**
١ ــ عەزیـا : ئەژدیهـا .
**سەرچاوە :**

Readers Digest July 1962.

# دایکێک

چیرۆکی ژنە نووسەری

ئیتالی

ناتالیا گنزبێرگ

○

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە

شێرزاد حسن

○

دایکیان ئافرەتێکی وردیلەو باریکو لاوازە .. هەردوو شانیشی کەمێ خڕو کەوانەیین .. بەردەوام کراسێکی شینو بلووزێکی خوری سووربلو لەبەر دەکا .. قژێکی ڕەشو کورتو لوول .. هەمیشە ڕۆنی لێ ئەبڕێ .. حەزیش دەکا بۆ بێتەوە .. هەموو ڕۆژێکیش برۆیەکانی هەڵدەگرێ .. هەردوو برۆی دەبن بە دوو ملسی ڕەشو بە تەوێڵو لاجانگیدا مەلە دەکەن .. تۆزێکی زەردیش بە ڕووی خۆیدا دەیژێنێ .. هێشتا زۆر گەنجە .. بەڵام لە چ تەمەنێکدایە ؟ ئەوە هیچیان نایزانن .. بەس لەچاو دایکی ئەو منداڵانەی قوتابخانەکەیان : گەلێ گەنجتر دیارە .. سەیریان پێ دەهات کە ئەو دایکانە ئەوەندە پیرو زرپەو قەڵەوە .

دایکیان جگەرەیەکی زۆر دەکێشێ .. پەنجەکانی بە دووکەڵ پیسو زەردن .. هەتا لە نێو پێخەفەکەشیدا .. بەر لەوەی بنوێ .. هەر جگەرە دەکێشێ .. هەرسێکیان بەیەک لێفەی زەردو لەسەر یەك قەرەوێڵەی دووکەسی بەیەکەوە دەنووستن .. دایکیان دەکەوتە سەرپەڕی لای دەرگاکە .. لەسەر مێزە نزیکەکەش لامپایەك دانراوە .. تیشکێکی کز دەبەخشێ .. لامپاکەش بە قوماشێکی سوور تەنراوە .. شەوانە دایکیان بۆ خوێندنەوەو جگەرەکێشان دادەنیشێو خەوی دەگرخێنێ .. هەندێ جاریش زۆر درەنگ دێتەوە .. منداڵەکانیش لەخەو وەئاگا دێنو لێی دەپرسن .. ئاخۆ تا ئێستە لە کوێ بووە : ئەویش هەمیشە هەر ئەم وەڵامانەی بەسەر دەمەوە بوون :

« له سینه‌ما بووم ! »

یان ..

« له‌گه‌ڵ ئافره‌تێکی هاوڕێما بووم .. »

به‌ڵام ئه‌م ئافره‌ته کێ‌یه .. نه‌یانده‌زانی .. چونکه قه‌ت ژنێك سه‌ری به ماڵه‌که‌یان دانه‌کرتووه‌و عه‌ودالێ دیده‌نی دایکیان بێ .. پاشان دایکیان پێ‌ی ده‌وتن : پێوسته ڕوو وه‌ربکێڕن تا جله‌کانی دابکه‌نێ ..خشه‌ی داکه‌ندنی کراسه‌که‌یان ده‌بیت .. سێبه‌ره‌که‌ش به‌سه‌ر دیواره‌که‌وه سه‌مای ده‌کرد .. له ته‌ك هه‌ردوو کوڕه‌که‌یه‌وه ده‌خزایه

ده‌خزایه نێو نوێنه‌که .. له‌شێکی لاوازو باریکی نێو کراسێکی شه‌وی ئاوریشمین‌و سارد .. ئه‌وانیش لێ‌ی وه‌دوور ده‌که‌وتنه‌وه .. چونکه هه‌رده‌م دادو بێدادی بوو که بۆ لێ‌ی نزیك ده‌که‌ونه‌وه .. پرته‌و بۆڵه‌ی نه‌ده‌بڕایه‌وه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی که دوای خه‌وتنیان پێ‌له‌قه‌ی ئه‌وانی به‌رده‌که‌وێ .. هه‌ندێ جاریش بۆ ئه‌وه‌ی مناڵه‌کان خه‌ویان لێ بکه‌وێ .. لامپاکه‌ی ده‌کوژانده‌وه .. دوایی بۆ خۆی به‌ته‌نیا له نێو بێده‌نگی‌و تاریکیدا دووکه‌ڵێ جگه‌ره‌ی هه‌ڵده‌مژی .

دایکیان ئافره‌تێکی به پله‌و پایه‌دار نی‌یه ..به‌پێچه‌وانه‌ی داپیره‌و باپیره‌و پوره ـ کلێمێنتینا ـ یان که ناوناوه به‌سه‌ردان له لادێ‌وه ده‌هات‌و که‌سته‌نه‌و گه‌نمه‌شامی بۆ ده‌هێنان .. ئه‌وان هه‌ر سێکیان سه‌نگین‌و به‌نگین‌و شت له‌ده‌ست‌هاتوون ..

« دیۆمیرا » ی خزمه‌تکاریش شته .. « کیوڤانی » : کوڵهه‌ڵکرو وه‌ره‌م‌داریش خاوه‌ن ناوونیشانی خۆیه‌تی‌و ده‌توانێ کورسی جوان له دارحه‌یزه‌ران دروست بکا ..

هه‌موویان له‌چاوی ئه‌و دوو برایه که‌سانی به‌رزو به‌ده‌سته‌ڵات‌و پایه‌و پله‌ن .. ئه‌وان مرۆڤی ئه‌وه‌نده به‌هێزو توانان که جێ‌ی باوه‌ڕو متمانه‌بن .. ده‌توانن بڵێن « نا » .. خۆ ده‌شتوانن بڵێن « نا » .. ده‌ست بۆ هه‌ر شتێ به‌رن .. لێ‌ی شاره‌زاو پسپۆڕن .. هه‌میشه هۆشمه‌ندو به وره‌و وزه‌ن .. که‌سانێکن ده‌توانن له دزو ڕه‌شه‌باش بتپارێزن .. که‌چی خۆیان گه‌ر دایکه‌ش له ماڵه‌وه بێ هه‌ر ده‌ترسن .. هه‌روه‌ك بڵێ‌ی به ته‌نیا بن .. بۆ « ئا » و « نا » ش قه‌ت ئه‌و ئافره‌ته نه‌ترسه نی‌یه بتوانێ بڵێ : نه‌خێر یاخود به‌ڵێ .. هه‌ر ده‌زانێ به ده‌نگێکی پڕله بێزارییه‌وه به‌سه‌ریاندا بشیرێنێ :

« ئه‌ی هاوار .. ئه‌و هات‌و هاواره ببڕنه‌وه .. خه‌ریکه مێشکم بته‌قێ ! »

**خۆ ئه‌گه‌ریش داوای مۆڵه‌تیان لێ کردبا تا ئه‌و شته بکه‌ن یان ئه‌وی‌تر .... یه‌کسه‌ر ده‌یوت :**

**« له داپیره بپرسن ! »**

یان یه‌که‌مجار پێ‌ی ده‌وتن : نه‌ء .. دوایی : به‌ڵێ .. دیسانه‌وه : نه‌ء .. ئه‌وسا سه‌ری له خۆی ده‌شێواندو ده‌یکرد به گێره‌شێوێن .. هه‌ر جارێکیش که له‌گه‌ڵ دایکیان ده‌چوونه ده‌رێ تووشی دڵه‌کوتێ‌و ڕاڕایی ده‌بوون .. ئارامیان لێ هه‌ڵده‌گیراو ترسیان لێ ده‌نیشت .**چونکه هه‌میشه کووچه‌و کۆڵانه‌کانی لێ ده‌گۆڕاو ڕێ‌ی ون ده‌کرد ..**
دوایش بۆ ده‌ربازبوون‌و هاتنه‌وه سه‌ر ڕێ .. ده‌بووایه بکه‌وێته سۆراغ‌و پرسین له پۆلیس .. جگه له‌وه‌ش زۆر به کاڵته‌جاڕی‌و ترس‌و له‌رزه‌وه بۆ شت کڕین هه‌ڵیده‌کوتایه سه‌ر دوکانه‌کان .. جاریش نه‌بوو له دوکانێکا شت له یاد نه‌کاو به‌جێ‌ی نه‌هێڵێ .. جارێ ده‌ستکێش .. جارێ جانتا .. یا مل‌پێچه‌که‌ی .. دوایی به‌په‌له ده‌گه‌ڕایه‌وه‌و ده‌که‌وته پشکنین‌و مناڵه‌کانیش له‌وه ته‌ریق ده‌بوونه‌وه ..

**چه‌کمه‌جه‌کانی دایکیان زۆر نالڕێك شپرزه‌و شێواو بوون .. شته‌کانی له‌و نلومدا په‌رت‌و بڵاو ده‌کرده‌وه .. به‌یانیان دیۆمیرا ڕێکی ده‌خسته‌وه .. ئه‌ویش پرته‌و بۆڵه‌ی بوو به ده‌ستییه‌وه .. بگره داپیره‌شی بانگ ده‌کرد تا ئه‌و قیامه‌ته به‌چاوی خۆی ببینی .. دواییش به‌یه‌که‌وه جل‌و به‌رگه‌و گۆره‌وی دراویان هه‌ڵده‌گرته‌وه .. هه‌رچی**

تـوزو خۆڵو پیسی ئـەو نـاوە هـەبـوو .. بـەیـەکـەوە دەیان‌ماڵی .. سـەر لە بەیـانیان دایکـە سەرێکی لە بـازاڕ دەدا : دەگـەڕایـەوەو زەمبیـلە تـەلدارەکـەی تـووڕ هەڵدەدایە سەر مێزە مەڕمەڕییەکەی ناو مووبـەق .. بە پەلەپروزێ دەردەپەڕی‌و سواری پاسکیلەکەی دەبوو .. لەوێشەوە بۆئەو .... ئۆفیسەی کاری تیا دەکرد .. پاشان دیـۆمیرا سـەیری هـەموو شتـەکانی نـاو زەمبیلەکـەی دەکـرد .. یەکـە یـەکـە دەستی لە پـرتقـاڵەکـان دەدا .. گۆشتەکەشی بەسەر دەکردەوە .. دیسانەوە دەکـەوتەوە هاوارو فیغان .. داپیرەی بانگ دەکرد تا ببینێ بەنـاوی گۆشت چ چەرمەچەقەڵتەیەکی کڕیوە .. دوای سەعات دوو دایکە دەگەڕایـەوە .. ئەو کـاتەی هـەموو دەستیـان لە خواردن دەکێشایەوە .. ئەویش خێراخێرا دەکەوتە سەر نان‌خواردن .. تەواوێك ڕۆژنامەکەی لە چاویلکەکەی نزیك دەخستەوە .. دیسانەوە جرتێکی دەکردو خۆی هەڵئەدایە سەر پاسکیلەکـە ... داپیرە خـۆت بگرە هـاتم .. وەختی شێوانیش بۆ تەنها دەقیقەیەك هەردوو کوڕەکەی چاویان پێی دەکەوتەوە .. بەڵام دوای نانی شێوانیش زۆربەی جار لە ماڵەوە خۆی نەدەگرت‌و تێی دەتەقاند .. هەرچی نووسینەوەو دەرزو دەورێکیان هەبووایە .. لە ژووری نـووستنەکـەدا تەواویـان دەکرد .. وێنـەیـەکی گـەورە کراوەی باوکیان لە سەرووی پێخەفەکەوە هەڵواسراوە .. ڕیشێکی ڕەش‌و پڕو درێژ .. سەرێکی ڕووتاوە .. بەخۆو بە چـاویلکەیـەکەوە کـە چوارچێـوەکەی لە ئێسکـە پشتی کیسەڵە .. هەروەها وێنەیەکی دیکەش لەسـەر مێزەکـە دانـراوە .. ئەویش هـەر وێنـەی بـاوکیـانە کـە کوڕە چکۆلانەکەی لە باوەش گرتووە .. کە باوکە مرد ئەوان زۆر ساوا بوون .. هیچ شتێکیان دەربارەی ئەو پیـاوە نایـەتەوە یاد .. بەڵام تا ڕادەیەك لە خەیاڵ‌و بیرەوەری کوڕە گەورەکەدا تارمایی نیوەڕوویەکی زۆرو دوورو بەسەرچوو دەردەکەوت .. هەر لەو گوندەی پورە ـ کلێمنتـا ـ یان : ئـەوسا کـە باوکی خستبـوویە نـاو عەرەبـانەیـەکی سەوزو بچـووك .. بـەنـاو چیمەنەکـەدا پاڵی پێـوە دەنا . زەمـانێ بەسـەچوو .. ڕۆژێ لەسـەر دارە ڕایەڵ کـراوەکانی بن‌میچی خـانووەکـەی پوری هەندێ لەو پارچانەی عەرەبانەکەی دۆزییەوە .. کەلێ دڵی پێ

خۆش بوو کە دەسك‌و ویلەکەی هەر بەتازەیی مـابوونـەوە .. دێتەوە یادی کە باوکی پاڵێ بە عەرەبانەکەوە

دەنـا .. بـەدەم ڕاکـردنـەوە چـۆن ڕیشـە پـان‌و درێژەکەی دەشنایەوە : وەك کەسێ لە فڕین دابێ .. نەرمە هـورشـەیـەکی لێـوە دەهـات‌و دەیبیست .. سەبارەت بەو باوکە هیچی دیکەیان نەدەزانی .. بەڵام

لەو بڕوایەدا بوون کە دەبێ مرۆڤێکی بەهێزو هۆشمەند بووبێ .. بە ویستی خۆیشی توانیویەتی بڵێ : « نەخێر » یاخود « بەڵێ » کاتێ باپیرەو دیۆمیرا لە دایکی کوڕیژگـەکان تـووڕە دەبوون .. داپیرە هەڵدەگەڕایەوەو پێی دەوتن : هەقە ئەوان بـۆی بـە داخلەوەبن .. چـونکـە ئـافـرەتێکی بێبـەخت‌و چارەڕەشە .. هەروەها دەیـوت : ئەگـەر [ یۆگینـۆ ـ باوکی کوڕیژگەکان ] وا زوو نەمردبایە ..

ئەم ئافرەتە وای لێ بەسەر نەدەهات‌و ژنێکی دیکەو زۆر جیای لێ دەردەچوو .. کەچی ئەم بێیە غباڵە بەم جـوانی‌و جحێڵی‌یـە مێردەکەی لە دەست ڕۆیشت .

ماوەیەك باس‌وخواسی دایکی بابیان لە گۆڕێ هەبوو .. قەتیش ئەو پیرەژنەیان نەدی بوو .. چونکە لە فەرەنسا دەژیا .. بەس نامەو دیارییەکانی کرستمسی بۆ دەناردن : پاشان ئەویش پیری هێزی لێسەندو .. خوابۆ خۆی بردەوە .

دوای هـەمـوو نیـوەڕۆیـەکی درەنگ .. کـاكاو چـا خواردنەوە ..

هەردوو برا دەکەوتنە کـەستەنـە خواردن .. یـا نان و سرکەو زەیتیان تێکەڵ دەکرد .. دوای موتـالاو دەرزو دەورو نووسینەوە .. هەقی ئەوەیـان پێ دەدرا کە بچنـە گۆڕەپـانە چکـۆلانەکـەو یـاری بکـەن .. یـان دەچـوونـە نێـو کـەلاوە ڕووخاوەکانی حەمامی گشتی کە لە ژێر بۆمبابارانی فڕۆکەدا بۆردوومان کرابوو . تا بڵێی ژمـارەیەکی زۆر لە کـۆتر ـ لەو گـۆڕەپـانـە چکـۆلانـەدا ـ هـەڵدەفـڕین‌و دەنیشتنـەوە .. منداڵەکانیش لەوێ وردە نانیان بـۆ کۆتـرەکان هـەڵدەڕشت .. دیۆمیراش زەرفێك وردە برنجی بۆ دەهێنان .. تێکڕای منالانی دەوروبەری لەوێ کـۆ دەبـوونـەوە .. بێجگـە لە منـالانی قـوتـانجـانـە .. ئـەوانـەی تـریش دەهـاتن کـەهـەموو

یەکشەممەیەکلەیانەی گەنجان تووشیان دەهاتن لەو یانەی کە یاری تۆپ تۆپێن دادەمەزرا .. لەگەڵ ـ دۆن ڤیچلیانی ـ کە خۆیبادەداو کراسی تراکسوتەکەی هەڵدەکێشاو شەقی دەهاوێشت هەندێ جاریش لە گۆڕەپانەکەدا دەکەوتنە یاری تۆپتۆپێن .. یان دەیان گۆڕی بە گەمەی دزوپۆلیس . جاریش داپیرە لە بالکۆنەکەوە بەدیار دەکەوت .. هاواری لێ دەکردن وریا بن نەبا تووشی ئازاری بن یان شوێنێکیان بشکێ : لە گۆڕەپانە تاریکەکەوە .. ڕووەو نهۆمی سێیەم سەریان هەڵدەبڕی .. لەوێوە پەنجەرەکانی ماڵەوە ڕووناکو دلگیرو دڵخۆشکەربوون .. دەشیانزانی بەئاسانی دەتوانن بکەڕێنەوە ئەوێندەر .. لەبەردەمی زۆپاکە دابنیشنو خۆیان گەرم کەنەوە .. لە تاریکی شەویش خۆیان بپارێزن .. داپیرەو دیۆمیرا لە مووبەقەکەدا دانیشتوونو بەپۆو پاتاڵو کۆنەکراسو بەرگە پێخەفەکان بەر تەقەڵو پینە دەدەن .. باپیرەش لە ژووری نانخواردن ، بەخۆو بە شەفقەوە ، دانیشتووەو مژلە پایپەکەی دەدا .. داپیرەش تا خوا دەڵێ بەس زریەو قەڵەو بوو .. هەمیشە جلی ڕەشی لەبەر دەکرد .. میدالیایەکی بەسەرسینەیدا شۆڕکردبووە .. لەگەڵ وێنەیەکی خاڵە ـ ئۆریست ـ کە لەو شەڕەدا کوژرا بوو .. داپیرە لە هەموو چێشتلێنانێکدا دەستاوخۆشو کەیبانووی چاك بوو .. خۆ چلفراکەی هەر باس ناکرێ .. هەتا ئێتەش کە هەراشن هەندێ جار هەڵیان دەگرێو دەیانخاتە سەر هەردوو ئەژنۆی .. داپیرە کەلێ گۆشتنە : سنگو بەرۆکی نەرمو یانو دۆدانەیین .. لە یاخەی کراسە ڕەشەکەیەوە ژێر کراسێکی ئەستووری سپیو یاخە گرنجگرنجی خوری دیارە کە بە دەستی خۆی دووریویەتی .. لەسەر چۆکی نەنە قنج دادەنیشتن .. ئەویش لە دیالکتی خۆیانەوە وشەی ناسكو خۆشو پڕ لە سۆزی بە گوێیانا دەچرپاند .. پاشان تۆقەیەکی لە قژی تۆپەڵکراوی پشتی سەری دەکردەوەو گوێی منداڵەکانی پێ پاك دەکردەوە .. ئەوانیش دەیانزریکاندو هەولیان دەدا ڕزگاریان بێ .. ئا لەو کاتەدا باپیرە بەخۆو بە پایپەوە ناو دەرگاکەی لێ دەگرتن .

زوو .. باپیرە لە قوتابخانەیەکی ئامادەییدا زمانی یۆنانیو لاتینی دەوتەوە .. ئێستاکە خانەنشینەو خەریکی نووسینەوەی « ڕێزمانی یۆنانی » یە : ناونـاوە زۆربەی قوتابیەکانی سەردەمی ئەوسای خوێندن دێنو سەری لێ دەدەن .. دیۆمیراش دەبێ قاوەیان بۆ بکا .. لە کونجی لای دەستشۆرەکەو ئاودەستخانەکەدا چەندەها پارچە کاغەزی کتێبی ڕاهێنانو دەستنووسێکی زۆرو وەرگێڕدراوی لاتینیو یۆنانی لەو ناوەدا کەوتوون .. دیاریشە بە سوور یان شین دەستکاری کراون . باپیرە ڕیشێکی سپیو تۆپزی بەرچەناگەی هێشتۆتەوە .. خۆ دەبووایە هەردوو براکە هاتو هاوارو بەزم نەنێنەوە .. چونکە باپیرە دوای ئەو هەموو ساڵانەی قوتابخانە مێشکی ماندووەو تەواو قیچکەی تەنگ بووە .. ئەوەندەی دەبیست کە بازاڕ بە قوڕ گیراوەو شت لە کڕین نایە .. زوو زوو دەکەوتە دڵەخورپێو ترسی لێدەنیشت .. سەری سوڕ دەما کە گوێی لەو پارە زۆرە دەبوو داوای دەکەن .. هەمیشە لەسەرئەوە .. هەموو سەر لە بەیانیان لەگەڵ داپیرەدا ئاگری سووکە شەڕێکی هەڵدەگیرساند .. بەهانەی بە دیۆمیرای کارەکەر دەگرتو پێی دەوت : دەشێ وردە وردە شەکر بدزێو لە ژێرەوە قاوەی پێ بخواتەوە .. دیۆمیراش کە گوێی لەم بوختانە دەبوو بە هەڵەداوان بۆی دەهات .. دەینەڕاندو دەیشیڕاندو پێی دەوت : قاوە بۆ قوتابیەکانی ئەو دەکرێ کە جرتوفرت دێنو دەڕۆن .. چۆڵی ناکەن .. بەلام سووکە شەڕو بەزمی وا هەر دەبوو .. پاش ئەختێ هەموو خوێنیان سارد دەبۆوە .. هێمنی جێی توڕەیی دەگرتەوە .. منداڵەکان لەم جۆرە گێچەڵە ترسیان ڕەوی بۆوە .. بەلام کە لە نێوان دایکیانو باپیرەدا ئاگری شەڕێکی بێئامان هەڵدەگیرسا .. ڕۆح دەهاتە کونی لووتیانو ئۆقرەیان لێ هەڵدەگیرا ..... ئەوە کەی ... ؟ ئەو جارانەی کە دایکیان شەوانە زۆر درەنگ دەگەڕایەوە ماڵێ .. ئەوسا باپیرە پاڵتۆکەی دەخستە شانی .. هەر بە بێجامەوە .. بە پێی پەتی لە ژوورەکەی دەهاتە دەرێ .. لەلایەکەوە ئەو .. لە لایەکەوە دایکیان : دەستیان دەکرد بە قاوو قیژو هەرایەك .. نەبێتەوە !

باپیرە دەیوت : « دەزانم لە کوێ بووی .. چاك دەزانم لە کوێ بووی .. دەشزانم تۆ چیتو چی دەکەی

دایکە وەڵامی دەدایەوە :

« جا من کەی گوێم داوەتێ ... بلکم بەچی‌یە ؟ .. ها ؟ »

پاشان تێ‌هەڵدەچۆوە :

« تۆ سەیرکە ... چۆن منداڵەکانت لە خەو ڕاپەڕاند » باپیرەش وەڵامی دەدایەوە :

« وەللاهی چەورە ... تۆ باکت بەوە هەیە منداڵەکانت هەرچی‌یەکیان بەسەر بێ .. بێ دەنگ بە .. قسە مەکە چونکە چاك دەزانم تۆ چیت . تۆ ئافرەتێکی سۆزانیت . شەوانە دەڵێی تیاترۆی .. قەحبەی شێت و لە کووچەو کۆڵانان خول دەخۆییتەوە ! »

داپیرەو دێومیراش لە ژێر کراسی شەویانەوە دەهاتنە دەرێ و پاڵیان بە باپیرەوە وەدەنا .. تکایان لێ‌دەکرد بچێتە ژوورەوە .. پێیان دەوت « شش ... شششش ! » دایکیشیان دەخزایە ناو نوێنەکەو دەگریا .. لە ژێر لێفەکەوە هەر هەنسکی دەدا .. هەنسکی قووڵ و بەکوڵێ لە ژوورە تاریکەکەدا دەنگی دەدایەوە : دوو منداڵەکەی لەو باوەڕەدا بوون کە باپیرە ڕاستی وتبێ .. زۆر شەرمەو ناشیاوە دایکیان بەشەو بچێتە سینەما .. یان سەر لە هاوڕێکانی بدا .. خەم و پەژارە دڵیانی دەگرت .. بە دڵێکی پڕ لە ترس و ژانەوە دەچوونە پاڵ یەکدی و لەژێر پێخەفە گەرم و نەرمەکەدا بەتەکەوە دەنووستان .. برا گەورەکە دەکەوتە ناوەندیان و پتر پاڵێ بە برا بچوکەکەی وەدەنا تا شوێنێکی بەر دایکی نەکەوێ .. بەرامبەر بەو فرمێسکانەی دایکی .. سەرینی تەڕی .. هەستی بە جۆرە بێزەوەری‌یەك دەکردو دڵێ دەگوشرا : وای بە خەیاڵدا دەهات : « کە دایکە دەگری .. برا چکۆلانەکەی زەندەقی دەچێ ! » هەرگیز بەیەکەوە لەو شەڕانەی نێوان باپیرەو دایە نەدەدوان .. لەوە وریاو ئاگادار بوون کە نە بە کەم و نە بە زۆر لەو بارەیەوە نەدوێن .. توخنی نەکەون .. ئەم دوو برایە یەکدیان گەلێ خۆش دەویست .. کە شەوانیش دایکیان دەگریا .. ئەوان لەژێر لێفەکەوە بە یەکدی وەدەنووسان .. بەیانیان کەمێ دەشلەژان .. چونکە زۆر توند یەکتریان لە باوەش گرتبوو .. وەك دوو کەس خۆیان لە مەترسی بپارێزن .. ترسی شتێکی دیکەش .. ترسی ئەو نهێنیەی نایانەوێ بیدرکێنن .. وێڕای ئەوانەش .. زۆر زوو بیریان دەچۆوە کە چەندە بەدبەخت و چارەڕەشن .. ڕۆژێکی نوێ دەهاتەوەو دەچوونەوە قوتانجانە .. لە شەقامەکانا تووشی هاوڕێکانیان دەبوون .. بۆ ماوەیەکیش لەبەر دەرگای قوتانجانەکەدا دەکەوتنە سەرگەمی یاری و شەڕە شەق .

لەژێر ڕووناکی لێڵ و پڕ تەمی خۆڵەمێشی ی بەیاندا .. دایکە وەئاگا دەهات : ژێرکراسەکەی لە نێوقەدی دەئاڵاندو دەیبەست بەخۆو بەمل و قۆڵ و باسکی ژێر کەفی سابوونەوە .. بەپێوە
دەوەستاو بەسەر حەوزی دەستشۆرەکەدا خوار دەبۆوە .. هەوڵێ دەداو حەزی نەدەکرد کوڕەکانی بەم شێوەیە بیبینن .. بەس لە ئاوێنەکەوە شانە باریك و ڕەش داهەڵگەڕاوەکانی و مەمکە وردو ڕووتەکانی بەدیار دەکەوتن .. لەنێو ئەو سەرمایەدا هەردوو گۆی مەمکی ڕەش هەڵدەگەڕان و ڕەپ دەبوون .. هەردوو قۆڵێ بەرز دەکردەوە .. بن‌هەنگڵەکانی لە پۆدرە هەڵدەسوویی .. تووکی بن باڵەکانیشی پڕو لوول بوون .. کە بەتەواوی خۆی لەبەر دەکرد .. دەکەوتە برۆهەڵگرتن .. لە ئاوێنەکە نزیك دەکەوتەوەو دیقەتی لە خۆی دەگرت .. توند لێوەکانی خۆی دەگەست .. پاشان توێخ توێخ کرێمی دەخستە سەر دەم‌وچاوی .. بزری دەکرد .. بەتوندی پەڕەمووچەی قەرەنفولی ڕادەوەشاندو گیانی خۆی پێ پۆدرە دەکرد .. هەموو دەم‌وچاوی زەرد دەچۆوە .. هەندێ بەیانیان گەلێ بە زەوق و کەیف بوو .. حەزی دەکرد منداڵەکان بدوێنێ .. پرسیاری قوتابخانەو خوێندنی لێ دەکردن .. برادەرەکانیان .. دوایی ئەویش باسی خۆی بۆ دەکردن .. ئەو سەردەمەی وەك ئەوان قوتابی بووە .. باسی « سینیۆرا دیرس » ناوێکی دەکرد کە مامۆستای بووە .. قەیرە کچێکی بەتەمەن بووەو ویستویەتی وەك گەنجێ خۆی بنوێنێ .. پاشان دایکە پاڵتۆکەی دەخستە سەر شان .. دەستی دەگەیاندە زەمبیلەکە .. دەنووشتایەوە تا منداڵەکان ماچ بکا .. مل‌پێچەکەی لەسەری دەئاڵاند .. بە بن بۆن دەکەوت و لە ژێر پۆدرەکەشدا تەواوێ ڕەنگی دەپەڕی و زەرد هەڵدەگەڕا .

هەردوو کوڕەکەی بەلایانەوە سەیر بوو کە لەو دایکە بوو بن .. بەلام هەرگیز ئەوەندە سەیر نەدەبوو گەر لە داپیرە یاخود دیومیرا ببوونایە .. داپیرەو دیومیرا سنگ پان و گەورەو گەرمن .. لە هەموو مەترسی یەك دەتپارێزن .. نەك هەر ئەوە .. بەرگەی دزو ڕەشەباش دەگرن .. بەڵێ .. گەلێ پێیان سەیر بوو کە ئەو ژنە دایکیانە .. لەوەش سەیرتر کە ملوەیەك لە منداڵدانیا هەڵیگرتوون .. هێندەی دیکە سەریان سوڕمابوو کە زانیبوویان بەر لەوەی منال ببێ : بۆ ملوەیەك لە ناو سکی دایکیدا دەمێنێتەوە .. کەمێ شەرمیان لە خۆ دەکرد کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو منداڵدانە هەڵیگرتوون .. نەك هەر ئەوەش .. بەڵکو لەو مەمکانەش شیری داونەتێ : ئەوەیان هەر تەواو ناشیرین و نەشیاوە .. بەلام ئێستا چیتر منالێ شیرەخۆرەی نەماوە تا بیخاتە جۆلانەو ڕای بژەنێ ... مەمکی لە دەم نێ . دوای چوونە بازاڕو خۆراك کڕین .. هەموو ڕۆژێ کە چۆن لە ماڵ دەردەپەڕی و خۆی هەڵدەدایە سەر پاسکیلەکەی .. سەربەست و ئاسوودە بەسەر پاسکیلەکەوە هەموو لەشی دەهەژاو ڕادەتەکا . هیچ شتێك بەوانی نەدەبەستەوە : لەسەر دایکە حسێب نەدەکران . نەیان دەتوانی هیچ پرسیارێکی لێ بکەن .. دایکانی منالانی دیکەش .. هاوڕێکانی قوتابخانە : زۆر بەئاسانی وەلامی هەموو جۆرە پرسیارێکیان دەدایەوە .. ئەوان نا .. بەس منالەکانی تر کە لە قوتابخانە تەواو دەبوون هەر بەغاردان تا کن دایکیان ڕادەوەستان .. یەك دونیا پرسیاریان لێ دەکردن .. هەناسە برکێیان وێ دەکەوت و کونە لووتیان فش دەبۆوە .. نەك هەر ئەوە .. ئەو منالانە قۆپچەی پالتۆکانیشیان بۆ دادەخران .. دەرزو نووسینەوەو ڕەسمە عەنتیکەکانیان بە دایکانیان نیشان دەدا : ئەو دایکانە تەواوێك پیرو بەتەمەن بوون .. هەر ڕۆژێ هەندێ شەفقەیان لەسەر دەنا .. یا بە ڕووپۆشەوە .. یان بەخۆو بە یەخەی فەرووەوە دەهاتنە قوتابخانەو زۆر وردو وەستایانە لەگەل بەڕێوەبەردا دەدوان .. ئەوانە کەسانێکی وەك داپیرەو دیومیرا بوون .. زریەو ئەسپەژنی وا لەش نەرمو لەندەهۆر بوون کە زەحمەتە هەرگیز بە فاقەوە بن .. کەسانێکی وان کە قەت شت ون ناکەن .. چەکمەجەی شڕو شێواویش بەجێ ناهێلن .. شەوانیش ببڕای ببڕ درەنگ ناگەڕێنەوە مالێ .. کەچی دایکیان هەر دوای گەڕانەوەی لە بازاڕ بەرەللا دەبێ .. جگە لەوەش .. کە دەچووە بازاڕ زۆر شڕو شەپڕێو بوو .. هەمیشە قەسابەکە فێلی لێ دەکردو بەتەواوی خوردەی نەدەدایەوە .. کە دەچۆوە دەرێ .. بۆ هەر شوێنێ بچووبایە کەس نەیدەگرتەوە .. کێ دەزانێ دایەرەکەی ئەو چۆنە ؟ لەو بارەیەوە ئەوەندە نادوێ .. دەبووایە بە ئینگلیزی و فەرەنسی نامە بنووسێ و چاپی بکا : بەلام کێ دەزانێ چۆن .. ؟ دەشێ لەوەیاندا زۆر چاپووك و چالاك بێ .

ڕۆژێکیان کە لەگەڵ « دۆن فیچلیانی » و منالانی یانەی گەنجان بۆ پیاسەیەك چووبوونە دەرێ .. لە ڕێگەی گەڕانەوەداو لە قاوەخانەیەکی دەرەوەی شاردا دایکەیان بینی دانیشتبوو .. لە جامخانەکەوە دیتیان .. لەگەل پیاوێکدا ڕووبەڕوو .. دانیشتبوون .دایکە ملپێچە خوری یە خەتدارەکەی لەسەر مێزەکە فڕێ دابوو .. لەگەل جانتا کۆن و ڕەنگ تەسلاحییەکەی کە زۆر باش دەیان ناسییەوە .. پیاوەکە پالتۆیەکی سووك فش و فۆلێ لەبەر دابوو .. سمێلێکی قاوەیی .. بەدەم زەردەخەنەوە قسەی بۆ دەکرد .. دەمو چاوی دایکیان یەك پارچە شادی لێ دەباری .. ڕووی هێمنی و ئاسوودەگی دەنواندو کرابۆوە .. کە هەرگیز لە مالەوە وای نەبوو .. دایکە سەیری پیاوەکەی دەکردو دەستی لە ناو دەستیا بوو .. بەلام ئەو کوڕەکانی خۆی نەدی : کوڕەکان شان بەشانی - دۆن فیچلیانی - دەڕۆیشتن کە لەو ساتەدا بە هەموویانی وت غار بدەن تا فریای تراموا کە بکەون و پێی ڕابکەن .. کە سواری تراموا کە بوون کوڕە چکۆلانەکە سەری هەلبڕی و لە برا گەورەکەی پرسی :

« خۆ دایەت بینی ؟ »

ئەویش وتی : « نا .... نەمدی ! »

برا چکۆلانەکەی بە سووکە پێکەنینەکەوە دەمی

کرایەوەو وتی :

« ئۆە ... نا ... تۆش بینیت .. خۆی بـوو .. ئەوە دایە بوو .. پیاویکیشی لە کن بوو . »

برا گەورەکەی ڕووی لێ وەرگێڕا : هەراشتر بوو .. تـەمەنی نـزیکەی سیـانزە (١٣) سـاڵێك دەبـوو .. بـەو قسانەی برا چکۆلانەکەی هـەلچوو .. پـەستو توڕەتـر بوو .. چونکە وای لێ کرد هەست بە خەمو پەژارە بکـاو بۆی بەداخـەوە بێ .. بۆ خـۆیشی داماو هـەستی دەکرد ملتو نیگەرانە .. نەیدەویست ئەو دیمەنەی کە دیتبووی بێتـەوە یـادی .. ویستی وا خـۆی بنـوێنێ کـە هیچی نەدیوە .

هیچیان لای داپیرە نەدرکاند .. بۆ بەیانی ئایندە کە دایکیان خۆی دەگۆڕی .. کوڕە چکۆلانەکەی پێی وت :

« دوێنێ کە لەگەڵ دۆن فیچلیانی پیاسەمان دەکرد تۆمان بینی .. پیاوێکیش لەگەڵتا بوو . »

دایکە ڕاچەنیو بەدەوری خۆیدا خولایەوە .. دڕو دژوارو ناشیرین دیـار بوو .. هـەردوو ملی ڕەشی سـەرچاوانی لەرزینو وێك هاتنەوە .. وتی :

« من نەبووم .. ئەوە چ قسەیەکە .. وەك دەزانن من ئێواران تا درەنگانێك هەر لە دایەرە دەمێنمەوە .. بێگومـان بەهـەڵەدا ڕۆیشتوون . » پاشان کوڕە گەورەکەی بە دەنگێکی هێمنو پڕ لە ماندوێتی وتی :

« نەخێر .. تۆ نەبووی .. ئافرەتێك بـوو کتومت لە تۆ دەچوو . » هەردوو کوڕەکە گەیشتنە ئەو ڕاستیەی کە دەبێ ئەم یادە لە بیر خۆیـان ببەنـەوە .. بەڵام تـەنگە نـەفەسیش دەبوون تا تۆزێ ئەم یادەیان لە خۆ دەتەکاند .

جارێکیان کابرای قاوەخانەکە .. ئـەو کابـرایەی پـاڵتۆ سووکەکـەی لەبەر بـوو .. هاتـە ماڵەکـەیان . لەبـەر هاوین پاڵتۆکەی داکەند بوو .. چاویلکەیەکی شینی لە چاو کردبوو .. قاتێکی ڕەنگ کراوەی کەتانی لەبەردابوو .. کە هـاتنە سـەر خـوانی نانی‌نیـوەڕۆ مۆڵەتی لێ خـواستن تا چـاکـەتـەکـەی دابکـەنێ .. داپیـرەو بـاپیـرە بـەسـەفـەر بـۆ [ میـلانـۆ ] ڕۆیشتبـوون .. تا خـزم‌وخوێ بـەسەر بکـەنەوە .. دیـۆمیرا گەڕابۆوە گوندەکەی خۆیان .. جا بۆیە لەگەڵ دایکیانـدا هەر خۆیان تەنیا مابوونەوە .. ئەوساکەش ماڵ چۆڵ بوو .. کابـرا

خـۆی پیا کـردو هات .. ئـەو نیوەڕۆیـە خوانو سفـرەیەکی شاهانـەی ڕازاندەوە .. دایکیـان هەمـوو شتێکی کڕی .. لە کەبابخانەکە کەبابو گۆشتی برژاویشی هێنا .. هەر لە فروجەوە بیگرە تا چپس هیچی فەرامۆش نەکرد .. مەعکەرۆنەیەکی زۆر بە تامو بۆی بۆکردبوون .. تەنها صاصەکە نەبێ کە تۆزێ تیژو بە سوێ بوو .. بێ شەڕابیش نەبوون .. دایکە شادو بەختەوەر بوو .. لەسەر یەك پێ دەسووڕایەوە .. شلەژا بوو .. دەیویست بەجارێ هەموو شتێ بلێ : دەیویست باس‌وخواسی منداڵەکان بۆ کـابرا بگێـڕێتەوە .. هی کـابراش بـۆ منداڵەکـان .. بەنـاوی ـ ماکس ـ بانگی دەکرد .. پاشان زانیان کـە سەردەمێـك لە ئەفریقیا بووە .. وێنەیەکی زۆریشی لەو ئەفریقیایە گـرتبوو .. یـەکە یـەکە نیشـانی دەدان : لەوانـە .. وێنـەیـەکیـان هی مەیمونەکەی خۆی بوو .. منداڵەکان دەربارەی ئەو مـەیمونـە پرسیارێکی زۆریان لێ کرد .. زانیان کە زیتو زۆڵو هوشیارو سەیرو سەمەرە بووە .. خۆی لەبەر دڵان شیرین کـردووە .. زۆر بە جوانیو عەنتیکەیی داوای حەلواو شیرینی کردووە .. بەڵام لەبەر ترسی نەخۆشیەکـەی هەر لە ئـەفریقیـا بەجێی هێشتووە .. لێی ترساوە نەوەك هەر لەسەر پشتی پاپۆڕەکـە بمرێ .. منداڵەکان لەگەڵ ـ مـاکس ـ دا بوون بـە ئاشنـا .. بەڵێنی دانێ ڕۆژێ بەیـەکەوە بچن بـۆ سینەمـا .. ئەوانیش کتێبەکانی خۆیان نیشانی کابرا دا .. کتێبێکی ئەوەندە زۆریش نەبوون .. کابرا لێی پرسین ئاخۆ ( ساتورنیۆ فاراندۆلا ) یان خوێندۆتەوە .. ئەوانیش وەڵامی نەخێریان دایەوە .. کابراش ئەو بەڵێنەی دانێ          کە کتێبەکەیان بۆ بێنێ .. لەگەڵ کتێبی ـ ڕۆبنسن دێلا پراترێ ـ کە ئەوەیـان تا بـلێی کتێبێکی خۆش بوو . دوای نان‌خواردن دایکە داوای لێ کردن بچن لە گۆڕەپانەکەدا یاری بکەن .. ئەوانیش پڕ بە دڵ حەزیان دەکرد لەگەڵ ـ ماکس ـ دا بمێننەوە .. کـەمێ خۆیـان هێناو برد .. دادی نەدا .. چونکە دایکە .. هەروەها کابراش لێیان دووبارە کردنەوە کە بـڕۆن .. کە دەمـەوئێوارە گـەڕانەوە .. ماکس ئەوێی بەجێ‌هێشتبوو .. دایکیان بەپەلە نانی‌شێوانی بۆئامادە کردن .. کە بریتی بوو لە قاوەو شیرو پەتاتە .. هەردوو براکە شادو بەختەوەر بوون .. حەزیان دەکرد باسی ئەفریقیاو مەیمون بکەن .. بێ‌ئەوەی بزانن بۆ .. لەوپەڕی ئاسوودەییدا بوون .. دایکیشیان لەوان گەلێ شادو بەختەوەرتر بوو .. باسی

زۆر شتی بۆ کردن : باسی مەیمونێك كە جارێكیـان بینویـەتی لەبەردەمی ئۆرغۆن ژەنێكی منالدا چۆن هەلپـەڕیوە .. دوایی داوای لێ کردن بنوون .. پێی وتن : بـۆ تەنهـا دەقیقەیەك تا دەرەوە دەچێ .. ناشبێ بترسن .. پێویست بەوە ناکا .. بـەسەریـاندا نـووشتایـەوە تا مـاچیان بکـا .. پێی ڕاگەیاندن کە ئەوەش ئەوە نامێنێ لای باپیـرەو داپیرە بـاسی ماکس بکەن .. چونکە ئەوان هەرگیز حەز بە میواندرای خەلك ناکەن .

بۆ چەند ڕۆژێك ئـاوا لەگەڵ دایکیـانا گـوزەرانديـان : خواردنی بێ ناوو نیشانو سەیریان دەخوارد .. چونکە دایکە نەیدەویست هیچ بخاتـە سەر ئـاگر .. ڕانـەبەراز بـووایە .. مورەبا .. قاوەو شیر .. گۆشتی برژاو .. هەرچی حازربەدەست بووایە دەیهێنایەوە .. دوای نان خواردن هەردوو برا دەکەوتنە مێز پاككردنەوەو قـاپ شۆرین .. بـەلام كە بـاپیرەو داپیـرە گەڕانەوە منالەکان کەوتنە خۆشیو حەوانەوە .. قوماشەکـەی ژووری خر لیەوە سـەر مێز .. پـەرداخو کاسـەو کەوڵێ نـاو مووبەق هەر یەکەی چووە شوێنی خۆی .. ڕێـك خرایـەوە .. داپیرەش لە ناو کـورسی جۆلانـەکەی خـۆیدا دانیشتـەوە .. لەشێکی نـەرمو بۆنێکی خـۆش .. ئەوەنـدە پیرو قـەلەو بوو نەیدەتوانی لە مالەوە بچێتە دەر ... کەلێ مایەی خۆشبەختییە کەسێکت هەبێو هەمیشە لە مالو نەتـوانێ هەنگـاوێك دوور بڕوا !

منـالەکـان دەربـارەی مـاکس هیچیـان لای داپیـرە نـەدرکانـد .. چاوەڕوانی کتێبی « سـاتورنیتـو فـارانـدۆلا » بوون .. چاوەڕوانی ماکس بوون بێتو بیانبا بـۆ سینەمـا .. وێنەیەکی زۆری دیکەی مەیمـونیان پیشـان بدا .. یـەك دوو جاریش لە دایکیان پرسی کەی « سینیۆر » بۆسینەما دەیانبا .. ئەویش بە دەنگێکی گرو پڕ لە خەمەوە دەیـوت : ئیتر مـاکس تەواو .. ڕۆیشتو ناگەڕێتەوە .. کوڕە چکۆلانەکەی دەیپـرسی ئـاخۆ بـۆ ئـەفـریقیـا چـوتـەوە ؟ .. دایکـە هیـچ وەلامێکی نەدەدایەوە .. کەچی کوڕەکەی هەر وای دەزانی بۆ ئەفریقیا گەڕاوەتەوە تا مەیمونەکەی بێنێتەوە .. هەمیشە لەو خەیالەدا بـوو کە ڕوژێ لە ڕۆژان دێتـەوە .. لەگـەل قـوولەڕەشێـكو مەیمونێك بە باوەشیەوە .. ئەوسا لە قوتانجانە دەیانباتەوە .. دەرگای قوتانجانەش کرایەوە .. پوورێ بەسەردان هاتووە تـا ماوەیەك لەگەل منالەکاندا بمێنێتەوە .. زەمبیلەیەك پڕ بەهێ و سێوی بۆ هێناون .. ئەوانیش خێریان خستـە ناو فـرنەکـە .. دەستیان پێ کرد بە شەکروشەرابەوە بیانبرژێنن .. دایکەش تا دەهات خووی شڕو خەراتر دەبوو .. هەمیشە لەگەل باپیرەدا لە هەراو شەڕو فەرتەنـەدا بوون .. دەرەنگـانێ دەهاتـەوە .. نـەدەنـووستو هـەر جگـەرەی دەکێشـا .. هـیچـی وای نەدەخوارد .. ڕۆژ بە ڕۆژیش پتر دەبنێساولەڕو لاوازو باریکتر دەبوو .. تا دەهات دەمو چاوی وردو بچوکتر دەبۆوە .. ڕەنگو ڕووشی سیسو زەردتـر .. لەم دواییەدا فـێر بووە بـرژانـگو بەرچاوی ڕەش دەکا .. تف دەکاتەوە ناو سنووقێکی بچووك .. بـەدەم تف ڕووکردنـەوەش هەر خـەریکی قـەلەمو فلچـەی ئارایشتە .. تویخ لەسەر تویخیش پۆدرە لە دەمو چاوی دەدا .. داپیرەش بە دەستەسڕێك هەولێ دەدا بۆیەو پۆدرەکە لەو دەمو چـاوە بسڕێتـەوە .. کەچی ئـەو ڕووی لێ وەردەگێڕا .. زۆر بەدەگمەنیش دەدوا .. خۆ کە دەمیشی دەکردەوە هەر بەحال نوزەی دەهات .. دواندن ئەركو کارێکی گران بوو .. دەنگیشی ئـەو پەڕی بێهێـزی دەنوانـد .. ڕۆژێکیان دەمـەوئێـوارە ، دەوروبەری سەعات شەش ، هاتەوە مـالێ .. هاتنـەوەیەکی سـەیرو دەگمـەن بـوو .. چـونکـە هـەمیشـە لەوە درەنگتـر دەگەڕایەوە .. دەرگای ژووری نووستنـەکەی لەسـەر خۆی داخست .. کوڕە چکۆلانەکەی هاتو لە دەرگای دا .. کتێبێکی ڕاهێنانی دەویست .. لە ژوورەوەڕا دایکی بەتوڕەییەوە پێی ڕاگەیاند کە نیازی هەیە بنوێ .. باشتر وایە عاقلانەو بێئاژاوە بڕواو بەتەنیا جێی بهێلێ .. کەچی کوڕەکەی بە ترسو لەرزەوە تێیگەیاند کە زۆر پێویستی بەو کتێبەیە .. دوای ئەوە دایکە هاتو دەرگاکەی بۆ کردەوە .. لە هەموو لایەکەوە دەمو چاوی تەڕ بوو .. زۆر ئاوسا بوو .. منالەکەی هەستی پێ کرد کە دایکە گریاوە .. کە گەڕایەوە لای داپیرە پێی وت :

« دایە دەگری ... »

داپیرەو پوورێ سەریان لە بن گوێی یەکـدی ناو بـەهێمنی بۆ مـاوەیەکی درێـژ کەوتنـە چرپـەچـرپ .. دەربـارەی دایکی دەدوان .. بەلام هیچ لەم ورتەورتە تێنەگەیشت .

شەوێك لە شەوان دایکە نەگەڕایەوە .. باپیرەش بەپێی پەتی هەر دەهات و دەچوو .. هەر لەسەر پێجامەکەوە پاڵتۆکەی لەبەر کرد .. داپیرەش زوو زوو منداڵەکانی بەسەر دەکردەوە .. تاریك و خوارو خێچ لە ناو نوێنەکەدا ڕاکشابوون .. بەئاشکرا گوێیان لە هاتوچۆی داپیرەو باپیرە بوو کە بەناو ماڵەدا دەسووڕانەوەو سرەوتنیان بۆ نەبوو .. پەنجەرەکانیان دەکردەوە .. دایاندەخستەوە .. منداڵەکان تەواو تۆقی بوون .. شەو تێپەڕی .. بۆ سەر لە بەیانی زوو لە بنکەی پۆلیسەوە تەلەفۆنیان بۆ کرا :

دایکیان لە ئوتێلێکدا لاشەکەی دۆزراوەتەوە .. ژەهریشی خواردووە .. نامەیەکیشی بەجێ هێشتووە ! پوری و باپیرە وەپێش کەوتن .. داپیرەش دەمیزریکاند .. منداڵەکانیش بۆ لای پیرەژنێك ڕەوانە کران کە لە نهۆمی ژێرەوە دەژیا .. ئەو یش هەر دەیکردو دەیوتەوە :

« پەکوە .. دایکی بێ دڵو دەروون .. وەرە دوو منداڵ ئاوا بەجێبێڵێ ! »

دایکەیان هێنایەوە ماڵ .. کە لەسەر پێخەفەکە لە کفنیان دەپێچا دوو کوڕەکەی چوون ببینن .. دیۆمیراش پێڵاوە چەرمینە بە بریقەکەی لە پێی مردووەکە داکەند .. جلە ئاوریشمی یە سووربلوەکەشی لەبەر کردەوە .. کراسی زەماوەندی بووکێنی .. زۆر ڕیوەڵەو بچووك دیار بوو .. هەر وەك بووکە شووشەیەکی بێ گیان ڕاکشا بوو .

بینینی گوڵ و مۆم لەو ژوورە کۆنینەدا شتێکی سەیرو سەمەرە بوو .. پوری و داپیرەو دیۆمیرا چۆکیان دادابوو و نوێژیان دەکرد .. وتیشیان بەهەڵە ژەهرەکەی خواردووە .. ئەگینا قەشە بۆ « موبارەکی » تۆخنی نەدەکەوت گەر بیزانیبایە بەدەستی ئەنقەست خۆی کوشتووە .. دیۆمیرا بە منداڵەکانی وت کە دەبێ دایە ماچ بکەن .. ئەوانیش بە دوای یەکدیدا هاتن و بەو پەڕی شەرمەوە ڕوومەتە ساردەکەیان ماچ کرد .. پاشان گۆڕبو ناشتنی ویست .. زۆری خایاند .. لەم سەر تا ئەو سەری شاریان بڕی .. شل و شەکەت بوون .. دۆن ڤیچلیانی و ژمارەیەکی زۆر لە هاوڕێکانی تانجانەو یانەی گەنجان لە پرسەکەدا ئامادە بوون .. تا بڵێی گۆڕستانەکە سارد بوو .. بایەکی ساردیش هەڵیکرد .. کە گەڕانەوە داپیرە دەستی بە فینگ و گریان کرد .. کە پاسکیلەکەی بینی ئەوەندەی تر زریکاندی و کەوتە لاوانەوە .. چونکە کتوپڕ دەهاتەوە یادی چۆن سواری پاسکیلەکەی دەبوو .. چۆن دەردەپەڕی .. بەخۆو بەو لەشە سووکەوە .. مل پێچەکەی کە لە هەوادا دەشنایەوەو ورشەی دەهات .. دۆن ڤیچلیانی دەیوت : « ئێستا ئەو لە بەهەشتە ! » هەڤیەتی چونکە نەیدەزانی بەئەنقەست خۆی کوشتووە .. یان زانیویەتی و خۆی لێ گێل دەکا .. بەڵام منداڵەکان نەیاندەزانی ئاخۆ بەڕاست بەهەشت هەیە .. چونکە باپیرە دەیوت : « نی یە ! » داپیرەش دەیوت : « هەیە ! » جارێکیشیان دایکیان وتی بەهەشت و شتی وا لە گۆڕێ نی یە .. نە فریشتەی چکۆلانەو نە مۆسیقای خۆشیش هەن .. بەڵکو ئەوەندەیە مردووەکان دەچنە شوێنێك کە لەوێ نە ساغن و نە نەخۆشیش دەکەون .. لەوێدا هیچ ناخوازی .. ئەوە نەبێ بە کرۆکی بۆ خۆت بنووی ..

هەردوو برا تا ماوەیەك لەگەڵ پوری چوونەوە لادێ .. هەموو کەسێ لەگەڵیانا میهرەبان و بە بەزەیی بوو .. ماچیان دەکردن .. دەیانگرتنە باوەش .. ئەوانیش تا بڵێی شەرمن بوون .. بەیەکەوە نە باسی دایکیان دەکرد نە باسی ( سینیۆر ماکس ) .. لە دەلاقەیەکی ماڵێ پوری کتێبەکەی « ساتورنینۆ فاراندۆلا » یان دۆزییەوە .. لە خوێندنەوەی تێر نەدەبوون .. کەلێ کەیفیان پێ دەهات .. بەڵام کوڕە گەورەکەی زۆر جار دایکی دەهاتەوە یاد .. ئەو ڕۆژەی لە قاوەخانەکەداو لەگەڵ ماکس دانیشتبوون .. کە توند دەستی گرتبوو .. یەك پارچە ڕووی کەیف و خۆشی لێ دەباری .. وای بەخەیاڵدا دەهات کە بۆیە دایکی ژەهری خواردووە چونکە ماکس بێ هەست وخوست گەڕاوەتەوە ئەفریقیا .. منداڵەکان لەگەڵ سەگەکەی پوری کەوتبوونە یاری و بەزم .. سەگێکی خەپان و خۆشەویست کە ناوی [ بۆبی ] بوو .. فێر بوون چۆن بەسەر درەختەکانا هەڵگەڕێن .. کە هەرگیز پێشتر نەیاندەتوانی .. هەروەها .. بەیەکەوە لە ناو ڕووبارەکەدا مەلەیان دەکرد .. خۆش بوو کە ئێواران دەگەڕانەوە لای پوری و دەستیان بە یاری « مەتەڵێ وشە لێکدابڕاوەکان » دەکرد .. لە کن پوری شادو بەختەوەر بوون .. کە گەڕانەوە کن داپیرەش ئاسوودەتریش بوون ..

داپیره لەسەر کورسی یەکەی خۆی دادەنیشت .. دیسانەوە دەیویست بە تۆقەی سەری گوێیان پاك بکاتەوە .. یەکشەممەیەك بەرەو گۆڕستانەکە بەڕێ کەوتن .. دێومیراش بەگەڵیان کەوت .. باوەشێك گوڵیان کڕی .. لە ڕێگەی گەڕانەوە لەبەردەم بارێکدا وەستان تا شەڕابی « ینش » ی گەرم بکڕن .. لە گۆڕستانەکەشدا - لەسەر گۆڕی دایکیان - داپیرە نوێژی کردو تێر گریا .. بەڵام زۆر لە مەزەندەو عەقڵ دوور بوو کە ئەو گۆڕەو خاچەکان و بگرە تەواوی گۆڕستانەکەش هیچیان بۆ ئەو دایکە پێ بکرێ .. ئەو دایکەی قەسابەکە فێڵی لێ دەکرد .. خۆی هەڵدەدایە سەر پاسکیل و دەردەپەڕی .. جگە لەوانەش .. جگەرەش دەکێشا .. هەمیشە کووچەو کۆڵانەکانی لێ دەگۆڕاو خۆی ون دەکرد .. شەوانەش دەگریاو بەرەهەنسك دەیگرت .. ئێستا نوێنەکەیان بۆ پان و بەرینتر بووە .. هەر یەکەیان سەرینێکی تەنیای بەردەکەوێ .. بەدەگمەن دایکەیان دەهاتەوە یاد .. چونکە ئەو یادە ئازاری دەدان .. بگرە تەنها یادێك تەواو شەرمەزاری دەکردن .. هەندێ جار هەر یەکەیان لە ئاستی خۆیەوە هەوڵی دەدا بەبێدەنگی شێوەی بکاتەوە ... دیمەن و ڕووخساری بێتەوە بەرچاوی .. خەیاڵ ئەوەندەی بڕ نەدەکرد .. قژە لوول و کورتەکەی .. هەردوو ماسی پشت چاوانی .. لێوەکانی .. تا دەهات لەبەر دیدەی خەیاڵیاندا دوورو دوورتر دەکەوتنەوە .. هیچ ئاکارێکی دایکەیان نەدەهاتەوە بەرچاو .. توێخی ئەستووری تۆزە زەردەکەی سەر ڕووی نەبێ .. ئەوەیان زەق و زۆپ دەهاتەوە بەرچاو .. بەرەبەرە دەتوایەوە تا لە دواییدا دەبوو بە خاڵێکی زەردو بەس .. ئەی شێوەی ڕووەتەکانی .. دەم و چاوی .. هەرگیزاو هەرگیز نەدەهاتنەوە یاد .. ئێستا هەست دەکەن کە هەرگیز ئەو دایکەیان خۆش نەویستووە .. دەشێ ئەویش ئەوەندە ئەوانی خۆش نەویستبێ .. خۆ ئەگەر خۆشی بویستنایە .. خۆی دەرمان خوارد نەدەکردو خۆی نەدەکوشت .. ئەو جارە گوێیان لێ بوو کە دێومیراو کوڵ هەڵگرەکەو پیرەژنەکەی نهۆمی خوارەوەو خەڵکێکی زۆریش هەر هەمان ڕایان دەردەبڕی .. ساڵان هاتن و ساڵان تێپەڕین .. منداڵەکانیش گەورەتر بوون .. بەسەرهات و کارەساتی زۆریش ڕووی‌دا .. ئەو ڕووەی کە هەرگیز خۆشیان نەدەویست .. بۆ هەتاهەتایە لە بیر کراو بەتەواوی کەوتە ژێر تەمی بیرچوونەوەوە .

● لەکتێبی :

ITALIAN SHORT
STORIES ( I )
Edited by / RaLeigh Trevelyan
Penquin Books
[ لاپەڕە 109 — 131 ]

کورتەی ژیانی

---

لە « پالیرمۆ » .. لە ساڵی ( ١٩١٦ ) دا لە دایك بووە .. لە منداڵییەوە تا ساڵی ( ١٩٣٩ ) لە شاری - تۆرین - ژیاوە .. لەسەرەتای سییەکان بۆ یەکەمجار شووی بە - لیۆن گنزبێرگ - کرد .. ئەو پیاوە ڕۆژنامەنووسێکی ڕامیاری و بە ڕەگەز ڕووسی بووە .. وتارو ڕاپۆرت نووسیش بوو .. زۆر شاکارێنشی لە ڕووسییەوە وەردەگێڕا .. سەرپەرشتی دەزگایەکی بڵاوکردنەوەی دەکرد بەناوی ( ئێناودی ) .. ئەم ئافرەتە چیرۆکنووسە لەسەرەتای جەنگ لە شاری - کۆنفینۆ - دا گیرسایەوە .. بەڵام لە هاوینی ( ١٩٤٣ ) دا گەڕایەوە ڕۆما .. کە لەوێ لە ( ١٩٤٤ ) دا مێردەکەی مرد .. کە لەوانەیە ئەڵمانییەکان دەرمان خواردیان کردبێ .. چونکە مێردەکەی بەسەر دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی نهێنییەوە گیرا . لە ( ١٩٤٥ ) دا گەڕایەوە - تۆرین - و لە بڵاوکردنەوەی « ئێناودی » دا کەوتە بەشداری .. لە ( ١٩٥٠ ) دا شووی بە گابریل بالدینی کردو گەڕایەوە ڕۆما .. بەیەکەوە چوون بۆ ( لەندەن ) .. لەوێ مێردەکەی بوو بە بەڕێوەبەری ئاموزگایەکی ئیتالی ( ١٩٥٨ - ١٩٦١ ) لە ساڵی ( ١٩٦٩ ) دا مێردی دووەمیش مرد .. ئێستا ناتالیای چیرۆکنووس لە ( ڕۆما ) دەژی .

ئەم ئافرەتە ڕێبازێکی ڕیالیزمی گرتووەو بەری نەداوە .. لە ( ١٩٤٢ ) تا ( ١٩٧٥ ) و ساڵانی دواییش لە بڵاوکردنەوەی کورتەچیرۆك و چیرۆکی درێژو ڕۆمان و شانۆگەری نووسین نەکەوتووە .

لە تەکنیکی مۆنۆلۆگ بەکارهێناندا ئەوەندە زاتیانە شۆڕ دەبێتەوە ناو دەروون .. هەر دەڵێی لەگەڵ خۆی دەدوێ .

# دەربارەی ئەدەب و تەکنۆلۆجیا

شوکور مستەفا
لە تورکییەوە کردوویە بەکوردی

پرۆفیسۆر دوکتۆر نیکۆلاس کـانانـۆی ناوێـك ، بە مـەبـەستی دانـانی کتـێبـێـك بـە نـاوی (ئـەدەب و تەکنۆلۆجیا)وە ، لە ساڵی 1972دا گفتوگۆی لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە هونەرمەندو نووسەرو ئەدیبە بەناو بانگەکانی دنیا کرد کە یەکێکیشیان یەشار کەمالی نووسـەری تورکیـایی بوو . وا لێرەدا پرسیارو وەڵامانە ئەکەین بە کوردی کە لەگەڵ یەشـار کەمال کراون .

● رۆمانی لادێ لە 1950دا رچەتان شکاند . لە رۆمانەکانتاندا بەزۆری بەلای لادێیی تورکیادا دادەتاشن . مەسەلەی وڵات پیشەسازکردن تا چ ئەندازەیەکی بەپەرۆش خستوون ؟

ـــ یەکەم رۆماننووس بە بنەچەك لادێیی لە تورکیا منم . بەر لە من ، ناظمی نەبی‌زادە ، ئەبوبەکر حازمی تەپەیران ، یاقوب مەدرسی،قەرە عوسمان ئـۆغلو ، سەبـاحەددین عـەلی رۆمان و چیرۆکی لادێیان دەنووسی . ئۆرخان کەمال و کەمال تاهیریش رۆمانی لادێیان نووسی ، بەڵام ئەمانە هەموو ، یا خەڵکی شارە چکۆلەکان یا خەڵکی شارە گەورەکان بوون .

من بۆیەش لە رۆمانەکانمدا باسی لادێییان دەکەم ، چونکە خۆم بە بنەچەك لادێییم و ماوەیەکی دوورو درێژ ، لە گوندەکەی خۆم ، لە چقورئۆوا ژیاوم . لە تەمەنی بیست و حەوت ساڵەمدا ، بۆ ئەستەموول هاتم . بووم بە رێپۆرتـاژنووسێکی رۆژنامەیەکی گەورە . کارم ئەوەبوو لە ئەنەدۆڵەوە رێپۆرتـاژ بنـووسم . بەشی زۆری دوازدە ســاڵ رۆژنامـەنـووسیم ، لە ئەنەدۆڵ بەسەرچوو .

چقورئۆوا تەنیا زێدی لەدایکبوون و تێدا گەورەبوونی من نیە ، جۆرە زێدو نیشتمانێکی رۆمـانەکـانیشمە . بـەنموونـە رەفتاری هەر ئینسانێ ، هەر کەسی رۆمانێکم لە ئەستەموول ، لە ئـەنقەرە ، لە هـەر شوێنێکی دنیـا ، لە رۆمان‌نـووسینـدا تووش‌بێ ، یەکسەر بۆ چقورئۆوا ، بۆ بارو دۆخی چقورئۆوا ، بۆ ئاووهـەواو دەوروبەری چقـورئۆوایـان رادەگوێـزم . زۆر لەوکەسانەی ، زۆر لەو رەوشت و رەفتارانـەی ، زۆر لەو بارە نـەفسیی‌یانـەی ، زۆر لەو گـۆڕانـدن و خـوڵقـانـدنـانـەی لە رۆمـانەکـانمیانـدا بەکـاریان‌دێنم ، هـەر ئەوانـە نین کـە لە چقـورئۆوایـان فێر بـووم . من چقورئـۆوا لە رۆمانـەکانمـدا سەرلەنوێ دەخولقێنمەوە ، لە نوێژەنەوە دایدەرێژمەوە . بـا دووپاتی کەمەوە ، باشوورێکی منی تێدا لەدایـك‌بووم ، منی تێدا پیرۆکەو وەرویرکە بووم ، باشووری نیە تەنیا هەر منی لێ لەدایك‌بووبم و هەر منی لێ پیرۆکەو وەرویرکە بووبم نیشتمانی

ڕۆمانەکانیشمە . ئەوەی من لە ڕۆماندا خوڵقاندوومو دروستم کردووە ، بەلای خۆمەوە ڕۆمان ئاوایەکە بۆخۆی .

جا بەرانبەر بەوە کە لەوێ ولاتێکی ڕۆمان ئاوەدان دەکەمەوە ، ڕۆژبەڕۆژ لەگەڵ هەموو شتێکی چقورئۆوا ، لەگەڵ باری ئابووری ، نەفسی ، کۆمەلایەتی ، لەگەڵ هەموو بارو دۆخێکدا ئاشنایەتی پەیدا دەکەم . دیرۆکو جوغرافیای چقورئۆوا لە دیرۆکو جوغرافیای هەموو دنیا چاتر دەزانم . دێ بەدێ چقورئۆوا گەڕاوم ، ئەویش بەپێیان ، فۆلکلۆرم خڕکردەوە ، لە فۆلکلۆرم کۆڵییەوە . پێنج ساڵ خشت ئەمە کارم بوو . لە شیوەننامەو بەیتو بالۆرە ، لە چیرۆك ، لە پەندی پێشینان ، لە مەتەڵۆکە ، لە سەربهوردو نوکتەو قسەی خۆشم کۆڵیوەتەوە . هەوەڵ کتێبم ، کە لە 1943دا بلاوکردەوە ئەو «شیوەننامانە» بوون کە لە چقورئۆوام کۆکردبوونەوەو لێم کۆڵیبوونەوە . بارو دۆخی گوندایەتی بۆ من ، ئەو مرۆوایەتییەیە کە ڕەوشتو ڕەفتاری خۆی هەزار ساڵ دەبێ بەرانبەر بە سروشت دەستنیشان کردووە . بارو دۆخێکی بەڕەگو بەڕیشەی نەفسیو کۆمەلایەتییە .

پەیوەندی گوندایەتی بۆ بەری مەکینە بەکارهێنان ئەو ڕەوشتو ڕەفتاری مرۆوایەتییەیە کە ئەمرۆکە ، من بە چاترین شێوە بە خەڵکی ئاشنا دەکەمو شایەتیی بۆ دەدەم . لە بەری سروشتەوە بۆ بەری مەکینە بەکارهێنان پەڕینەوە ، بەنموونە ، لە زەوی بە گاو ئێستر کێڵانەوە دەست بە زەوی بە تراکتۆر کێلان بۆ مرۆوایەتی ، بارو دۆخێکی تازەو نرتونۆبییە ، لە داودەستووری کۆن ؛ لە بیروبڕوای کۆن ، لە ڕەوشتو ڕەفتاری کۆن دەست هەلگرتن ، واتە چوونە سەر بارو دۆخێکیتر ، واتە بیروبڕوایەکیتر پەسندکردن ، واتە بیروبڕوایەکیتر خستنەکارەوە ، واتە لەسەر ڕەوشتو ڕەفتارێکیتر ڕاهاتن ، ئەم بارە بەلای منەوە باری هەرە بەپێوەندی مرۆیە . کە لە بەری سروشتەوە بۆ بەری مەکینە بەکارهێنان پەڕیوەتەوە ڕەنگە بۆ یەکەم جار بێ کە بە خەتی درشت لە مێژووی خۆیدا ، بەو بنەوەبڕییەوە لە بارێکەوە بۆ بارێکیتر بازدەدا . نالێم پێیدا دەڕوا ، هەر بەراستی

بازدەدا . ئەم باری بازدانە بۆڕۆمانووسێ ، تا دوواپلە بەدووای لە کرۆك کۆڵینەوەی نەفسییەتی مرۆدا هەلوەدابێ ، تا

دوواپلە بیەوێ سەرلەبەری تواناو بەهرەی مرۆ بخاتە بەر ڕووناکی ، خەریکی ئەوەبێ لە مرۆدا لەنەفسییەتی بێپایانی مرۆدا ئاسۆی زۆرو زەوەندەی تازە بدۆزێتەوە ، لە ڕووی سەرنج بزواندنیەوە بارێکی ئێکجار نایابە . جارێ خۆ ئەگەر ئەم بارە ، ڕۆماننووسێ ، خۆی تێیدا ژیابێ ، لە هەوەڵەوە ، بە هێسترو گاوگۆتال جووتی ڕانیبێو لەپاشان بە تراکتۆر ملی لە زەویکێلانو وەردو شۆ دانەوە نابێ ، لە تەمەنی دوازدە ساڵییەوە لە گوند دەرچووبێو لە کارگەو فابریقەو کارخانەی زەلامدا کاری کردبێ داخۆ ...

لادێییەکی بارەو ئاوها هەڵکەوتوو ، بەلای منەوە زۆر سەرنج بزێوە . نەفسییەتی بارەو ئاوها هەڵکەوتوو لەوپەڕی دەوڵەمەندیو تێکەڵو پێکەڵیو هەرەمەییدایە . لادێییەکی وایە کە لە سەدان هەزار ساڵ بەملاوە ئاشنای سروشت بووەو ئێستا لەناکاو خۆی لەناو هەلو دەرفەتو بارودۆخی مەکینەدا دەبینێتەوە .

ئینسانانی ولاتە کەمفراژییەکانی کوتوپڕ خۆیان لە بەرابەر شتی تازەئیجات ، بەزۆری مەکینەی سەیر سەیردا دەبیننەوە . لە ئەوروپا مەکینە بەکارهێنان هەروا بەکوتوپڕی سەری هەڵنەداوە ، مەودایەکی دوورو درێژی پێچووە .

هەرچی ولاتە کەمفراژییەکانن ئەم مەودا درێژەیان بەخۆیانەوە نەدیوەو مرۆ لەناکاو تووشی بە تووشی مەکینەوە بووە . ئەمەیش لە باری کوتوپڕدا بەرتەکی جۆراوجۆر ، ڕەوشتو ڕەفتاری چەشناوچەشن ، بۆ هەڵسووڕانو بۆلووانی تەرزاوتەرزی لێئێتەگۆڕێ . بچی لە ناوەندی دنیایەکی نرتونۆیی وەك دنیای مەکینەدا ، کە لەنێو دنیایەکی زۆر کۆندا هەڵتۆقیوە ، لەگەڵ مرۆدا پێکەوە ژیان بەسەربەریوسەروەتو سامانی بەهرە پێکەوەبنێی ، ئەمە بۆ ڕۆماننووسێ بارێکە بەدەست ناکەوێ ... دەرفەتێکە لەدەست نادرێ ... لەم کارەشدا کرێکارو وەرزێر زۆر گرنگن .

ژیانی بۆرجوا ، وردە بۆرجوا ، هەرلەکۆندا ، لە ئەوروپا

چۆن بوو بە چ دەورێکدا ڕۆیشت ، لە ڕۆژاوای ولاتیش هەر بەو دەورەدا دەڕوا . بورجواکان هەر لە خۆڕا ، کتوپڕ دەوڵەمەند

ـمبن ، لەپرێکدا دەبن بە خاوەن مەکینە ، بەڵام کرێکار ، وەك ـەیی هەرچۆنێ بێ ، ئێکجار وا لەگەڵ مەکینەدا نابن بە یەمالو دیواربەدیوار . ئێکجار وا لەگەڵ مەکینەدا بەناچاری ـابن بە ئاشنا . بەنموونە ، دووا ڕۆمانێ ، کە بە ناوی ـەفسانەی هەزار کەلەگایان»وەم نووسیوە لەم بابەتە ـەدوێ . چقورئۆوا کارخانەی وای تێکەوتووە ، بە مەکینەی هەرە نوێباوی دنیا ڕزاوەتەوە . ئەمڕۆ بڕێ لە کارخانەی تەون و حولایی‌یەنی هەرە تازەو هەرە گەورەی تورکیا لە چقورئۆوا ـ مەزراوون . یەکێ لە ئاوبارە هەرە گەورەکانی تورکیا لە چقورئۆوایە . کشتوکێڵ لە چقورئۆوا ، خوارو ژوور ، هەمووی ـە مەکینە دەکرێ . بەڵام بەتەنیشت ئەم هەموو بە مەکینە کارکردنەوە ، لە چقورئۆوا هۆزو خێڵی ڕەوەك و ڕەوەندی ـورکمان و کوردیش هەن . مەودای نێوان بە مەکینە کارکردن و ـوەکایەتی دەبێ مەودایەکی دوورو درێژی تەواو بێ . ئەم ـوەندانە لەوەتەی هەزاران ساڵەوە هەر بەمجۆرە دەژین . ـستانان دێنە خواری بۆ چقورئۆواو هاوینانیش بەرەو چیاو کەژەکانی تۆرۆس هەڵدەکشێن وڵاوەك هەمود هۆزو خێڵە کۆچەرەکانی تر گەرمیان و کوێستان دەکەن .

بە پەز بەخێوکردنەوە خەریکن . بە خوری و شیرو ڕۆنی مەڕ بەڕێوەدەچن . ژیانی خێڵەکی و ڕەوەندایەتی ، لە سۆنگەی ـەرو دۆخ گۆڕانی چقورئۆواوە وا خەریکە بەسەردەچێ . ئەمن ـۆ خۆم لەم ساڵانەی دواییدا ، لەگەڵ هۆبە تورکمانێکی ـوەندا ، کە لە ئاخرو ئۆخری دەوربەسەرچوونی‌دا بوو ئاشنایەتیم پەیداکرد . چەندین ساڵ لە زۆرانبازی و کێشەی ـێوان داوو دەستووری کۆن و نوێم کۆڵییەوە . ڕۆمانی ـەفسانەی هەزارکەلەگایان» لەم لێکۆڵینەوەیە هاتەگۆڕێ . هۆبەیەك کە داغان دەبێ ، حاڵی خەڵکەکەی ، لەکوێ دەحەوێنەوە ، بۆکوێ دەچن ، بەرانبەر بە تورکمانە پاشکەوتەکان ، بەرانبەر بە تورکمانێتی خۆی ، هۆبە چۆن داغان بوو ، دەوری بەسەرچوو ، ئەمانەم نووسی . بەلای منەوە ، تووشی باری نەفسیی تازەو مۆرو شەقڵ‌نەشکاو بووم . من لەگەڵ ئینسانێکدا کە بەرانبەر بە سروشت هەموو ڕەفتارێکی بەدیارکەوتبێ و ساغ بووبێتەوە چۆن پێوەندی دەگرم و چەندسەرنج دەبزوێنێ ، لەگەڵ ئینسانێکیشدا کە بۆ بەری مەکینە بەکارهێنان پەڕیوەتەوەو خەریکە لەگەڵ مەکینەدا سەری داوی سپی تێدەکەوێ ، بەو ئەندازەیە پێوەندی ـەگرم و سەرنجم دەبزوێنێ .

لە دنیا زێدەکردنی هەر خشتێکی نوێ ، هەر وەسەرنانێکی نوێ ، چ خۆڕسك ، چ دەسکرد ، دنیا دەوڵەمەند کردنێکە . مەکینەیش وەك کرۆەکانی دیکەی هونەر دەوڵەمەندی‌یەکی دنیایە . دەوڵەمەندی‌یەکی مرۆیە .

● **سەبارەت بەگەشەو هەڵدانی تەکنۆلۆژی ئینسان لە ڕابردووی ئینسانەتی دابڕاوە . بەمە نیگەران نین ؟**

ــ ئینسان لە ناوچاوانی تەکنۆلۆژی‌یەوە لە ئینسانەتی دانەبڕاوە . بەلای منەوە ، شتێ نیە پێی بگوترێ دابڕانی ئینسان لە ڕابردووی ئینسانانە . مەسەلەکە ، مسەلەی بیانی‌کەوتن و نامۆیی لێ‌کردنە .

ئەمەیش حیکایەتێکی دوورو درێژە . مەسەلەی بیانی‌کەوتن و نامۆیی‌کردنی مرۆ لە مەکینەوە دەستی پێ‌نەکردووە . بیانی‌کەوتن و نامۆیی‌کردن لە پێشتریشدا هەر هەبووەو لەپاشانیشدا هەر دەبێ . پێم‌وایە مەسەلەکە هەمووی مەسەلەی خەست‌وخۆڵ‌بوونەوەی بیانی‌کەوتن و نامۆیی‌کردنی ئینسانە . هەڵبەتە لەمەدا مەکینە کاری هەرە گەورەی کردووەو هۆی هەرەگەورە ئەوە . مەکینە ، لەوبارەوەی کە بووە بەهۆی چەوساندنەوە ، دەرکەین ، ئەم بیانی‌کەوتن و ناموکەوتنە بەلای منەوە کەم‌دەبێتەوە . ئینسان چەند لە سروشتەوە نزیکە ئەوەندەیش لە مەکینە نزیك‌دەکەوێتەوە . من ئەمەم لەو ئینسانانەدا کە تازە لەگەڵ مەکینەدا ڕووبەڕوو وەستاون زۆر لەنزیکەوە دیت . هاوپێوەندیی مرۆ لەگەڵ مەکینەدا . ئەگەر مەکینە لە گیانی مرۆ خراب نەخوێنێ ، دەبێتە مایەی هاوپێوەندی‌یەکی زۆر ئینسانانە . ئاشقە مەکینەیی‌یەکی زۆر سەیرم لە ئینسانی ئیشکەردا دیت ، تەنانەت لە باری ئەمڕۆکەشدا .

مرۆ لەترسان ، لە منەتباری‌یان سروشتی دەپەرست . ئینسانی ئەو چەرخەشمان ، بەڕاستی لە هەموو هەل و دەرفەتێکدا منەتباریی خۆی لەڕاست مەکینە بە ڕاشکاوی دەردەبڕێ . سەبارەت بەوە کە مەکینە یەکراست دەست مرۆوایەتی نەکەوتووەو چینێکی مرۆچەوسێن داگیری‌کردووەو

لەسەر دەستی ئەو بەگەشەکەوتووە ، بووە بە گەورەترین بێبەغباڵیی ، بگرە لەمێژینەی ، مرۆڤایەتی . بێتو مەکینە لەدەست ئەم چینە دەرهێنەدرێ ڕاستەوخۆ بکرێ بە ماڵی مرۆڤایەتی ، هەر برینو جەخارێکی تا ئەمڕۆ لە ناوچاوانی مەکینەوە بەر مرۆ کەوتووە ساڕێژ دەبێتەوەو هەلو دەرفەتی تازەونرتو نوێشی بۆ دابین دەبێو دەرەخسێ . مرۆ کە لە مرۆڤایەتی دابڕابێ ، وەك بزانین هەڤیشێتی ، جارێکی تر بە خەستوخۆڵتروە باوەش بە مرۆڤایەتیدا دەکاتەوەو لە بیانیکەوتنو نامۆییکردن خاوێنو پاکژ دەبێتەوە . نەخۆشیو دەردەدارییەکە خۆی هەموو لەوەدایە کە مەکینەیشو سروشتیش بەدەست چینێ ئینسانەوەنو مەکینەکەیشو سروشتەکەیشو ئینسانەکەیش بە خواستو ئارەزووی ئەم چینە ، بێئەوەی کەس لێیان بپرسێتەوە لەکاردەکرێن . سەبارەت بەوە کە چینی بۆرجوا سەرتۆپی ئیمکاناتو مەکینەو بەشی هەرە گەورەی مرۆڤایەتیی ، لە کرێکارووەرزێروهەروەها سروستیشی دوروست کردووەو دنیا بە دەسەلاتی سامناکی وی بەڕێوەدەچێ ، زوڵەك کەوتووەو ڕەسەنایەتیی خۆی دۆڕاندووەو بەجارێ بووە بە بیانیو نامۆیی لێ دەکرێ . ئەم چینە نەخۆشو دەغەزارە سەبارەت بە ڕەنگو ڕووە زگماکەکەی ، سەبارەت بەو جۆرە گەشەکردنەی ، سەبارەت بەوە کە بووە بە خێوی هەموو ئیمکاناتێ ، پشتی لە هەموو بەهای مرۆڤایەتی هەڵکردووەو تووشی نیوە شێتییەك بووە . سروشتی بێپایانو مەکینەو سەرلەبەری ئیمکاناتێکی کە بە دەست چینی بۆرجوادەیە سەرتۆپ شێتو شبری کردوون . ئەو ژیانەیش کە بووە بە ناچاری بۆ چینی بۆرجوا لەم نیوە شێتو شبربوونەیدا دەورێکی گەورەی بینیوەو هەر بەجارێ لە هەموو بەهایەکی مرۆڤایەتیی شتۆتەوە . چینی بۆرجوا ، لە ڕووی هاتنەگۆڕێ ، لە ڕووی بەگەشە کەوتنی ، لە ڕووی ژیانیەوە ، پشتی لە ڕابردووی ئینسانانەی ئینسانەتی ، لە هەموو بە هاونرخێکی ئینسانەتی

هەڵکردووەو حاڵی بووە بە حاڵی نیوە شێت . ئەم بیرو ئەندێشانەم دەتوانم بە نموونەیەك بچەسپێنم : شەڕی ڤێتنام بەڵگەی هەرە گەورەی ئەوەیە ، کە چینی بۆرجوای ئامریکا تا چ ڕادەیەك نانی هاریی بەدەمەوە گرتبوو و نیوە شێتو شبر ببوو. بۆرجوای ئامریکا زۆر چاك دەزانێ خەڵکی ڤێتنام بۆ پاروە برنجێ بە لاسو پەلاسدا دەچێ . یەك لەو بەها گەورانەی مرۆڤایەتی هێناویە ئەوەیە کە یارمەتی هاورەگەزی خۆی بدا ، بەڵێ ، ئینسانێکی خوساییو عادەتی برنج بۆ ئەم ئینسانە برسیو دەستەوسانانە دەنێرێ ، وە نیە ؟

سەنگو ڕەنگو بەهاداریی مرۆڤایەتی ئەمەی دەوێ ، وە نیە ؟ بۆمباو قومپارەو ژەهری لە ئەقڵو ئاوەز بەدەر بە سەرو پۆتەلاکی ئەم برا ئینسانە هەزارانەماندا دەبارێنن، بە تەکنیکی هەرە پێشکەوت دەیانکوژن . باشە تەکنۆلۆجیو تەکنیك لەمەدا گوناهی چیە ؟ لێرەدا ئەوە هەیە ، کە تەکنیك دەست چینێکی نیوە شێتو هار کەوتووە .

ئەم تەکنیکە حەواڵەی دەستی ئینسانەتی بکەینەوە هەموو شتێ ڕزگار دەبێ . چونکە چینێك دەتوانێ بیانی بکەویو نامۆیی لێ بکرێ ، هار دەبێ ، دەبێبە درندە ، پشت لە هەموو بەهایەکی مرۆڤایەتی دەکا ، بەلام ئینسانەتی تێکرا ، نە بیانی دەکەوێ ، نە نەخۆشیش دەکەوێ ، نە پشت لە هیچ بەهایەکی ئینسانەتی ، خۆی هێنابێتی ، هەڵدەکا چونکە هەرچی بەها هەیە ، بە سەدان هەزار ساڵ خۆی خوڵقاندوویە ، ئەو گەشەی پێ کردووە ، ئەو تا ئێرەی بە ئێمە گەیاندووە .

لە سەرێکیترەوە قسە لە سروشتکوشتن دەکرێ تەکنیك چۆن خەڵکی ڤێتنام دەکوژێ هەر ئاوهایش سروشت ناکوژێ ؟ نموونەیەك بۆئەمە دێنمەوە : ولاتەکەی من ، تورکیا ئەمڕۆ لەگەڵ مردنو ژیاندا دەستەوبەرۆك وەستاون . ئەم مردنە نە لە ناوچاوانی تەکنیکەوەیەو نە لە ناوچاوانی هیچ هۆیەکی ترەوەیە . هۆی مردنی ولاتەکەم ، هەموو لە ناوچاوانی بۆرجوای کۆمپرادۆرەوەیە ، لە ناوچاوانی بۆرجوای دنیاوەیە هۆی مەرگ بۆرجوایە . ولاتی تورکیا ، پارچە خاکێکی گەورەو فرەوان ، نیوە ئادینەیەکە . سێ دەریا ، دەریایەکی ئەندە ڕوونو چەندین گۆلی هەن . گوێ دەریاکانی تورکیا ، سەرلەبە بە لێرەوار تەندراون . تورکیا ، ئەمڕۆ تەنیا 10٪ی لێرەوار بوو لێزانانی زانست وایان دەگوت . هەرێمی تورکیا خوێشی هە گیانێکی بەم شریتە لێرەوارە گوێدەریایانەیە . وا بڕوا بەمزووانە ، ئەم لێرەواری گوێدەریایانە ، بەرەبەرە دەبڕێنەوە ، لە دوواڕۆژێکی زۆر نزیکدا کار وا بڕوا ، تورکیا نە پارچە سەنگجارێکی دنیا بەولاوە هیچی دیکەی ن

بەجێنامێنێ . ماوەیەکی زۆر کورت لەمەوپێش دەریاکانی تورکیا ، بەتایبەت دەریای مەرمەرە ، هەریەکە دەبوێەکی ماسی بوو بۆخۆی ، کەچی ئێستا وا خەریکە ماسی لە دەریاکانماندا بەرەو نەمان دەچێ . هۆی سەرلەبەری مردنی ئەم بەروبووی هەموو خاکە ، بەروبووی هەموو لە ئینسانەتی بەدەرەیە کە بۆرجوا دایمەزراندووە . بەنموونە : نۆ میلیۆن گوندی لە لێرەوارەکانی تورکیادا دەژین . ئەم نۆ میلیۆن گوندی‌یە خۆیان و بزنەکانیان بە تاقی تەنیا لەم لێرەوارانەدا دەژین .

ئەوەی هەڵیدەتەکێنێ و دەیچینێ هەر لێرەکەیە ، ئەوەی هەڵیدەتەکێنێ و دەیفرۆشێ هەر لێرەکەیە ، ئەوەی زستان دەیسووتێنێ هەر لێرەکەیە ، ئەوەی دەیخوا هەر لێرەکەیە . ئەوەی دەیخواتەوە هەر لێرەکەیە . لە سەرێکی ترەوە شیرکەت و کومپانیای زەلام زەلام لێرەوار دەخۆن و دەیانبڕنەوە . بۆرجوای کۆمپرادۆر هەر لەپێناوی دەسەلات وەدەست هێنان و فەرمانڕەواییدا بێ‌ئەوەی بیر لە دوو ساڵی دوایی بکرێتەوە ، چاو لەو هەموو وڵات وێرانکردن و لێرووار لەناوبردنەی دەستەودایەرەی سەربەخۆیان دەپۆشن ، خەڵکی ناچاری تورکیا و بۆرجوای تورک بەشێکی سروشتی دنیا وێران و خاپوور دەکەن . لە لایەکی ترەوە جۆرە ڕاوەماسی‌یەك لە تورکیا داکەوتووە ، سەرلەبەری کان و کانگای ماسی وێران دەکا . بەنموونە : لەم ڕاوەماسی‌یەدا ، بۆیەك تاکە ماسی دەهەزار ماسی لەناودەبرێ . بۆرجوای کۆمپرادۆری تورك هەقی دەریاکوشتنی بەم سەرمایەدارانەی سەربەخۆی داوە . ئەوەی لەپشت ئەم بۆرجوایەوەیەو دەستی بەسەر فەرمانڕەوایی تورکیادا گرتووە بۆرجوای ئامریکایە ، خەڵکی تورکیا ، کە هەموو ساڵێ لە میلیۆنێ پتر زیاددەکاو زەوی و خاکەکەی ساڵی نزیکەی یەك میلیۆن مەتر چوارگۆشە بەداخزان لەناودەچێ ، بەمنزیکانە لەگەڵ برسێتی‌دا ڕووبەڕوو دەوەستێ . ئەمەیش بە پیشەسازکردنی وڵاتەکە پینەوپەڕۆ ناکرێ و هیچ لە باری مەسەلەکە ڕاستناکاتەوە . چونکە ئێرانیش هەروایەو یۆنانستانیش هەر بەودەردە چووەو هەرچی وڵاتی کەمفراژیی ژێردەستەی بۆرجوای کۆمپرادۆریشە هەروایە . پێویستە نەتەوە یەککرتووەکان دەست بەسەر ئەم بارە بەسامەدا بگرێ . سەرزەوی لە وڵاتە کەمفراژی‌یەکانی جیهاندا بەرەنگاری بێبژیوی (? ecosid)یەکی بەسام بووە . ئەمەیش خەتای تەکنۆلۆجی نیە ، خەتای بیانی‌کەوتنی تەکنیکە ، خەتای ئەوەیە کە تەکنیك دەست بەشێ ئادەمزادی لە ئینسانەتی داشۆراو کەوتووە .

ئەمە چەندین ساڵە من ئەم (ecosid)ە بەسامەی تورکیام لە ڕیپۆرتاژەکانمدا ، لە ڕۆژنامەکاندا دەردەبڕم . ئەمە چەندین ساڵە ئەم (ecosiol)ە لە ڕۆمانێکی پێنج بەرگدا دەنووسم .

● **تۆبڵێی نووسەرێ هەبێ لە وشاری تەکنۆلۆجی ڕزگاری ببێ ؟**

ــ وشاری تەکنۆلۆجی بۆ نووسەرێ ، بۆ ئەم چەرخەمان ، بابەتی قسەو لێدوان نیە . هەرکەسێ پێی‌وابێ تەکنۆلۆجی وشار دەکا ، سامی ڕێ‌نیشتووە ، مەزنەکردنی تەکنۆلۆجی بوون بە وشار ، سامێکە لە سەردەمی تۆلستۆیەوە بە میرات ماوەتەوە . تەکنۆلۆجی ، لەبەرئەوەی کە ئەو سەردەمە هێشتا شتێکی نوێباوتر بووە ، برێ نووسەری ترساندووە . تەکنۆلۆجی لە ڕووی دوواڕۆژی مرۆوایەتی‌یەوە ، لەپڕ تاخمێ ئینسانی نیگەران کردووە . ئەم هەیولا گەشەکردووە لە سەرەتاوە ، هەڵبەتە ڕووداوێکی بەسام بوو لە ڕوواڵەتدا . لە سەرێکیشەوە بڕوانی ، ئەوەی گوتیان و پێیان‌وابوو ، بەڕاست گەڕا . تەکنیك لەجیاتی ئەوەی بێ مرۆ بەختەوەر کا ، لەبری ئەوەی جوانترین ڕووپەری پێشکەوتی مرۆوایەتی بێ ، کەچی ئینسانی کرد بە دیل و بەندەو ئینسان لە ناوچاوانی تەکنیکەوە تووشی زوڵم‌وزۆری وابوو نە دیتراوەو نە بیستراوە .

من هیچ وشارێکی خراپی تەکنیکم بەخۆمەوە نەدیت و نابینم . تەکنیك بەلای منەوە ، وەك پەرجوویەك ، وەك ئەفسوونێ دەچێ . زۆربەی خەڵکیش سەرەڕای ئەم هەموو زەرەرو زیانەی لە تەکنیکیان دیوە ، ئەوانیش تەکنیك وەك پەرجوویەك ، وەك ئەفسوونێ دەبینن . بێتو تەکنیك دەست خەڵکەکە کەوێ ، تەکنیکیش و نووسەرانیش و هونەرمەندانیش ئازاد دەبن . بیانی‌کەوتن، لە ڕەسەنایەتی کەوتن ، ونکردنی بەهای ئینسان عونسوری هەرەگەورەن . ئەو عونسورە هەرەگەورانەن کە کۆسپ و تەگەرە دەخەنە بەر بەهرەی داهێنان و خوڵقاندنی مرۆ . خەڵك لە تەکنۆلۆجی ئازاد لە بیانی‌کەوتن ، لە ڕەسەنایەتی داشۆران ، لە ئینسانەتی دۆڕاندن ئازاد دەبێ . مرۆوایەتی لە هەموو وشارێکی کە

کۆسپ دەخەنە بەر تاووگوڕی خولقاندن‌و داهێنان ، پاك‌و خاوێن دەبێتەوە .

مەکینە دەست ئینسانان بکەوێ هیچ وشارو زەرەرو زیانێکی لەسەر ئینسانەتی نابێ ، بەپێچەوانەوە ئادەمزاد لە زیانی مەنفیی سروشت ڕزگار دەکا . گەزەن‌و زیانی تەکنیك بۆ مرۆو سروشت هەر بە تەکنیکەکە خۆی لادەبرێ .

**● هەست بە بەرەبەرە پەرەساندنی حاکمی‌یەتی زانست‌و تەکنۆلۆجی دەکەن ؟**

ـــ وشاری زانست‌و تەکنۆلۆجی ، ڕاستەوخۆ نەخەڵك هەستیان پێ‌دەکاو نە نووسەرانیش . ترس‌و سام ، زۆرو ستەم‌لەگیننسانەتی بەدەریی زانست‌و تەکنۆلۆجیای بەردەستی بۆرجوازی ئینسانەتی هەموو کاتێ هەستیان پێ‌دەکا . ڕکی لە زانستیش‌و تەکنیکیش دەبێتەوە ، زانست‌و تەکنۆلۆجی کاتێکی دەست مرۆوایەتی دەکەوێ چ‌تەنگ‌و چەڵەمەیەك دێننە پێش مرۆوایەتی ئەوە لەئێستاکەوە ناتوانین هەڵبێنین . نازانین ، لەوانەیە شتێکی لێ هەڵکرێنین . بەلای منەوە ، مرۆوایەتی لە سەدان هەزار بەم‌لاوە چۆن لەگەڵ سروشتدا برایانە دەری‌بردووە ، هەر لەگەڵ تەکنۆلۆجی‌دا ، لەگەڵ زانتشیشدا برایانەتر دەردەباو هەڵدەکا . تەکنۆلۆجی‌و زانست مرۆوایەتی لە هەموو جۆرە بیانی‌کەوتنێ قوتاردەکا ، ئادەمزاد سەرلەنوێ لەگەڵ خۆیدا ، لەگەڵ بەهرەی داهێناندا دەست لە ملان‌و شادو شوکور دەکاتەوە . زەرەروزیانی ئەمێستاکەی ئادەمزاد ، جەفاو مەینەتی‌یەکی تائێستا کێشاویە ، لە بەرچاو ناگرین .

**● لە بارەی ڕادیۆو سینەماو تەلەفیزیۆن کارلەئەدەبیات کردنەوە چ بیردەکەنەوە ؟**

ـــ هەر عونسورێکی تازە دێتە دنیاوە مرۆوایەتی‌یەکەمانی پێ دەوڵەمەند دەبێ . ئەمرۆکە ، لەم چەرخە منفی‌یەشدا ، دەبینین شتی نوێباو تا چ‌ئەندازەیەك مرۆوایەتیی پێ دەوڵەمەند بووە . سینەما ئەدەبیاتی تەواو پێ دەوڵەمەند بووە ، ئاسۆی تازە تازەیی بۆ خستۆتە سەرپشت ، هەل‌ودەرفەتی نوێ‌نوێی پێ‌بەخشیوە . ئەو تەکنیکەی ، تەکنیکی‌سینەما بە ڕۆمانی بەخشیوە لەوانە نیە بە هەل‌و دەرفەتێکی کەم‌و بێ‌پێز بزاندرێ . بێتو تەلەفیزیۆن‌و ڕادیۆ دەست مرۆوایەتی بکەون ، نەکرێن بە ئامێری سوودو قازانجی‌چینێك ، بۆ پەروپاگاندای چینێ بەکارنەهێندرێن ، لە بڵاوبوونەوەی ئەدەبیاتدا بەناو جەماوەری بەربڵاودا دەبن بە هۆی زۆر بەکار . تەلەفیزیۆن‌و ڕادیۆ کە ئەو دنیا پان‌و پەرینەت ، دەنگ‌و ڕەنگەوە لە بەرگوێ‌و لە بەرچاوان بۆ هەڵدەخەن ، سینەماو تەلەفیزیۆن کە تا ڕادەی مانگ پیشان‌دانیان بۆ ڕەخساندووین ، هەروەها بۆ لەدایك‌بوونی ئەدەبیاتێکی تازەو پوختەو ڕاستەقانی ، بۆ سنووررو کەوشەن پان‌و هەراو کردنەوەی ، بۆ دەرفەت‌و ئیمکاناتی نوێ پێ‌بەخشینی ، سوودو کەڵکی زۆری دەبێ .

ئێمە ئاگامان لەوە هەیە کە هەروەك سینەماو ڕادیۆو تەلەفیزیۆن پێویستن ، کتێبیش ، تەنانەت فرۆتنیشی لە ئاکامی بەهونەرەوە گلانی ، سەدلەسەو فەرقی کردووە . بەلای‌منەوە ، ئەم تازەکوورەو نوێباوانە ، بەپێچەوانەی زۆرکەسەوە ، هیچ زیانێ بە ئەدەبیات نابەخشن ، لەجیاتی زیان ، بگرە سوودو قازانجیان هەیە .

**● کەرەستەیەکی زۆری ڕۆمان هێند لە سینەماو تەلەفیزیۆندا دەجوورێنەوە وەختە بڵێم هەر بەجاری سوواون‌و،لەکەڵك‌کەوتوون ... بەلای ئێوەوە تۆبڵێی ، ڕۆژێ بێ ، کتێب ئەرکی خۆی بدۆڕێنێ ؟**

ـــ ڕاستە ، سینەماو تەلەفیزیۆن بڕێ کەرەستەی زۆر کتێبانی کۆن کردووەو گەیاندوونیە ڕادەی سووان‌و بۆ ئەوە ناشێن جارێکی‌تر لەکارکرێنەوە . من هیچ‌کاتێ زیان لەمەدا نابینم . سووان‌و لە کەڵکی بەکارهێنان کەوتن ، عەمارەپووبوونی کەرەستەیێ ، تا زووە ، هێزو ، بەهۆی سینەماو تەلەفیزیۆنەوە لەناوچوونی شتێکی زۆر بەسوودو پیرۆزە بۆ دەوڵەمەندیی مرۆ ، بۆ بەهرەی داهێنانی مرۆ . ئەدەبیات لەم ڕووانگەیەوە ، هەل‌و دەرفەتی بەربڵاوتر ، تازەتر بۆ خۆی دەدۆزێتەوە . لەم ساڵانەی دوواییدا ، کە پێمان‌وابوو ئەدەبیات بەرەو بوحرانێ دەڕوا ، لەمەوە سەری هەڵداوە . ئەدەبیات ، هونەر لە ئیمکاناتی تازە ، لە دنیای تازە ، لە ئاسۆی نەفسیی تازە ، لە زمانی تازە ، لە ڕشت‌و شێوازی تازە دەگەڕێن بۆخۆیان . ئەدەبیات لە کەرەستەی نوێ دەگەڕێ بۆ خۆی ، سینەماو تەلەفیزیۆن کە تەنگیان بە ئەدەبیات هەڵچنیوەو بەرەو ئیمکاناتی تازەی ڕادەدا ، بۆ مرۆوایەتی شتێکی زۆر چاك‌و پیرۆزە . خۆ بێتو ئەدەبیات لەگەڵ سینەماو تەلەفیزیۆندا دەسیاوی‌و هاوکاری پێك‌بێنێ ، ئەوە بۆ ئەدەبیات خۆیشی‌و بۆ

سینەمایش و بۆ تەلەفیزیۆنیش زۆر بەکەڵك دەبێ . هەر سێ عونسورەکە کار لێك دەکەن . لە سۆنگەی کار لێککردنی هەرسێ عونسورەکە ، ئیمکانات بەرەو فرەوانی و دەوڵەمەندی وەحەوزەڵ دەکەوێ . سینەماو تەلەفیزیۆن جێگای کتێب لە ژیانی مرۆدا پتر دەچەسپێنن .

**● هێندێ ڕۆمان نووسی هاوچەرخ فەخشەو بەرنامەڕێژی یان دەلاخستووەو بارو بوخچەی کات و شوێنیان بەجارێ پێچاوەتەوە . ئەمە بەلای ئێوەوە جۆرە هەلاتنێکە لە ڕاستین و کوڵ و بارەکانی ژیان ، یا تەنها تەکنیکێکی تازەیە ؟**

— ڕۆماننووسانی تازەی مرۆوایەتیی جیهانی دەوڵەمەندبووی گەشەکردووی لەگەڵ ئیمکاناتی نوێدا ڕووبەڕوو وەستاون ، لەپێناوی ئەوەدا مرۆوایەتی بە ڕاستینە تازەکانی بگا ، ناچارن بە لاس و پەلاسدا دەچن . ڕۆماننووس لە دنیایەکی بەمئەندازەیە بە گەشە کەوتووبێ و هێند دەوڵەمەند بووبێ و گەورە بووبێ و زۆر بووبێتەوە ، ناچارە بە شێوەی جۆراوجۆر لە دنیاکەمان و لە ڕاستی یەکەمان بگەڕێ . من کات و شوێن پایوەست پێکردنی ڕۆماننووسانی لێشاوی تازە بە هەلاتن دانانێم . بەڵکو ئەمە جۆرە ڕەوتێکە بەسەر کوڵ و باری ژیاندا . لەپاشان کێ ناڵێ ئەم ڕێبازی ڕۆماننووسە تازانە ، کە ئێمە بە هەلاتنی دادەنێین ، یا بە نیشانەی هەلاتنی هەنووکەیینەوە ڕەنگدانەوەی ئەو کۆمەڵە نیە تێیدا دەژین ، ڕەنگدانەوەی کۆمەڵێ بیانیکەوتەی لە ڕەسەنایەتی داشۆراوی بۆرجواو بۆرجوای بچووك نیە . ئەی ئەمە ڕەنگدانەوەی کات و شوێن ونکردنی کۆمەڵە مرۆیەکی لە سروشت دابڕاو ، لە مەکینە دابڕاو لە کۆمەڵگای ئینسان ، بیەوێ و نەیەوێ ، دابڕاو نیە ، چیە ؟ هەڵبەتە هەلاتنی مێشکیش هەیە ، خۆ بە پەناو پەسێو دانی مێشکێش هەیە . لە ڕاستەقانێیتی ژیان هەلاتن ، لە بارگرانی ژیان هەلاتن کارێکی کۆن و دێرینە . یەك لە تاریفەکانی ئینسان ئەوەیە کە گووراوێکی ئەفسانە داهێنە؟ . هەرچی ئەفسانەیشە ، خۆ بۆ هەموو سەردەمێ هەر هەلاتن و سەرخۆهەڵگرتنە . ئەو جێگایەی لەپاش بێقنیاتی و کوڵ و باری قورس و گران پەنای پێ دەبرێ ئەفسانەیە . کێ ناڵێ ڕۆماننووسە تازەکان بە بەتاڵکردنەوە کات و شوێن ئەفسانەی هەلاتن و سەرخۆهەڵگرتنێکی تر هەڵنابەستن و پەنا وەبەر ئەفسانەی بێکاتی و بێشوێنی نابەن .

من لە ڕۆماننووسە تازەکاندا بەرانبەر بەو کۆمەڵگایەی تێیدا دەژین تووڕەییێکی لەچارەبەدەر دەبینم . ڕۆمانی تازە بە بتوونی یەوەی ، بە تەکنیکیەوەی ، بە خودی خۆیەوەی ، بەلای منەوە یاخی بوون و سەرکێشی یەکە .

لەم سالانەی دواییدا درەوشانەوەو لەبرکوژانەوەی ڕۆمانی تازە ، نەمان و لەتۆمەری نەمانی ئەوەناگەیێنێ کە شتێکی دەستکردو داتاشراوە . من لامءوایە ڕۆمانی تازە ، ئەوەندی خوێندوومەوەو لێیدەزانم ، دەنگی ناچاری و ناگوزووری یەکە . پێموایە ڕۆمانی تازە لەم بیست ساڵەی دواییدا کە دادێ ، ڕێبازی خۆی دەدۆزێتەوە . من مەزەن ناکەم ئەم هەموو هەوراز و نشێو کردنە ، ئەم بەوراز هەڵکشینە خاوەن کەسانی زۆر بەبەهاو ژێهاتی یە ، سەڵت و قولت تەنیا هەر بۆ لە تەکنێك گەڕان بێ . لە ولاتێکی کەمفراژیکردوودا ناچاری و ناگوزووری ئەوتۆ هەن ، تەنانەت پال بە منیشەوە دەنێن لە سنووری ڕۆمانی لەباو بترازێم . من کە بەجۆرێ لەگەڵ شێوازی ئابووریی تازەدا ، لەگەڵ شێوازی کۆمەلایەتیی تازەدا ، لەگەڵ شێوازی سایکۆلۆجی یەتی تازەدا ڕووبەڕوو دێم ، بە تەکنیکە کۆنە لەباوەکان ، لەو ئینسانانەی لەگەڵیاندا دەژیم ، نادوێم . باشە ، ئەمە منێ بەرەو تەکنیکێکی تازە ، بەرەو دەربڕینێکی تازە ، بەرەو دامو دەزگایەکی تازە ناچاربکا ، ئەی چی لە ڕۆماننووسی ولاتە پێشکەوتەکان ناکا . ئەگەر گەشەو پەرەساندنی تازە ، ئەو هەل و دەرفەتە تازانەی بۆ مرۆ هەڵدەکەون ، ڕۆماننووسان بەرەو ئەوە ڕادەن ، لە دنیای تازە بگەڕێن ، ئەوە بۆ ئەدەبیات شتێکە بەدەگمەن هەڵدەکەوێ .

سنووربەزاندنی ڕۆمانی لەباو ناچاری یەکە . دنیاکەمان ، هەموو ڕۆژێ یا نموونەی ئینسانی لەبار (ایجابی) یا نموونەی ئینسانی نالەبار (سلبی) دەخولقێنێ . ئەو مەسەلانەی لە بەردەم ئینسانی یەتدا زەق دەبنەوە ، هەموو ڕۆژێ ، بەرەبەرە زیاددەکەن . خۆ ئیتر کار لەوە ترازاوە هونەر لە تەکینکێکدا ، یا لە چەند تەکنیکدا زیندان بکرێ . بەلای منەوە ، بەرانبەر بەم تاوە سەرسووڕێنە لێکۆڵینەوەی ڕۆماننووسە تازەکانیش ، تەنانەت سنووربەزاندنیشیان

هێشتا هەر سست و کزە . دەبوو دەستماندا با لێکۆڵینەوەی زۆرترو جۆراوجۆرترو دەوڵەمەندتر . من تەنانەت ئەزموون و تاقیکردنەوەی ڕۆمان نووسە تازەکانیشەکەم و یەکفەوا دەبینم . دەبوو پێمان لە ئیمکاناتی تەرزتر داگرتبا . نەك هەر ڕۆمان نووسە تازەکان ، هەموومان . بەداخەوە هونەری ڕۆمان موحافەزەکارترین هونەرە . چونکە لەسەدا سەد بە پێشکەوتنی مرۆڤایەتی یەوە بەندە . هیچ کاتێ وەك تەکنیك لە نوای مرۆڤایەتی یەوە نارِوا . تەنانەت وەك شێوازیش ... من لەبەر ئەمە ئەگەر کاری ڕۆمان نووسە تازەکان بە زۆر تەرزو زۆر چەشنیش نەبینم ، لێکۆڵینەوەکانیان بەکەوشەن و سنووریش بن ، هەر پیرۆزبایی یان لێ دەکەم . ئاواتی هەرەزۆرەوەیە کە سەرکەوتنەکانیان گورج و خێرا بەدی بێن .

● لەگەڵ تەکنیکدا (شێواز ، بیچم ، هتد .) زانستانە تا چ ڕادەیەك هاوپێوەندن ؟

— شتێکی ئاشکرایە ، شتێکە زۆر گوتراوە . با منیش بیڵێم . ئینسانی تازە کەرەستەی تازەو بیچمی تازە دێنێتە گۆڕێ ، ئەمە ناچاریە ، لێهەڵاتنی بۆ نیە . من وەك ورياو دریایەك لە بیچمی نوێ دەگەرێم . ئەو شتانەی ڕۆمان نووسانی چەرخەکەمان دایانهێناوە زۆریان لەسەر دەوەستم . بیر لە لێکۆڵینەوەی شێوازە کلاسیکەکانیان ، لە جیاوازی و فەرقی شێوازەکانیان ، لە لێکۆڵینەوەی ڕشت و بیچمەکانیان ، لە جیاوازیی بیچمکانیان ، بیر لەمانە هەموو دەکەمەوە . لەپاشان ، زۆر لە تایبەتەکانی دەوروبەری خۆم ، لە تایبەتێتی خۆم دەفکرم . زۆر هەوڵدەدەم تا دواپلە لەگەڵ خۆمدا بمێنمەوەو بەخۆمەوە بگیرسێمەوە . بروام بەوەیە کە هەر ئەمە بیچم و شێوازی خودی خۆم بۆ دەرەخسێنێ . زۆر لەسەر بیچم و شێوەی دەربڕین و قسەکردنی دەوروبەری خۆم ڕادەمێنم و لەسەریان دەوەستم . لە هەرەتی لاوێتیشمدا ، وەك پیاوێکی زانا گەلێکم کارلەسەر بیچمی دەربڕین کرد . ئەنەدۆڵ جێگایی چوونزەرەکردنی زۆر بیچە دەربڕینی تەرزو جۆراوجۆرو دەوڵەمەندبوونی فرە قسە ڕەنگینی یە . قسە ڕەنگینی لەناو خەڵکی ئەنەدۆڵدا داوو دەستوورێکی گەورەو هەمەچەشنەی هەیە . لە یۆنانستانی کۆنەوە بگرە تا هیندستان ، لە فریکی کۆنەوە بگرە تا هیتیت ، پاشەڕۆی دەربڕین و داستان و ئەفسانەی زۆر ئاوەدانی (حضارة) ئەمڕۆکە بەئاشکرا ، لە ئەنەدۆڵ دەدۆزینەوە . وابزانم لە کەلەپووری دەربڕینی وڵاتەکەم گەیشتن ، بە بیچم و شێواز گەیشتنی ، بیچم و شێواز دەربڕینێکی نوێ بۆ من بەدیدەهێنێ . پێش ئەوەی دەست بە ڕۆمان نووسین بکەم خولیای بەدووای بیچی دەربڕیندا هەڵوەدا بوونم تێدابوو .

● کێیە نووسەر لە هەمووان پتر کاری لە نووسینەکانت کردووە ؟

— ژماردنی یەکەبەیەکەی ئەو نووسەرانەی کاریان تێکردووم کارێکی سەخت و ناهەموارە . ئەوانەی ئێستاکانێ کتوپڕ بەبیرمدا دێن ، دەژمێرم . کتێبی «دۆن کیشۆت» دەسکەلای دەستمە . لە ڕووی بیچمەوە کەڵکم لە ئەلێکساندەر دۆماس فیلس وەرگرتووە . (ئیلیادە)و (ئۆدیسە) ئیرووی وڵاتەکەی خۆمە . وڵاتی من ، تائتستایش ، داب و نەریتی داستانبێژیی تێدا دەژی . ئەمە لەناو تورکمان و کورددا لەم وڵاتە زۆر ئاشکرایەو سێ‌ودووی لێ ناکرێ[1] . تەنانەت تائێستایش ، نووسەرێکی کە لە هەمووانم پتر بەدڵەوە چووە ستانداڵە . چیخۆفیش کاری تێکردم ، ئەوەی لەم ساڵانەی دواییدا کاری تێکردووم ناڵێم ، بەلام ئەوی هەست بە خزمایەتی یەکی نزیکی دەکەم و حەیرانی بووم فۆلکنەری ڕۆمان نووسە . ڕاستەقاتیچێتی یەکەی فولکنەرم بۆ خۆم خۆماڵ کردووە . کە لەگەڵ ژیانێکیدا بە ئەستووری و خەست و خۆڵی تێیدا م ، بەراورد دەکەم ڕاستەقانیچێتی یەکەی فۆلکنەرم لە هی هەمووان بەڕاستتر دەبینم . ژیان و گوزەران ، بڕوانی یە خەڵکی تر ، زۆرتر لەوەدەچێ کە فۆلکنەر دەیلێ . ئینسانەکانی فۆلکنەرم زۆر بێ واقیعی تر دێنە پێش چاو ، من فۆلکنەر ، وەك هەمووکەس پێی وایە ، بەوە نازانم کە وەستایەتی بۆ وەستایەتی دەکا . بەوەی نازانم کە وەستایەتی بۆ ئەوە دەکا پێی بڵێن وەستا . من شێوە دەربڕینی ئەو بە زگماك دەبینم . بە جۆرە هۆمیرۆسێکی دادەنێم . هۆمیرۆس سەردانێکی ئەم چەرخەی کردبایەن ، پێم وایە دەم‌ودووی وەك دەم‌ودووی فۆلکنەر دەبوو . وەك ئەو قسەی دەکرد . بەلای منەوە ، هۆمیرۆسیش و فۆلکنەریش ، هەردوکیان لە یەك سەرچاوە ئاودەخۆنەوە . بە یەك شێواز ڕاز دوردەبڕن . باری سەرنجی دنیایان زۆر لێك دەچن . لام وایە فۆلکنەر ، نەك هەر

ڕۆمان‌نووسی ئەم چەرخەمانە ، بەڵکو داستانبێژی گەورەی ئەم چەرخەیە . لە هەموو ڕوویەکەوە ... لە دەستم هاتبا ڕێگای فۆلکنەرم وەبەردەگرت ، یا ئەگەر زووترم ناسیبا پترم سوود لێ وەردەگرت . وێڕای ئەوەش لە بوونی داستانبێژێکی گەورەی وا ئەم چەرخەدا زۆر مفەتبارم . دلشادم . گەزگەز بالادەکەم .

● **ڕیالزمی سۆسیالیزم ، وەك لێشاوێکی ئەدەبی کاری تێ‌کردووی ؟**

— کەم ڕۆمان‌نووس هەیەلەم چەرخەدا ڕیالیزمی سۆشیالیزم کاری تێ‌نەکردبێ ، یا بیری لە ڕیالیزمی سۆسیالیزم نەکردبێتەوە . جا سەقەت بێ ، هەڵە بێ ، لەبار بێ ، نەبێ ، ڕیالیزمی سۆسیالیزم بیروباوەڕێکە چەرخەکەمان هێناویە . پێم‌وانیە زۆری کار تێ کردبم ، بەلام زۆرم بیرلێ‌کردەوە . ئەویشم‌پێ شتێکی دەست‌هەلبەست نیە . ئەویش ئیمکانێکە . کام بیروبڕوا دەگری ، کە کۆمەڵ بە وشکەسۆفیێتی دەستەودا‌وێنی بوو و بەرەو وشکەسۆفیتی‌و حەمبەلێتی پاڵ پێوەنا ، بە دەرخ‌و لەبەرکردن پێوەی گێژبوو ، ئەوەندەی‌تر لایەنە هەڵەکانی لێ ئاشکرا دەبن . ئەگەر هاتوو یاساو دۆز بوو ... خۆ ئەگەر هاتو بیروباوەڕ ، وەك دۆزو ڕەچەتە بەسەر هونەرمەنددا ، بەزۆری زۆرداڕەکی داسەپێندرا ، ئەوە ئەوساکە وردو باریك دەگاتە نالەباری (سلبیە) .

● **بۆچی هێندە تێکەڵ بە سیاسەت بوون ؟**

— چەندین ساڵ ئەندامێتی کۆمیتەی ناوەندی‌و سەرۆکایەتیی کۆمێتەی‌پڕوپاگاندەی پارتی سۆسیالیستی کرێکارانی تورکیام کرد . ئەم حیزبە لە ساڵی 1972دا داخرا . بۆنەوەی سۆسیالیزم بە جەماوەرانی گەورەو بەربڵاوی خەڵك بگەیێنێ ڕەنجێکی زۆرو زەوەندەی بەخەرجدا . هەروەك لە سەرەوەش گوتم ، تا تەکنۆلۆجی‌و ملکایەتی‌و فەرمانرەوایی لە دەست چینی لە ڕەسەنایەتی داشۆراوی نەخۆشی بیانی کەوتەدا بمێننەوە ، دنیاکەمان لە خراپە ڕزگاری نابێ‌و حاڵمان لەمە پەرێشانتر دەبێ . جوانترین شتی سەر ئەم دنیایە ، کە تیرەی مرۆ ڕەخساندوویە لەناودەبا . بۆ بەرژەوەندی تەسك‌و تروسکی خۆی بەکاریان‌دێنێ . بۆ کێچێ لیفەیەك دەسووتێنێ . لەبەر شێتی‌و سەرەڕۆیی خۆی ، هەرکە تەنگەتاو دەبێ دنیاکەمان لەناودەبا . نیشانەی ئەم شێتی‌و سەرەڕۆیی‌یەی ، هەموو ڕۆژێ پتر بەدیاردەکەوێ . بۆ ڕزگارکردنی‌مرۆی چەوساوەی تورکیی ، بۆ ڕزگارکردنی سروشتی تورکیا ، تەنیا هەر هێزی نووسەرایەتی بەش ناکا . نووسەری وڵاتێکی کەم‌فراژی ، نووسەری وڵاتێك کە بە هەموو داراییەکیەوە تووشی بەرەو ویرانبوون ، بەرەو خاپوورکران هاتبێ ، ناچارە بە کردەوە بچێتە ناو کارەوە . من هەوڵمدا ڕۆمان‌نووسی‌و سیاسەت ، تا حیزبەکەم داخرا ، یەك‌بخەم . لەمەوپاشیش کاری سیاسیشم هەر دەبێ . جا بە بەهای چ‌دەبێ با ببێ . هیوادارم تەواوی هونەرمەندان ، بۆنەوەی دنیاکەمان لە تۆرودا‌وی وێرانکاری‌یەك قوتارکەین بە کردەوە بەکاربکەوین . هونەرمەندان بەرانبە بە هەموو شتێ لەم دنیایەدا ، هێشتا زۆر بەکارن . خەڵك هەمیشە حیسابیان بۆ دەکا . حیساب بۆ هێزو توانیان دەکا . حیسابی بۆ شیرینکاری‌یان کردووەو لە ڕێزلێنان‌و کرداردا پلەو پایەی هەرە سەروویان داونێ . هونەرمەندان لە گۆڕینی جیهاندا ، گیان بەسەر دەستەوە ، دەبن بە هاریکاوو یاریدەدەری خەڵك . دیارە ئەوانەی بۆ گۆڕینی جیهان تێ‌هەڵناچن ، هونەرەکەشیان ناگۆڕێ . ئەوانەی لە ناخی خۆیاندا باوەڕیان بە گۆڕانی جیهان نیە ، بۆ گۆڕینی جیهان بەکارنین‌و کۆمەگی گۆڕینی ناکەن ، لە هونەرەکانیشیاندا گۆڕانی گەورە گەورە بەدی ناهێنن . لەمەوەپاش وادەبێ ، چونکە جیهان لە سەردەرانەی تێداچوون ، گۆڕاندا وەستاوە .

● **ئەرکی ڕۆمان‌نووسێ ، هونەرمەندێ لە وڵاتێکی کەم‌فراژیدا چیە ؟**

— لە وڵاتێکی کەم‌فراژیدا بوون بە نووسەر ، بەکەڵکی‌چی‌دێ ؟ ئەم پرسیارەم ساڵەهای ساڵ لە خۆم کرد . ماوەیەکی زۆر بڕوام وابوو کە هونەرمەندایەتی کارێکی لۆکسەو خۆم بە شتێکی بێ‌بایەخ دەزانی . لەپاشان سارتەریش گوتی ، لە وڵاتێکی کەم‌فراژیدا ، پیاو چ ڕۆمان‌نووس بێ ، چ فیزکار بێ ، وەك یەك وایە . ماوەیەك ئەم بیرە سەرومڕ دایگرتبووم ... لە قەڵەم ڕاوەشاندنی ئەو هەموو ساڵەم شەرمەزار بووم . سارتەر هەقی بوو . هونەر چی بۆ ئینسانانی ئازوردەو مەینەت‌دیدەو برسی‌و دەسکورت‌و بێ‌بژیو دەکرد .. چ‌سوودێکی دەبوو ... ئێکجار بۆ یەکێکی وەك منی بە کردەوە

وەخت و کاتی ... خۆی چۆن بۆ شتێکی بەکارنەهاتووی وا بەخەرج دەدا ؟ بەڕاستی ماوەیەك بۆژە بووم . بەڵام کارو کردەوە ، پەیدابوون و خوڵقان بە خۆی هێنامەوە بە بەرەنجامە گەیشتم کە هونەر بۆ وڵاتێکی کەمفراژیش پێویستە و ئیدی ئۆقرەم هاتێ و ئارامم گرت . ڕۆمان چەند بۆ ئەوروپا پێویستە بۆ ئێمەیش ئەوەندە پێویستە . ئەوەی وەك ـ ڕۆماننووسێ بەسەرمی هاتووە ، لە زۆر وڵاتی کەمفراژیدا بەسەر هیچ کەسێ نەهاتووە . ئەو هەموو چەرمەسەرییەی حوکمڕانانی تورکیا بەسەریان هێناوم ، هەر لەبەرئەوەیە ، چونکە نووسەرم . لەبەرئەوە نیە کە کارێکی سیاسییە بەسەرم هاتووە .

ئەو زوڵم و زۆرە لە مرۆڤایەتی بەدەرەی ، بەدرێژایی ژیانێ ، لەسەر دەستی حوکمڕانانی تورکیام چێشتووە ناکرێ هەمووی هەڵڕێژم ، زۆری دەوێ . ئەم زوڵم و زۆرەیان هەر تەنیا لەبەرئەوە لێ کردم ، چونکە لەگەڵ گەلەکەمدا یەکم گرت ، بووم بە نووسەری . ئەو زوڵم و زۆرەی بیست ساڵەی دوواییدا لێم کراوە بێتو ڕۆژێ لە ڕۆژان بینووسم ، هەر بەڕاستی ئینسانەتی لە ئینسانەتیی خۆی شەرمەزار دەبێ . ئەوانەی لەم هەشت مانگەی دوواییدا بە من کراون ، لەوڕووەوە کە نووسەرێ لە وڵاتێکی کەمفراژیدا چی بەسەر دەهێندرێ ، سەرنج بزێون . (1) لە مانگی مایسدا بێپرس و پرسیار گیرام . مانگێ لەژوورەوە بووم . لەپاشان بێئەوەی هیچ بگوترێ بەردرام . (2) پاش ئەوەی لە زیندان دەرچووم ، دووای چەند ڕۆژێ ، هەژدە مانگیان حوکمدام . ئەمەیش هەر لەسەر ئەوەی کتێبێکی ئەمیلە برنووسم وەرگێڕابوو . (3) ژنەکەمیان ، بێئەوەی هیچ وەختێ ، بە هیچ ڕەنگێ ، خۆی لە قەرەی کارێکی سیاسی دابێ و تەنیا هەر سەبارەت بەوە ڕۆمانەکانی کردووم بە ئینگلیزی و ژنی منە ، بە سەیرو سەمەرەترین ئیددیعای دنیاو کەڕوفزیی نامرۆیانە ، چوار مانگیان خستە ژوورێ . مەحکەمەکەی تائێستایش هەروا درێژەی هەیە . (4) ڕۆمانی «ئینجە مەمەد» ، کە لە تورکیا بە بەبرەوترین ڕۆمان دادەنرێ و هەر بەرناکەوێ ، بڕبڕ ، بە ڕادیۆ بڵاودەکرایەوە . لە شەشەم ڕۆژی بڵاوکردنەوەیدا یاساخ کرا . هەر ئەو ڕۆمانە فیلمی سینەماکەیشی لە تورکیا قەدەغەکرا . بەشێکی زۆری نووسینەکانم کە بۆ سینەما ئامادە دەکران ، ڕاگیران . لە کاتی بچووکترین هەراو بزاوتی خەڵکدا پۆلیس بە هەیت و هووت و خۆپێشاندانێکی سەیرو سەمەرەوە ماڵەکەیان کون بە کون پشکنیم . لەم هەشت مانگەی دوواییدا ماڵەکەم سێ جار ، کتێب بە کتێب ، کون و کەلێن گەڕان . (5) لە تورکیا هیچ قانو ونێ نیە لەمەوپاش داکۆکێ لە من بکا . یاساو دۆزی چینی فەرمانڕەوای تورکیا ، لە هیچ ڕوویەکەوە لە بەرژەوەندی من نیە . لە تورکیا دەتوانرێ هەموو شتێ لە من بکرێ ... ئەمە بە قانوونی ئەو وڵاتە بێقانوونی نیە . چونکە من نووسەری گەلەکەمم . گوناهم هەبێ نەبێ ، هەرکاتێکی ویستیان دەتوانن بمگرن ، ڕەهەندەم کەن ، ماڵم بپشکنن ... بۆ کردنی ئەمەیش پێویست بە هیچ ڕوخسەتنامەیەك ناکا ... ئەمانە هەموو ، ئەم زوڵم و زۆرەی لە من دەکرێ وادەگەیێنێ کە ئەدەبیات لە وڵاتێکی کەمفراژیدا بەکاری شتێك دێ . ئەدەبیات لەمجۆرە شوێنانە بەکارنەهاتایە ، چینی حوکمڕانێك ئێکجار بەوجۆرە دەکەوتنە گیان و وێزەی هونەرمەندێ ؟ .. قەت یاساو دۆزێ خۆی بەوڕەنگە پێخوست دەکرد ، بۆ زوڵم و زۆر کردن لە ئینسانێ ، بۆ ئازارو ئەشکەنجەدانی ئینسانێك خۆی بەمحاڵە دەگەیاند ؟ کەواتا ئەدەبیات لە وڵاتێکی کەمفراژیدا زۆر بەکارە . بۆ ئیسپاتی ئەمە ، لەوەی بەسەرم هاتووە زۆر دڵشادم ، ئێستا زۆرم دڵ خۆشە . کەواتا ئەدەبیاتەکەم بەکاردێ ، کەواتا ئەدەبیاتێکی ، ڕك و کینەی چینی حوکمڕانم بەم ڕادەیە تووش کا ، لە وڵاتێکی کەمفراژیدا زۆر بەکاردێ . ئەو زوڵم و زۆرەی بە من کراوە سارتەریش و منیش بەدرۆدەخاتەوە . لەبەرئەوە دەبێ پتر خۆ بە ئەدەبیاتەوە هەڵواسین .

---

1 ـ یەشار کەمال لە وتارێکدا بەناوی (HAIKASIgI) زۆر بەدرێژی باسی داستانبێژیی کورد دەکا . لە وتارێکدا کە بە کوردی بڵاوبۆتەوەو لەسەر داستانبێژیی ناظم حیکمەت دەدوێ ، داستانی گەورەی ئەحمەدی خانیی نەمری بە نموونە هێناوەتەوە لە ئەدەبیاتی کورددا .

(وەرگێڕ)

# كـاروانـى رۆشـنبيـرى لە كوردستاندا

## لـە هـەولـێـر

شوان : ئامادەى كردوە

« پێشانگايەكى هونەرى تەشكيلى »

رۆژى سێشەممە 1983/3/1 لە هۆڵە خنجيلانەكەى كۆلێژى ئيدارەى سەر بە زانكۆى صلاحالدين ، پێشانگايەكى هونەرى تەشكيلى هونەرمەند فەرهاد حامد عثمان بە ناوى [مرۆڤ و ئاواتەكانى] بۆ ماوەى سێ رۆژ نيشاندرا ... ميوان و ئامادەبووانى پێشانگاكە بەو پەڕى هێمنى و شەوقەوە نيگاى تيژى تێبينى هونەرمەندانە و چەپكە تشكى زەوقى خۆيان بەسەر يەكە يەكەى تابلۆكاندا دەڕژان .

پێشانگاكە ئەگەرچى كەوتبووە پەنا چەپەرێكى فەرامۆش كراوى كۆلێژەكەوە ، بەوەش دەرفەت و ماوەى سەردانى بۆ ميوانەكان وەك پێويست نەڕەخسابوو ، كەچى لەگەڵ ئەوەشدا بەشى خۆى لە هونەر دۆستان هاوبەشيان تياكرد .

قوتابىى هونەرمەند فەرهاد پەيتا پەيتا پێشوازى ميوانەكانى دەكردو ئاشكراتر تيشكى ڕووناكى بيروڕاى تايبەتى خۆى ئاراستەى تابلۆكان دەكرد ... ئەوى جێى سەرنج و شياوى باسە پێشانگاكە بە سێ جۆر دەوڵەمەندو ڕازێنرابووەوە .

يەكەم : تابلۆ زەيتيەكان ، بەڕاستى سەليقەيى و وردى و دەست ڕەنگينى هونەروەرى نەخشاندبووى و خۆى لە تابلۆى [دڵێ دايك ، ئاسمانى گۆڕاو ، هێز لە يەكێتى دايە ، ئافرەتێكى سەرەنگ هۆز] ڕەنگى دەدايەوە .

دووەم : تابلۆ ئاوييەكان ، ئەم تابلۆيانەش لايەنێكى گرنگى خولياى پيرۆزى هونەروەرى فەرهادى دەردەخست ، ئەو تابلۆيانەى بەر ئەم خانەيە كەوتبوون [ئاواتێكى ڕوون ، مرۆڤێكى نەخۆش] بوو .

سێيەم : تابلۆ هێڵيە خەڵوزيەكان (لوحات تخطيطية) ... هونەرمەند لەم بوارەدا بەهرەو لێهاتوويى تەواو پێوە ديارە و ئەو تابلۆ (خەڵوزى)يە ڕەشيبانەى لە پێشانگاكەدابوو ، بە شێكى ديار و گەورەى بەرهەمى فەرهادبو ، زۆربەيان لە ژيانى واقيعى كۆمەڵگاى كوردەوارىيەوە نزيك بوون وەك تابلۆى [ئازارى زيندان ، ئەحمەدى خانى ، دەرويش عەبدوڵڵا ، مرۆڤ و كاركردن ، برسێتى] .

هونەرمەنە فەرهاد حامد وەك هەموو خونچەيەكى تازە پشكوتوو بە پشت ئەستوورى و هيوايەكى گەورەو بڕوايەكى بەهێزەوە باوەشى بۆ ژيانى هونەرىو داهاتێكى ڕۆشن كردۆتەوە ، بۆيە لەم سەرەتايەيدا سەيرنىيە پەل و پۆى بەهرەو توانای هونەرمەندانەى پەرتەو ڕووى لەگەڵ بوارى هونەرى نەخش و نيگار كردوەو سێ جۆر وێنەى دەستى (زەيتى و ئاوى قەڵەمى خەڵووزى) لە پێشانگايدا ئەبنيرا ، ئەم دياردەيە لەوەشە تا هەورازێكى قوچ بڕ بكات كەچى تاقيكردنەوەكانى ژيان و ڕۆژگار ، ئەو ڕاستىيەى سەلماندوەو ئەسەلمێنى كە پسپۆڕى لە بوارێكدا زياتر و باشتر گەشەى پێ دەدرێ پەرەدەسێنىو دەخەملێ و ئاكاميش سەركەوتنى دوايى مسۆگەر ئەكات .





* فەرهاد حامد عثمان .
* سالی 1962 لە گوندی گابەڵەکی سەر بە پارێزگای کەرکوك لە دایکبووە .
* خوێندنی سەرەتایی هەر لە گوندی گابەڵەکە تەواوکردوە .
* پلەی خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی لە شاری هەولێر تەواوکردوە
* ئێستاش قوتابی پۆلی یەکەمی کۆلێژی ئیدارەیە لە زانکۆی صەلاحەدین .

**چالاکی هونەری**

1 _ سالی 1976 بویەکەم جار چەند وێنەیەکی رازاوەی هونەری لە قوتابخانەی سەرەتاییدا پێشکەشکردوە .
2 _ سالانی 1978 ، 1979 ، 1980 بەچەند تابلۆیەك بەشداری پێشانگای قوتابخانەکانی هەولێری کردوە تابلۆکانی بە پلەیەکی بەرز دەرچوون .
3 _ سالی 1981 لەگەڵ هونەرمەند سەرهەنگ ناصح پێشانگایەکی تایبەتیان لەشاری هەولێر کردوتەوە .
4 _ دوا بەرهەمی هونەریشی ئەم پێشانگایەیە کە بە ناوی [مروڤ و ئاواتەکانی] یەوەیە .

**هونەرمەند فەرهاد حامد عثمان و چەند پرسیارێکی پەلە :**

پ١) سەبارەت خۆت چ هۆیەکی کاریگەری دیار بووە هۆی هەوێنی مەیاندنی هونەری ؟

و١) من وەك مرۆڤێکی ئاسایی سەرەتای ژیانی منالیم لە لادێ بەسەربردوەو تەنگەو چەڵەمەکانی ژیانی لادێو بەسەرهاتی گوندەکەمان لە هەموو شتێك زیاتر کاری لەژیانی هونەریم کردوە .



پ٢) پەسندترین کاری هونەریی رابوردوو بە لای خۆتەوە کامەیەو بۆچی ؟

و٢) باشترین کاری هونەری بەلای خۆمەوە تابلۆی (دوورمان - کارکردن)ە کە لە سالی 1979دا لە پێشانگای قوتابخانەکانی شاری هەولێردا پێشکەشمکردو لە هەمان کاتیشدا بۆ پێشانگای قوتابخانەکانی عیراق لە بەغدا هەلبژێرا ... دیارە خۆشەویستی ئەو تابلۆیە لەو روانگەیەوە سەر هەڵ ئەدات کە ژیان و واقیعی کوردەواریمان نیشان ئەدات .

پ٣) سەرەتای ژیان و کاری هونەریت چۆن دەستی پێکرد ؟

و٣) لە سەرەتای دەستپێکردنی ئەم هونەرەوە لایەنی ئەو جۆرە وێنانەم ئەگرت کە تەنیا بەقەڵەمی رەش (خەڵوزی) ئەکێشران و نەخش ئەکران .

بەلام لەم سالانەی دواییەدا دەستم کرد بە وێنەکردنی تابلۆ لەسەر رێبازی نوێ ، واتە (الفن الحدیث) یان وەك ئەڵێن (اکادیمیة الرسوم) و زۆربەی تابلۆکانم بە تایبەت لەم پێشانگایەی دواییەمدا (الوان مائی) ن ، ئەمەو سەرەرای ئەوەی چەند تابلۆیەکم بە چەقۆ وێنە کردووەو بەلای خۆمەوە ئەم رێبازەی ئێستا لە سەری بەردەوامم ، یەکێکە لە رێبازە تازەکانی وێنەکێشان .

پ٤) ئاشنایەتیت لەگەڵ ئەم رێبازەدا چۆنەو لە بەرچی هەڵت بژاردووە ؟

و٤) نەك هەر ئاشنای ئەم رێبازەم ، بەڵکو شەیدای ئەم جۆرە هونەرەم کە پەیرەوی ئەم رێبازە تازەیە ئەکات ، چوونکە هەر تابلۆیەك کەوێنەی ئەکەیت مانایەکی رێك و پێکی دوور لە تەم و مژ ئەدات بە دەستەوەو لە هەمان کاتیشدا جۆری گیرو گرفتەکان و چارەسەرکردنیشیا ن نیشان ئەدات .

**چاوپێکەوتنێکی پەلە لەگەڵ ئەندازیار ئەحمەد نادر**

پ١) لەناو تێکرای بەشەکانی هونەردا چۆن و لەبەرچی هونەری فوتوگرافت هەڵبژاردو هوگری بوویت ؟ .

و١) ئەتوانم بلێم فوتوگراف زمانێکی جیهانییەو هەموو نەتەوەیەك بە ئاسانی ئەتوانێ تێ بگات و بیخوێنێتەوە ، دەست نیشانی واقع ئەکات ، منیش هەر لە منالییەوە شەیدای ئەو جۆرە خولیایانە بووم ، تا هەموو مروڤێك بە ئاسانی و زوو لێم بگات .





پ) له چ روانگه‌یه‌كه‌وه ئه‌ڕوانیته ئاوێته كردنی هونه‌ری فۆتۆگراف و پیشه‌ی ئه‌ندازیاری ؟ .

و) فۆتۆگراف خۆی له خۆیدا به‌شێكه له هونه‌ره جوانه‌كان و ئه‌ندازیاریش هه‌ر هونه‌ره و خزمایه‌تیه‌كی پته‌ویان له نێواندا هه‌یه و تێكه‌ڵ بوونیان ئاسان و ئاساییه ، بۆیه بۆ ڕوونكردنه‌وه و ده‌رخستنی گه‌لێ لایه‌نی ئه‌ندازیاری ئه‌توانین روو بكه‌ینه هونه‌ری فۆتۆگراف .

پ) له چ ساڵێكدا ئه‌م هونه‌ره داهاتوه و خانه‌ی شیاوی خۆی پێ براوه و له‌م رووه‌وه رۆڵی تایبه‌تی خۆتمان بۆ ده‌ست نیشان بكه ؟

و) هونه‌ری فۆتۆگراف دوای ساڵانی 1880 په‌یدابوو ، له سه‌ره‌تادا شێوه‌یه‌كی ساكار و لاوازی هه‌بوو ، كه‌چی ئه‌وه‌نده‌ی نه‌برد و دوای ساڵی 1900 ئه‌م هونه‌ره ئاوێته‌ی ژیانی مرۆڤ بوو ، تائێستاش رۆڵێكی گرنگ و ناسك ئه‌بینێ و خزمه‌ت گوزارێكی گه‌وره و بێ‌فیزه و وه‌ك سه‌ربازێكی نه‌ناسراووایه .

سه‌باره‌ت به ئاشنابووم به‌م هونه‌ره ، له دوای ساڵی 1970 وه ده‌ست پێ ئه‌كات و گه‌لێ وێنه‌ی سروشتی كوردستان و كه‌له‌پووری كورده‌واریم گرتووه .

پ) له ژیانی هونه‌روه‌ریمدا ئاواتم ئه‌وه‌یه : فۆتۆگراف وه‌ك هونه‌رێكی خزمه‌ت گوزار په‌ره‌بسێنێ و زیاتر گه‌شه‌بكات و بایه‌خێكی باشیشی پێ بدرێ و هونه‌رمه‌ندانی ئه‌م بواره هه‌ر له زیادبووندابێت و تا بتوانرێ له داهاتێكی نزیكدا پێشانگایه‌كی مه‌زنی فۆتۆگرافی له ده‌ره‌وه‌ی وڵات بكرێته‌وه ، تا واقیعی بێ گه‌ردی مێژووی فۆلكلۆری كوردیمان و سروشتی كوردستان به هه‌موو دنیا بناسێنین .

## پێشانگای فۆتۆگرافی

له چالاكییه‌كانی كۆمه‌ڵه‌ی هونه‌ره جوانه‌كانی كورد ـ لقی هه‌ولێر پێشانگایه‌كی تایبه‌تی فۆتۆگرافی ئه‌ندازیاری هونه‌رمه‌ند ... ئه‌حمه‌د نادر مه‌حه‌مه‌د بوو كه له رۆژانی 1983/ 2/28 — 26 له هۆڵی كۆلێژی زانیاری زانكۆی صه‌لاح الدین نیشاندرا .

له‌و پێشانگایه‌دا (29) تابلۆی جۆراوجۆری نه‌خش و نیگاری ره‌سه‌ن و دیمه‌نی ره‌نگین و دڵفرێنی شاخ و هه‌ردو شار و گوندی كوردستانی نیشاندا . تابلۆكان به زمانێكی ره‌وانی سروشتییه‌وه ئه‌دوان ، دیمه‌نی رووداو و دیارده سه‌رنج راكێشه‌ره‌كانیان ئه‌خسته روو .

له رۆژانی پێشانگاكه‌دا پۆل پۆل قوتابیی كوڕ و كچی كۆلێژه‌كانی زانكۆی صه‌لاح الدین و هونه‌ر دۆستان روویان تێ ئه‌كرد ، به شادییه‌وه هه‌ر یه‌كه‌یان له لای خۆیه‌وه بیروڕاو سه‌رنجی تایبه‌تی خۆی به‌رامبه‌ر كه‌لتوری رابوردوو كاره‌ساتی ئێستاو دیارده چاوه‌ڕوان كراوه‌كانی داهات ده‌ر ئه‌بڕی .

فۆتۆگراف یان وێنه‌گرتن خۆی له خۆیدا به‌شێكه له زه‌وق و ئاره‌زووی خودی ته‌نیا كه‌سێ ، به‌ڵام گه‌وره‌یی ئه‌و چالاكییه و په‌روه‌رده‌كردنی ئه‌و وزه‌وقه ، بێ سه‌لیقه‌ی ورد و نیژی هونه‌رمه‌ندانه نایه‌ته دی ، كاتی خه‌ملاندنی ئه‌وا ئه‌م خواسته خودییه شێوه‌یه‌كی هونه‌ری به‌روز به‌تام له ئامێز ئه‌گرێ و دیمه‌تی ژیانه واقیعی یه‌كه بێ رتووش و رازانده‌وه‌یان شێواندنی له به‌ر چاو دائه‌نێ . خۆ ماندوكردن و سووتاندن بۆ ئه‌م كاره ئاره‌زومه‌ندیه ، كالایه‌كی هونه‌ری ره‌نگینی پێ ئه‌پۆشێ و خانه‌یه‌كی تایبه‌ت و شیاوی له سامان و كه‌لتووری میللیدا پێ ئه‌برێ .

تابلۆكانی ئه‌ندازیاری هونه‌رمه‌ند ئه‌حمه‌د نادر خۆی له سێ به‌شی سه‌ره‌كیدا ئه‌بینیه‌وه :

یه‌كه‌م : تابلۆی دیمه‌نی سروشتی شاخ و ئاو و دار و به‌رد و شوێنه‌واره مێژوویه‌كان ، ئه‌و دیمه‌نانه‌ی له دوا رۆژدا واقیعی



ڕاستەقینەی سروشتی دەرئەخات ، تابلۆکانی پردی دەلال ، هەولێر ، توولەڕێ ، زانکۆی سلێمانی سەفین ، لەو خانەیەدا جیان ئەبێتەوە .

دووەم : تابلۆی ئەو دیمەنانەی ڕێکەوت ئەیان ڕەخسێنێ ، پیاوێکی دیوانەی وێڵو سەرگەردان ئەسوڕێتەوە ، پیرەمێردێك بەڕەنجی شانی خۆی ئەژێو دەست بۆ کەس پان ناکاتەوە لە جۆری دووەمە .

سێیەم : تابلۆی ژیانی سروشتی خەڵکی ناوچەکە ، وەك تابلۆی ، دیمەنی یاریو دیلانێی منالانی کورد ، ئاهەنگی زانکۆ ، منالەکات ، ئاوڕدانەوەیەك لە ڕابوردوو ، لە جیاتی باوکم ئیش ئەکەم .

تێکڕای تابلۆکانی هونەرمەند ڕەنگدانەوەی ڕاستەقینەی واقیعی ژیانو باری دەروونیو ڕەنجو ئیشو خواستە کۆمەلایەتیو ئابووریەکان نیشان ئەدەن .

تابلۆکان هەروا ئاسایی و بێگیان نەبوون ، هەریەکەیان لە ئاستی خۆیانەوە ئارامیان لە بەرهەڵگیرابوو زمانیان گرتبوو ، دەنگیان بەرزئەکردەوە ، لەگەڵ ئاوازی نەوایەکی هێمنو دەنگی بەسۆزو کاریگەری خالقی ئەیان وت : ئێمەش هەین لەگەڵمان بژین . جێمان مەهێڵن .

**ئەندازیاری هونەرمەند ئەحمەد نادر محەمەد**

- سالی 1955 لە شارە دێرینەکەی هەولێر لەدایك بووە .
- پلەی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیو ئامادەیی لە هەولێر تەواو کردوە .
- سالی 1977 کۆلێژی ئەندازیاری لە زانکۆی سلێمانی تەواوکردوە .





- ئێستاش ئەندازیارە لە (دائرة العمارات السكنية) لە هەولێر .

**بەرهەمەکانی**

1 ـ سالی 1976 بەشداری لە بیشانگای فۆتۆگرافی فیستڤالی زانکۆکان لە بەغدا کردوە .
2 ـ سالی 1977 بەشداری پێشانگای فۆتۆگرافی زانکۆی سلێمانی کردوە .
3 ـ سالی 1977 بەشداری لەپێشانگای فۆتۆگرافی لە هاوینە هەواری صەلاح الدین کردوە .
4 ـ لە ڕۆژنامەی (العراق) لە گۆشەی [اجواء كردية]دا چەندین وێنەی فۆتۆگرافی سروشتی کوردستانی بۆ بلاوکراوەتەوە .

# لە سلێمانی

**. ئاسۆس . ئامادەی کردووە**

**پێشانگای هونەرمەند عەلی مەندەلاوی**

چۆن خەونی ڕەنگی منداڵانو پاکیو بێگەردی ژیانیانو بزوتنەوەی خێراو زەردەخەنەو خەمەکانیان ، لە سەردەمێکی ئاڵۆزی پڕ لە کێشەدا ئەبنە تابلۆو چۆن خۆیان لە بەردەم بەرە مووچی هونەرمەندێکی تەشکیلیدا دەبیننەوە ؟!. بۆ وەلام دانەوەی ئەم پرسیارانەو دەیان پرسیاری دی کە بەخەیاڵدا گوزەربکەن ، پێویست بوو دیدەنیەکی پیشانگاکەی هونەرمەندی کورد [ عەلی مەندەلاوی ] بکەین کە لە سەرەتای مانگی شوباتی ئەم ساڵدا لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی بۆ ڕۆژێك پیشان درا تێکڕای تابلۆکان پەیوەندیەکی ڕاستەو خۆیان بە جیهانی منداڵانەوە هەیە ، ئەو جیهانەی کە بەڕواڵەت ساکارو



ساده دێته پێش چاوو بەڵام لە ناوەڕۆکدا قووڵ‌و بەرین‌و پڕ لە کێشەی هەمە جۆرن . هونەرمەندی ناسراو عەلی مەندەلاوی لە دەمێکەوە چاوی لەم جیهانی هونەرەدا کردۆتەوەو بۆتە دۆستێکی خۆشەویستی منداڵان ، یان بەواتەیەکی دی بۆتە هاوڕێیەکی نزیکیان‌و لە یاری‌و خۆشی‌و گریان‌و زەردەخەنەیاندا هاوبەشێکی تێکەڵەو شارەزای ناخ‌و هەست‌و نەستیانە . بینەر کە لە بەردەم هەر تابلۆیەکی ئەم پیشانگایەدا دەوەستێ سەرنج دەدا هەست بە ڕاچەنینێك دەکات ، بە جۆرە ئەزوویەك ، کە تەنیا هونەرمەندی بەدەسەڵات دەتوانێ لە ناخی بینەردا بە ئەنجامی هەژینی بدات .

ئەو تابلۆیانەی کە بە تایبەت لە ژیانی منداڵی کوردەوە نزیکن‌و لە کەش‌و ئاوو هەوای داستان‌و سەرگوزشتەی کوردەوارییەوە سەریان هەڵداوە لە نێکڕای تابلۆکانی تر ئاشنای تر ئەبن بە چاوی بینەرو منداڵانی کوردستان . لەم تابلۆیانەدا کە شاخی پڕ لە هەڵەت‌و ئەفسانەی ناو چیاکان‌و ئەسپی باڵ درێژی سەر کەش‌و غارکردووی تێدا دەبینرێ ، بینەر واهەست دەکات کە جارێکی تر لەو خەونانەو لەو ئەفسانەو داستانانەدا خۆی دەبینێتەوە ، بەڵام بینینەوەی نێوان خەون‌و بە ئاگابوونەوە ، بینینەوە هەر بە نیازی گەڕانەوە بەرەو دوانا ، بەڵکوو بۆ دۆزینەوەی جیهانە نەبینراوەکان ، جیهانی قووڵ‌و ئەفسوناوی منداڵان . هونەرمەند چاوی هێندە تیژە هەست دەکەیت کام شت وردە ئەو دەیقۆزێتەوە ، کام شت وونە ئەو دەیدۆزێتەوە . دەزانێ چۆن ڕەنگەکان تێکەڵ بە یەکتر دەکاو لە یەکتریشیان جودا دەکاتەوە هەر بلبەتەو ڕەنگ‌و سیمای شیاوی خۆی بۆ ڕەخساندوە هەموو شتێ لە جێگەی خۆیدا ئارامی گرتووە . هێڵ‌و بۆشاییی‌و بزوتنەوە لە یەکگرتنێکی مەوزوعیانەدا هارمۆنیەکی گونجاو پێك دەهێنن . منداڵیش بیر کردنەوەی گەورەی خۆی هەیە . خەیاڵی فراوانی خۆی هەیە . هونەرمەند عەلی مەندەلاوی لە ڕەوتی داهێنەرانەی بەرەو پێش چووی خۆیدا دی ئەوە دەسەلمێنێ کە لەم جیهانەدا باڵا دەستە ، بە قووڵی دەڕوانێتە دیاردەکان‌و تەنیا لە ڕواڵەتی ئەو کێشانەدا گیرناخوات . [ چاوی تیژی هونەرمەندانەو خەیاڵی شاعیرانەو مەنتیقی چیرۆك نووسانە دەبنە هەوێنی زۆربەی ئەو تابلۆیانەی لەم پیشانگایەدا دەبینرێن ] ئەوەی پێویستە لێرەدا بە هونەرمەند بوترێ‌و شێوەی داخوازیەك‌بێ ـ ئەگەر بشێ بە داخوازی لە قەڵەم بدەین ـ ئەوەیە کە زیاتر پەرە بە لایەنی ژیانی تایبەتی منداڵی کورد‌و دەورو بەرەکەی بدات‌و ئاوڕی زۆرتر لە منداڵانی هەژاری کورد‌و خەم‌و ئاواتەکانیان بداتەوە . ئاوڕ لەو منداڵانەی کە زۆربەی زۆری منداڵانی کوردستانیان لێ پێك هاتووە . ئەو منداڵانەی کە لەواقعێکی یەکجار سەختدا چاویان دەپشکوێ هەر لەسەر لانکەوە بە ئازار بە کوڵ‌و هەر لە شیرە خۆرییەوە چاویان بڕیوەتە پاشە ڕۆژێکی ڕووناکتر .

به ئومێدی پیشانگای سەرکەوتوو تری هونەرمەندی ناسراو عەلی مەندەلاوی‌و پەرەسەندنی بە پیت‌و بەخشینی گەورەتری .

**تێبینی :زۆرمان هەوڵدا وێنەی چەند تابلۆیەکمان دەست بکەوێ‌و پەنانشمان**
**بردە بەر چەند هونەرمەندێك . بەڵام بە داخەوە هیچمان دەسگیرنەبوو . بۆیە داوای لێبوردن دەکەین لە ئەم چەند دێرە بێ‌وێنەن .**

### ئیسماعیل خەیات لە سلێمانیەوە بۆ هۆڵی « رواق » لە بەغدا

هونەرمەند ئیسماعیل لە خانەقین پێش 30 ساڵ لەمەوبەر چاوی هەڵهێناوە . لە تەمەنی 22 ساڵیدا قوتابخانەی مامۆستایانی لە باقووبە تەواوکرد ، ماوەیەکی زۆرەو تائێستاش ڕاهێنەری هونەرییە لە مەڵبەندی چالاکی قوتابخانەکان لە سلێمانی . ئەم هونەرمەندە تائێستا (11) پیشانگای تایبەتی خۆی پێشکەش کردوە ، لەوانە سیانیان لە بەغداو هەشتیان لە سلێمانی جگە لەمانەش لە هەمو پشانگاکانی هونەرمەندە کوردەکانیشا بەشداربووە . هەروەها لە پیشانگا هونەرییەکەی عیراقیەکانا لە یەکێتی سۆڤیات‌و وڵاتە سۆشیالیستەکانا لە ساڵی 1988 دا بەشداربووە . جگە لە پێشانگای شام‌و پیشانگای کۆمەڵەی تەشکیلیەکان .

**وائەم جارەشیان بنەو بارگەی هونەری لەگەڵ خۆیا بەرەو شاری بەغدا بردو ڕۆژی پەنجشەممە 1988/2/20 بە ئاهەنگێکی قەشەنگ لە هۆڵی رواقا پیشانگا تایبەتیەکەی**



کرایەوە . لەم پیشانگایەدا (28) کاری هونەری ڕەسەنی تێدابوو کە بریتیبوون لە دیمەنی سروشت ، مەل و باڵندە ، ئافرەت ، مەسیح و ئازارەکانی ، بێ ئارامی ، بیرکردنەوە ، مردن لە پێناوی خۆشەویستیدا .

لەم بارەیەوە ـ مەی موزەفەر ـ دەڵێ : ـ

« ئەو ڕۆژەی مرۆڤ هەستی بەوە کرد کە پێویستی بە دەربڕین هەیە خەتی دۆزیەوەو بە چاکی بەکاری هێنا ، بە هەستێکی داهێنەرانەوە بۆی دەرکەوت کە ئەم هۆیەی بە دەستیەوەیە توانایەکی مەزنی هەیە بۆ ماناگەیاندن و کارکردنە سەر هەستی بینەر . مرۆڤ بەرامبەر بە سیحری ئەو خەتە سەرسام دەبێ کە دەبینێ هونەرمەند چۆن دەست بە سەر بابەتەکانا دەگرێ . زەوی و خاکی ڕووت و قووت لای ئەم هونەرمەندە بۆتە عەشق ... عەشقێکی زۆر پیرۆز »

ئەلسیی موشیخ : دەربارەی پیشانگاکەی خەیات نوسیویە دەڵێ : « باڵندەکان بەشێکی فراوانی پیشانگاکەیان داگیر کردوە ، چونکە بوونەتە کینگل پێدانی ئەم هونەرمەندە ، هەر لە منداڵیەوە ئیسماعیل خەیات لە گەڵ مەلەکان دواوەو سەرنجی دیمەنیانی داوە ، ماوەیەك لێیان دوور کەوتۆتەوە ئەمجا گەڕاوەتەوە بۆ لایان و کەوتۆتە وێنە گرتنیان و نەخشەی کێشاون . مەل لای خەیات سەرچاوەی هێزە لە چەمینەوەی دەنووکیا ، لە تیژیی چاوەکانیا دەردەکەوێ . هەروەها هونەرمەند لە خەیاڵی خۆیا واقیع دووبارە دەکاتەوە . لە نەخشەکێشانی شارەوە دەچێتە سەر سروشت ، لە بینینی جیهانەوە ئەچێتە سەر هێڵ تەعبیری تیژو بەرەش وسپی بۆ چارەسەرکردنی واقیع .. بەم شێوەیە بۆشاییی گەردوون زیاتر تیشك دەداو مرۆڤ بەتینتر بەخاکەوە دەنووسێ . ئەشێ لەسەر ڕووی زەوی بێ بەلام چووبێتەوە ناخەوە »

هونەرمەند ئیسماعیل خەیات دەربارەی پیشانگاکەی خۆی دەڵێ :

« تابلۆکانم شتومەڕی نێوان مرۆڤ و سروشت دووپات دەکەنەوە ، ئەم پەیوەندیەش بەردەوامەو هەمیشەییە چونکە پەیوەندیەکی گەردوونی و ڕەسەنە . سەرچاوەی داهێنانی هونەرمەندە لە ڕێبازی بەدواڕاستی گە ڕاندا کە لەناخی مرۆڤدا هەیە ، ئەو ناخەی شوبهاندنی لەگەڵ شێوەکانی سروشتدا تیا بەدی دەکەم . باڵندەکان ، شیو و دۆڵ و هەردەکان ، درەختەکان ، ئەمانە هەموویان لە تابلۆکانما زماندارن نەك لە بێدەنگیدا نوقم بووبن . من کە قەڵەمی ڕەنگی لە بەرهەمەکانما بەکاردێنم مانای ئەوەیە بەردەوامم لەسەر دۆزینەوەی تواناو وزەی پتر . ئەم هۆیە لای من بەخشندەیە ، بەڕاستیش دەڵێم من بابەتی دیم زۆرە . ئەمەوێ پشوویەکی درێژم بێ بۆ نەخشاندنی شێوەکانی سروشت و حاڵەتەکانی مرۆڤ تا ئەگەمە دۆزینەوەی نوێ ترو گەردیلەی نەناسراوی تر لە سروشت و لە مرۆڤا بدۆزمەوە . سروشت لای من سەرچاوەیە ، کانیاوێکەو وشکاییی نایەت ، جوانیم پێ دەبەخشێ ، لای من جگە لە سروشت هەموو شتەکانی دی دەستکردن و ڕووتن . »

ئەوەی شیاوی باسە ئەو (28) تابلۆیەی پیشانگای هونەرمەند ئیسماعیل خەیات لە ژێر ئەم ناونیشانانەدابوون :

شوانێکی کورد ، باڵندە فیلەتەنەکە ، کاتێ مەلەکان خەمبار دەبن ، پیاوێك و پەیکەرێك ، خەون ، شوێنەوارێ لە ئەشکەوتێکدا ، بارۆکەیەکی کۆن ، بزووتنەوە ، خەوێکی قووڵ ، ڕاوچیەکی خنکاو ، سرنج دانی چیاکان ، کڵاو ، ماتەمینی کیژێکی دڵدار ، بێ ئارامی ، مەرگ ، جووت بوون لە گەڵ سروشتا ، تێڕوانین ، ئازاری مەسیح ، مەسیح مردن لە پێناوی ئەوینا ، ئافرەت و سروشت ، بیرکردنەوەی مەلێك ، مەلە خەمبارەکە ، باڵندەکانی چیا .

تێبینی : ئەم پێشانگایە لە 2/20 تا سەرەتای مارت لە بەغدا پێشان درا .

هونەرمەند ئیسماعیل خەیات وابی نیازە کە هەمان پیشانگا لە شاری سلێمانی پێشکەش بکات .



# كاروان المسيرة

مجلة ثقافية شهرية
تصدرها الامانة العامة لادارة الثقافة والشباب
باللغتين الكردية والعربية

العدد : 7
نيسان 1983



في هذا العدد



العنوان : اربيل ـ الامانة العامة للثقافة والشباب ـ مجلة (كاروان) ـ ت : 20882

## في ضوء كلمة الرئيس القائد حول الثقافة الكردية :

# الحديث عن كرديتنا ضمن اطار

كلما تحدث السيد الرئيس القائد في اي مؤتمر وفي اية مناسبة ومع اية شريحة في المجتمع العراقي ، فاننا حينما نصغي إليه بقلب سامع ونفهمه بنفس مستوعبة نخرج منها دائما بدروس واضحات كانت مستعصية على افهام البعض قبل ذلك لان الكثيرين منا وبتأثير من المدارس السابقة على ثورة السابع عشر من تموز لم نتعود الاحاطة والشمول في فهم المواقف والقضايا التي تفرض شخوصها أمام العراقيين بين آونه واخرى او بصورة دائمة .

وكلمة السيد الرئيس في مناقشة ورقة عمل دار الثقافة والنشر الكردية نموذج غني ومثال حي ومنبع غزير لمثل هذه الدروس ، فمنها :ـ الاشارة الى الترابط العضوي بين العام والخاص او بين الكل والجزء فيما يتعلق بالعطاء الفكري والادبي ، فان الأديب الكردي والعربي قبل إنتمائهما الى قوميتيهما فهما منتميان الى وطنهما العراق ، فمجد العراق وتأريخ العراق ومستقبل العراق وهموم العراق في تثبيت مركزه . وتشخيص هويته وتبوء مكانته بين شعوب العالم المتطلعة الى التقدم الحضاري والفكري ، وتهيئة الوسائل والاجواء والامكانيات لتحقيق كل ذلك ؛ يجب ان يكون كل ذلك الهدف الرئيس لكل العراقيين ومطمح ابداعاتهم ومبادراتهم الخلاقة في مجالاتهم الفكرية والادبية والفنية حتى في حياتهم اليومية ، فاذا لفتهم هذه المسيرة الجماعية المستهدفة لنقل العراق ـ حضارياً الى مواقع متقدمة في جوانب الحياة المعاصرة ، فانهم بهذا فقط يكونون بمستوى الوعي النافذ في الاعماق ، ويتميزون عن المنساقين عشوائيا وتلقائيا في التيارات المتناقضة التي تتصارع مدا وجزرا هنا وهناك في عالمنا المعاصر .

لقد رسم السيد الرئيس القائد دوائر ثلاث للمنطلقات في العطاء والبذل والعمل الابداعي سمى الدائرة الاولى (بالخيمة العراقية) . ما اشمل واجمل هذا التعبير حيث يجمع كل الخطوط الاساسية التي تجمع العراقيين بوشائج عميقة أشبه بوشائج الاسرة الواحدة التي تشد بعضها الى بعض باواصر شتى ، فمن هذه الخيمة وإليها تنطلق الابداعات والمبادرات في مجالات الفكر والفن والعمل الجاد المثمر بمختلف حقوله وبكافة انشطته الهادفه لرفع شأن الوطن ثقافيا واقتصاديا واجتماعيا وسياسيا ، وبتلخيص مكثف ؛ يعمل الجميع للجميع .

هذه هي الدائرة المركزية التي يجب ان يكون حضور العراقي فيها مستمرا ودائما وبوعي ويقظة ، ويقاس تبني العراقي لمواقف العراق وإنتمائه الروحي له بمدى وضوح هذا الحضور وقوته واستقراره في فكره ووجدانه ، ويقاس إنفصاله الروحي وخذلانه النفسي وقصوره الوجودي بمدى ضعف هذا الحضور وغموضه وانعدامه .

وحول هذه الدائرة فقد اختط السيد الرئيس ببصيرته النافذة المعهودة دائرتين أخريين هما : دائرة الخصوصيات المستقرة في العراق ودائرة الانسانية الاوسع ، فقد لمح سيادته الى ذلك قائلا : **(فاذا تصورنا انها تعالج شؤونها وتتعامل مع الحياة بدون شعور بالتعب بدون شعور بالملل بدون ان تبعدها هذه الخصوصيات عن ممارسة دورها الوطني ـ والقومي ـ والانساني ، فكيف يجوز للعراقي أن يتملل من**

# عـراقيـــتـنـا لا يضـعـفـنـا

**هذه الخصوصيات ، وتمنعه هـذه الخصوصيـات من ان يتعامل مع الحياة ومع وحدة الشعب في إطارها الصحيح .)**

إن دائرة الخصوصيات استقطبت إهتمام السيد الرئيس اكثر لانها كانت ألصق بورقة العمل التي شرف سيادته بحضوره اجتماع المتناقشين حولها ، وقد أوضح مسار هذه الدائرة وما ينبغي ان تكون عليه ، وحدد مجالها وحلل طريقة التعامل معها وحل عقدها بما لا مزيد عليه حيث وضع أسس تحرك العراقي في مجالها شـرح الشروط الصحيـة لايجـاد التـوازن والتـلازم والتلاحم بين هذه الدائرة المركزية (العراقية) لعراقية المواطنين وأزال كل غموض ولبس حول التحرك ضمن الدائـرتين سـواء للمواطنين العرب والاكراد وبـالنسبة للمسـؤلين عن توجيههـا والتعمل معها .

فاولا قد أزال كل الموانـع والعقبات امـام الخصوصيـة الكردية لتنطلق بحرية لا يحدهـا إحساس الكـردي بمواطنتـه العراقية ليعبر بعد ذلك كتـأريخ وأدب وفن بمـا يضمن إغناء التراث واحياءه ودفع تواصله ضمن الخصوصية ، وبذلك فقد فتح آفاقا رحبه امام الكلمة الكردية لم ينعم بها الأديب الكردي في السابق وفي احسن الأحوال .

وقد وضع السيد الرئيس الأديب الكردي بهذه الحريـة الواسعة في طرائقه التعبير في مجالات الفكر والأدب والفن أمام مسؤولية خطيرة ، لان الانسان الناضج يتوازن تمتعه بالحرية مع تحمله للمسؤولية ، فعلى هذا حينما يـطلق الأديب الكردي العنان لقلمه في عالم الأدب والشعر واللغة والتأريخ ليضيف الى التراث الكردي شيئا جديدا يتحتم عليه ان لا يكـون ذلك على حساب عراقيته وان لا يخدش ذلك إنتمائه الصميمي للعراق ، وان لايبعده ذلك عن مجمل ما يجب عليه تجاه وطنه ومواطنيه ، او بتعبير آخر لا يؤدى عمله الى فجوة في حركة تكامل العراق فكريا وحضاريا وثانيا ، حول هذا الاتجاه مرتبطا بالاتجـاه الأول ، إلتفت السيد الرئيس بمقولته : (فهذه الحالة لابد ان نعـومها حتى تشبع في الاعلام الموجه لشعبنا الكردي ، نعومها تماما ودع الصحيفه تمتلئ من الاول إلى الآخر حديثا عن الاكراد وتأريخ الكرد والادب الكردي والثقافة الكـردية ، أبـدا كل شئ يـردنا ننشره ، وبعدها يحصل اشباع شعبنا الكردي ، يرى الثقافة الكردية والفن الكردي الخ ـ وكله يجري الحديث عنه ، ولا تبقى حالة مشوقه لاغراض المعارضة ، وإنما تصبح حالة عندها يأتيك الكردي من السليمانية يقول لك (كافي) هذا الكلام ، وتحدث لنا عن شئ آخر (كافي) تحدث عن (كوبا) وعن الاديب في الجزائر ، عن ادب الاندلس في المرحلة الاندلسية ولا تحصرنا فقط في زاوية واحدة ، ولكن إذا تتعاملوا مع الادب الكردي والثقافة الكردية بما فيها من أدب وفن .. الفن ؛ الرسم ، والنحت والمـوسيقى والغناء ، تتعاملوا معها من الان باطار متوازن ، ستبقى الحالة وكانما هنالك ناس يريدون حديثا اكثر .. طيب عوموا الحديث الاكثر واملأوا المجلات والصحف بالكتابة عن الادب الكـردي والثقافة الكردية والفن والشعـر الكردي الى ان يشبـع شعبنا الكـردي ، وبعدمـا يشبع اذهبـوا الى التوازن وتحـدثـوا عن عراقيتكم بكل ما فيها ، لانها أغنى وأليق للعراقي الكردي ان لا تحصره فقط في زاوية واحدة ، لاننا اذا قلنا له : تاريخك كردي فقط ، كانما نشتم العراقي الكردي لان تأريخه يمتد الى الاف

السنين من الحضارة التي هي حضارة العراق ، والى جهد متميز في بناء الحضارة الاسلامية العربية ، فاذا حصرناه في زاوية واحدة سنحرمه من دوره التأريخي العظيم في صنع هذه الحضارة) .

هنا لاحظ السيد الرئيس بان الكلمة الكردية بالرغم من ان ثورة السابع عشر من تموز قد وفرت لها منافذ عديدة للطبع والنشر مثل المجمع العلمي الكردي ودار الثقافة والنشر الكردية والامانة العامة للثقافة والشباب في كردستان بمنطقة الحكم الذاتي وكل من هذه المؤسسات تقوم بالدعم والاسناد المادي تباعاً لعشرات الكتب الكردية في السنة وبالرغم من ازدهار الادب الكردي بما يقيمها الادباء الاكراد من ندوات ومؤتمرات حول الادب الكردي ودراسة الشعراء الكرد وتحليل انتاجهم وحول القصة الكردية وعرضها وتحليلها عدا ما يعرض في التلفزيون من مقابلات ادبية وتمثيليات كردية .

بالرغم من كل هذا استشف السيد الرئيس من وراء الظواهر المرئية بعض المكامن الخفية خلف التعامل مع الكلمة الكردية والتي قد يضيق بها الاديب الكردي نتيجة طريقة تطبيق ضوابط النشر فلا يشعر الاديب الكردي بكفاية القدر المسموح به لارضاء طموحه او بتعبير اخر يشعر في بعض الاحيان انه لايتمكن من التعبير عن خصوصيته كما تملي عليه مشاعره مما يوشك ان يسبب انفصال بعضهم عن الركب العام لمسيرة الادب وازدهاره في ظل الثورة بالعراق . ولكي لا يسري هذا الشعور على مدى اوسع بادر السيد الرئيس بالعلاج الامثل والحاسم فعالجها باطلاق حرية الاديب الكردي واطلاق القلم الكردي وتقويم الادب الكردي والكلمة الكردية فوق القيود والسدود المتعارفة حتى تطفو الكلمة الكردية الى السطح وتتخلص من رواسب الاعماق المظلمة لتسبح في عالم النور والظهور وتستمتع بضياء الشمس وشعاعها ، فيفرغ الاديب الكردي كل ما تراكم في ذهنه وشعوره وترسب في اعماق وجدانه من مشاعر واحاسيس تدور حول خصوصيته : وبعد ان يرمي بثقل التراكمات ويشبع حرمانه وينفث ما في قلبه من مشاعر حبيسه لم تكن تجد قبل ذلك من متنفس ، فانه بعد ذلك يملك بصرا اوسع مدى وقلبا اوسع احتواء وفكرا أرحب آفاقا ، فيلج بذلك عالما اوسع من اهتماماته ، واول ما يبدأ بمعالجته ومعاناته ما يموج بها وطنه (العراق) من الهموم والشؤون والشجون تنتظر من ابنائه الفهم والاستيعاب والحلول ، فيساهم بروح جديدة وهمة جديدة وعقل متفتح في دفع عملية التطور والتنمية و(ينصهر) وجدانيا في ركب العاملين على اعلاء شأن (الوطن في كل مجال وكل إتجاه .

إذن فتعويم الأدب الكردي وازالة الموانع والعقبات امام الأديب الكردي ليعبر عن خصوصيات شعبه في مجال الأدب والفن إنما هي في البداية حالة علاجية على طريقة (الغذاء لا الدواء) فيجب على الأديب الكردي ان يختصر مرحلة النقاهة باسرع ما يمكن ليتجاوزها ويصل الى الحالة الطبيعية للمواطنة الكاملة الفاعلة المتفاعلة المبنية على اساس التوازن الصحيح والتعادل السليم بين الخصوصية في العراق وبين العراقية الشاملة المتوحدة التي ينصهر فيها الكل ذاتيا ووجدانيا لتحمل الأعباء المثقلة التي تتزايد في هذا العصر على كاهل كل مواطن في كل الوطن لمواجهة مصاعب المسيرة التي يعترضها الكثير من العوائق المنبثقة من طبيعة الحياة المعاصرة السريعة التقدم والتغيير .

وهذا الانصهار هو غير الانصهار الذي يتبادر الى الاذهان كلما ورد في أى تصريح يشير في مثل هذا المجال إليه ، فالانصهار القومي الممقوت المرفوض غير وارد هنا ، لأن التحدث عنه غير شرعي وانما الغرض من الانصهار هي وحدة الارادة والوعي والشعور تجاه قضايا الوطن واتخاذ الموقف الموحد والعمل الموحد إزاءها ، ولا دخل لذلك في الخصوصيات المتميزة ان السيد الرئيس قد يلخص قضية او موقفاً ما في كلمة واحدة ، ومثل هذه التعابير كثيراً ما ترد في معالجات سيادته لقضايا ومواقف مختلفة ومن هذه الكلمات الشاملة العميقة المدلول هنا ، كلمة (التعويم) فهو قد استشعر ما يعانيه الكاتب الكردي في حالات كثيرة من ضيق وحرج تجاه بعض الضوابط والتعليمات وقد يكون التعقيد من بعض المسؤلين عن تنفيذها - التي تمنعه من التعبير عما يجيش بصدره ويختلج في قلبه فلا يجرؤ على الافصاح عنه فتظل هذه الافكار والاراء حبيسة نفسه تتلوى وتعتلج وتنزل الى اعماق شعوره ، فدعى السيد الرئيس إلى تعويم مثل هذه الاحاسيس والمشاعر والاراء أي الى ابرازها الى السطح والعلنية الى درجة الاشباع ، وبذلك تنداح دائرة العمل امامه لتتشابك وتتداخل مع الدائرة المركزية «العراقية» .

